**ناوی کتێب: بوون لەسێبەری فەلسەفە و زانستدا**

**نووسەر: عمر امین علی**

**تیراژ: ٥٠٠ دانە**

**چاپی: یەکەم**

**ساڵی:٢٧٠٦ی کوردی ، بەرامبەر ٢٠٠٦ زاینی ، بەرامبەر ١٤٢٧ ی کۆچی .**

**چاپ : چاپخانەی هیـوا / ڕانیـە .**

**لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ٢٩٩ )ی**
**ساڵی ( ٢٠٠٦ ) ی دراوەتیٚ**

بسم الله الرحمن الرحيم

IN THE NAME OF ALLAH , MOST GRACIOUS , MOST MERCIFUL .

ئیمامی علی ( ڕەزای خوای لێ بێت ) دەفەرموویێت :

فەیلەسوفەکانی ئیغریق کۆمەڵگایەکی نموونەییان بەم شێوەیە ناسیوە :

- دەست درێژی کردن بۆ سەر بچوکترین هاوولاّتی دەست درێژی کردنە بۆسەر هەموو میللەت .

- دەسەلاّتێك بۆ یاسا هەبێت لەسەروی دەسەلاّتی بالاّوە .

- دەوڵەمەندی باری دەوڵەمەند قورس نەکات و هەژاربونیش باری هەژار تێك وپێك نەشکێنێت .

- هاوولاّتیان زیاتر لەوە بترسێن کە لۆمەبکرێن نەوەك لەوەی کە لە سزا بترسێن .

- بەڕاستی خوا لەماڵی دەوڵەمەندەکاندا بژێوی هەژارەکانی دیاری کردووە ، جا هەژارێك برسی نابێت مەگەر بەوەی کەدەوڵەمەند لێی قەدەغە کردووە .

( مجلة طبيبك / اب ١٩٨١ / ص ٢٠ )

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکی

خوێنەری بەڕێز : سلاّوی خوای گەورەتان لیّ بێت

ماوەیەکی دوورە سەرقاڵی وەلاّمدانەوەی چەند پرسیارێك بووم، کەهەستم پێدەکرد ئەم پرسیارانە لەسنوری دەرەوەی بوونی خۆمەوە دەهاتن، چونکە ئەو گومانەی کەدەروونەکان پەیدای دەکەن بەئاسانی چارەسەر ناکرێن، مرۆڤیش لەبەر لاساری خۆی کە بەپەلەیە بۆئاشکرا کردنی هەموو نهێنیەکان، زۆرجار دەکەوێتە گێژاوێکی قوڵەوە کە لەوانەیە بەرەو گومڕایی بەرێت. بۆیە بەدوای سەرچاوەی وەلاّمی ئەم پرسیارانەدا چوومە ناوقولاّیی شتەکانەوە، مرۆڤ ئەگەر لەسەر خۆبێت و هەڵنەچێت و لەکاتەکانی تەنگانەدا دان بەخۆیدا بگرێت، هەر دەگات بەوئەنجامەی کە هەولی بودەدات سەرەتا لەحوم و دەوروبەرەکەی خۆمەوە دەستم پێکرد تاگەیشتم بەو ئەنجامەی کەوەلاّمی پرسیارەکان بەتەواوی وەربگرم وتاریکاییەکان ببڕم و لەودیوی تاریکاییەکانیشەوە خۆ بەڕووناکیە تایبەت مەندیەکان ئاشنابکەم و بگەمە ئەوئەنجامەی کە سقراط دەڵێت : ( بەڕاستی مردن ئیلهام بەخشی فەیلەسوفەکانە وە خاڵی سەرەتاو دەست پێکردنە،وە ئامانجی فەلسەفەیە).

(افلاطون ل ٢١١).

کەواتە کاتێك تۆ توانیت خۆت بخەیتە قاڵبێکی وەهاوە کەبتوانیت لەم بوونەی ئێستاتەوە بگەڕێیتەوە بۆ ئەوکەرەسە خاوانەی کە تۆی لێدرووست کراوەو پێکهاتەکانی خۆشت بەچاکی بزانیت، ئەوا گەڕانت بەدوای بوونی خۆت دوای ئەم ژیانە ئاسانتردەبێت، ئەوسا زۆر ژیرانە بەزیندوویی سەردانی دیوی

نـاوەوەی گۆڕەکـەی خـۆت دەکـەی و دەتوانیـت خـۆت بـەمردوویی ببینیـت، لەئەنجامی ئەوکارانەی کەکردووتن ئایا پێیان ڕازیت یان نا؟

ئینجـا ئەگـەر لـەبوونی قۆنـاغی نـاوگۆڕدا توانیـت خـۆت ببینیـەوە ئـەوا بەدڵنیاییـەوە بـەردەوام دەبیت و بـەدوای شتەکانیشـدا دەڕۆیـت تاڕۆژێکـدێت تاریکایی تونێڵەکە کۆتـایی پێدێت و ڕووناکیـەکانی بـوونی قۆنـاغی دواڕۆژت لێبەدەردەکـەون و بـەپێی ئـەو کردەوانـەش کـەکردوتن و دەیانکـەی دەتوانیـت نامەی کردارەکانی خۆت بزانیت، ئایا بەرەو بەهەشتت دەبەن یان بەرەودۆزەخ؟

کەواتـە هەمووشـتێك بەپلـەی یەکـەم خـۆتی، ئەگـەر دەتـەوێت بچیتە دونیـای گیانەکانـەوە بەدڵنیاییـەوە دەبێـت لـەدونیای مـاڵ و سـامان دورکەویتـەوە، (مەبەستمان لەوەیە لەپێناوی ماڵ و ساماندا مرۆڤایەتی خۆت نەدۆڕێنی ).

ئینجـا ڕاسـت گـۆو داوێـن پـاك و دەسـت پاکبـەو لـەخوا زیـاتر لـە کەسـی تـر

---

پارەقـەی ناوچـاوانت پەیـدات کردبێـت ئـەوا شـوێنەواری ئـەم پـارووە حەڵاڵـە لەلاشـەکەتدا بۆماوەیـەك دەمێنێتـەوە ، ئـەوا لـەم ماوەیـەدا بینینەکـەت تێکـڕا حەڵاڵـە، بیرکردنەوەکـەت حەڵاڵـە، زمانـت بەڕاسـتی دەبێـژێت و خـەڵکی گوێـت لێدەگرن، تۆوەکەت پاکەو نەوەی زۆڵ وحـەرام زادەی لێنابێت، دیـوی ناوەوەت کـە دەروونەکەتـە بەکەسـێکی چـاك و پـیرۆز دەناسـرێت لـە هـەردووك جیهـانی دیارونادیاردا.

بـەڵام ئەگـەر هـات و پارەکـەت حـەرام بـوو، ئینجـا بەهـەر ڕێگایـەك پەیـدات کردبێت، بەدزی بێت، یان داگیرکردنی ماڵی خەڵکی یان ماڵی میللەت بێت، یان کرێـی جاشەتیوخۆفرۆشـیو جاسوسـیەت و کـارێکی ناڕەوابێـت، ئـەوا لەئـەنجامی خـواردنی ئـەم پـارەدا، چـاوەکانت بەهەڵـە شـتەکان دەبیـنن، گوێچـکەکانت بەهەڵـە شـتەکان دەبیسـتن، زمانیشـت چـەندە بـدوێت خـەڵکی

بەدرۆزنت دەزانن و کەس باوەڕت پێناکات و تۆوەکەشت منداڵی خراپەکاری لێوە پەیدادەبیت.

جا خوێنەری بەڕێز:-

ئەگەر مەبەستتە نهێنیەکان دەربارەی بوونی خۆت لەهەموو قۆناغەکاندا بزانیت، ئەوا بەووردی و بەژیرانە بەبێ ڕق وقینەوە نوسراوەکانی پەروەردگار بخوێنەوە، بەتایبەتی قورئان بەدڵنیاییەوە زۆر کەڵکی لێوەردەگریت ئەگەر بەچاوێکی فەلسەفیانەوە تەماشایان بکەیت.

وە بە ووردیو بەوویژدانەوە بەبێ گرژی باری دەروونت ئەم نوسراوە بخوێنەوە کەهەوڵم داوە شێوازێکی وەها بەکاربهێنم کەووتەکانی خواو پێغەمبەرەکان و زاناکان زیاتر لەمەیدانەکەدا بن بۆئەوەی ڕاستیەکان ئاشکراتر بەدەربکەون و بواری شێواندنیان نەبێت.

بەدڵنیاییەوە ئەگەر هێندێ شت بەکاربێنی خۆت و شوێنی ئێستاو رابردوو وەداهاتوشت دەدۆزیتەوە.

خوا پشت و پەنای هەموانمان بێت، سوپاس و ستایش بۆ خوا، وە سەڵەواتی خوا بۆ هەموو پێغەمبەرەکانی، سڵاوی خوا بۆ هەموو چاکەکارەکانی سەرزەوی. سڵاو لەوانەی کە ڕاستی یان خۆش دەوێت، سڵاو لەوانەی لەپێناوی مرۆڤایەتیدا تێدەکۆشن، سڵاو لەوانەی خزمەتی گەلەکەی خۆیان دەکەن، سڵاو لەوانەی ڕێز لەئافرەت دەگرن، سڵاو لەوانەی خزمەتی دایك و باوکە پیر و پەك کەوتوەکانیان دەکەن

عمر امین علی / ڕانیه

٢٠٠٦ / ٣ / ٥

# بـــــــوون

بۆخستنەڕووی توێژینەوەیـەك دەربـارەی بـوون ، پێویستیمان بـەدیاریكردنی سەرەتایەك هەیە ، بۆ ئەوسـەردەمەی كە بـوونی تێدا هاتۆتەكایـەوە بـۆ دیاری كردنی سەردەمێكی نادیار كەنەبوونە

لای هـەمووان ئاشـكرایە ، مـرۆڤ هـەر ئەوەنـدە ئاشـنایە بـەبوونی خـۆی كـە سەرەتاكەی دەباتەوە بۆ پەیوەندی هاوسەری نێوان دایك وباوكی ، زۆركەسیش هەیـە كـە قـوڵتر بەباسـەكەدا دەچـێت تادەگاتـە ئـەوەی كـە بـوونی خـۆی بگەڕێنێتـەوە بـۆ بـاوك و بـاپیرانی و دوا ئـەنجامیش بۆ یەكـەم خێـزان كە باوكە ئادەم و دایكە حەوان

لێرەدا چەند پرسیارێك سەر هەڵدەدەن :-

بوویت ، ئایا كەرەسەی خاوی ئـەم تـۆو و هێلكەیـە لـەكوێوە هـات ؟ ئایـا پێشـتر هەبووە ؟ ئەگەر هەبووە چۆن بووەو لەكوێ بووە ؟

٢- پێش ئـادەم وحـەوا چیتر ؟ ئادەم وحـەوا لـە هێلكـە و تـۆوی دایـك و بـاوك پەیدانەبوون ، كەواتە ئەو كەرەسە خاوانە چین كەئادەمیان لێدروستكرا ؟ ئایا حەوا بەهەمان شێوەی ئادەم دروستكرا ؟

٣- ئایا تۆ بەتەنهایت یان كەسانی تری نادیار لەگەڵتا هەن كەتایبەتن بەبوونی تـۆوە ؟ ئایـا تـۆ كەهـەیت بـەرەوكوێ دەڕۆیـت ؟ وویسـتگەو قۆناغـەكانی ئـەم ڕێـڕەوە چین ؟ ئایـا ڕۆژێـك دێـت لێپرسـینەوەت لەگـەڵ بكرێـت ؟ ئایـا دەبێـت ئەوڕۆژە كەی بێت ؟ سەرئەنجامەكەت بەچی دەگات ؟

لێـرەدا دەمانـەوێت زانسـتیانە وەڵامـی ئـەم پرسـیارانە بدەینـەوەو ووردە كاریـەكانی پێكهاتـەی كەرەسـەخاوەكان و تایبەتمەنـدی قۆناغـەكان و ئەنجامەكان بخەینەڕوو.

دەربارەی ئـەم قۆنـاغی پـێش دروسـتبوونی بوونـەوەرەو کەرەسـەخاوەکانی دروسـتکردنی ئـادەم ، ئەگـەرەکان لـە تـەرازووی ژیـری و بیرکردنـەوەدا لـە دوو ئەگەر تێناپەڕن:-

١-ئەگەری نەبوونی بنەڕەتی :- واتە هەر لە بنەڕەتدا هیچ شتێك نەبووبێت

٢-ئەگەری بوونی هێزێکی بالأدەستی ئەم دروستکروانە

چونکە ئەگەر لە بنەڕەتدا شتێك هەبووبێت دەبێت هێزێکی بالأدەست بووبێت کە توانیویەتی شتەکانی تر درووست بکات

ئێمە گومانمان نیە لـەوەی کـەئادەم لـەدوای دروسـتکردنیەوە هەیـەو ئێمـەش لـە تۆوی باوك و هێلکـەی دایکـەوە هـەین و بـەردەوامین ، واتـە پێویسـتە پـێش ئـەم قۆنـاغی بوونـەمان کەرەسـە خاوەکـەمان هـەبووبێت کـە ئـادەم وتـۆوی بـاوك و هێلکەی دایکی لێدروستکراوە

نونمونە

خانویەك کە خۆت تیایدا نیشتەجێی ئەگەری نەبوونی بنەڕەتی بۆ دروستکەرو کەرەسـەیخاوی ئـەم خـانووە ئەگـەرێکی چـەوتە لەبـەر ئـەوەی ئـەم خـانووە دروسـتکراوەو تەواوبووەوهەیـە ، گومـان نـامێنێ لەوەی کەپێش دروستکردنی خانووەکـە خاوەنەکـەی نەخشـە وکەلوپـەل وپێداویسـتییەکانی بـۆ ئامـادە کردووەو دروستی کردووە

کەواتـە ئەگـەری نـەبوونی بنـەڕەتی ئەگـەرێکی چـەوتەو لـەنێوان دوو ئەگـەردا یەکێکیان چەوت بوو ئەوا دووەمیان لەسنوری ئەگەر دەچێتە دەرەوەودەبێت بە بەڵگەنەویست ، لەبەرئەوەی هیچ بۆچونێك نامێنێت دژایەتی بکات

کەواتە ناچارین دان بنێین بەبوونی هێزێکی بالأدەستی ئەم دروستکروانە

واتە هەموو دروستکراوێك دروستکەرێکی هەیە کە بەپێی وویست و ئارەزووی خۆی ئەم شتانە دروست دەکات و سەرەتاو کۆتاییان بۆدادەنێت

کەواتە هەموو خاوەن سەرەتایەك کاتی کۆتایشی هەیە بەپێی وویست وهێزو زانست و دەسەلأتی دروستکەرەکەی ، وە بەئاڕاستەی پێچەوانەشەوە ئەگەر سەرەتا نەبوو کۆتایش نابێت

ئەم هێزە بالأدەستە دروستکەرە ئەوەندە بەتوواناو ووردە لەکارەکانیدا هەردەم زاڵە بەسەر دروستکروەکانیدا

( حي ابن يقظان ) تەماشای تەنە درووست کراوەکانی کرد بینی کە سێ ڕەوشتی هاوبەش هەن لەنێوانیاندا کە درێژی وپانی وقوڵییە ، وە گەیشتە ئەوەی هەرمانایەك لەو سێ مانایانە تێبگات ، جا کاتێك کەڕوانی هەڵوێستەیەکی کرد بەوەی کە مانایەکی عەقڵی و گیانی هەیە لەپاش جەستەوە جا ڕێگەی ڕاستی گرتەبەر بەرەو یاسای هۆکاری ( قانون السببيه)، وە بۆی دەرکەوت کە بۆهەموو هۆکارێك هۆیەك هەیە ، جا گەرمای لەشی

[illegible] وە هەروەها [illegible] سەرما، وە بەرز

بوونەوەوسەرکەوتنی هەندێك لەتەنەکان و بەربوونەوە و کەوتنە خوارەوەی هەندێکی تریان دەگەڕێتەوە بۆ هۆیەك کە لەدەسەلأتی خۆیاندا نیە وە هەموو ڕووداوێك دەبێت ڕووداوکەرێکی هەبێت

وای بینی کە هەموو شتەکانی کەدیتونی ملکەچن بۆ یاسایەك ، یاسای بوونەوەرو تێداچوون ، وە بوونەوەر مانای بوون دەگەیەنێت، وە لەلای هەندێك لە فەیلەسوفەکان بوونەوەر مانای دەرکەوتنی وێنەی ماددە دەگەیەنێت کەپێشتر تیایدا دەرنەکەوتبوو ، وەمانای تێداچوون واتە نەمان و فەوتان .جا ئەو دنیایەی کەدەبیندرێت هەمووی ڕووداویکە ودەبێت کەسێك بەرپرسی ئەم ڕووداوەبێت وە لەڕاستیدا ئەو کردەوانەی کە لەشتە دروستکروەکانەوە دەردەچن هی شتە دروستکروەکان نین بەڵکو هی بکەرێکن ئەو ئیشانەیان پێدەکات کە بۆئەوان داندراوە ، وە بەم پێیە ڕێگەی ڕاستی گرتەبەر بۆ بیرو بۆچوونی هەبوونی پەروەردگار ، ئینجا چاوی گێڕا بەوشتە جیاجیایانەی کە

هـەن ، وای بیـنین کـە ڕەگ وڕیشـە ودروسـت بوونەکـەیان وەکویـەکن، وە وای بینین هەموویان لەلایەن یەك دروست کەرەوە نێردراون بۆیە باوەڕی بە خوای تاکوتـەنها هێنـا. وەبـۆی دەرکـەوت کـە ئەوهـەبووەی کەبوونەکـەی پێویسـتە، بێبەرییـە لەڕەوشـتەکانی هـەبوونی لاشـە، بـەڵکو بـەهۆی دەروونـەوە درکـی پێدەکرێت، لەبەرئەوەی ئەودەروونە بلێسەیەکە لەخۆی ناتوانرێ لەناوببرێ.

( حی ابن یقظان ص٣٠ - ٣٢).

سقرات دە ڵێت :-

بەڕاستی هەموو شتێك لەسروشتدا هەواڵی بوونی ژیرییەك ڕادەگەیەنن کەباڵی بەسەر هەموو سروشتدا کێشاوە (افلاطون ل ٤١ )

پەروەردگاریش لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموویت :-

أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿١٠٦﴾ البَقَرَة

بەڕاستی پەروەردگار بەسەر هەموو شتێکدا بەتووانایە

ئـەفلاتون لـەبارەی دروسـتکردنی ئـەم بوونـەوەرەوە دەڵێـت:- وەسـتاکە هـات و لەشتە لەیەکترچووەکان ولەشتە جیاجیاکان دەروونە گشتییەکانی دروستکرد.

کەواتــە دەبێــت بەبۆچــوونی ئــەفلاتون دوای نەخشــەو پلانــەکان لەلایــەن پەروەردگارەوە بڕیاری دروستکردنی شتەکان دراوەو کارێکی بێبەرنامە نـەبووە لەلایەن پەروەردگارەوە.

وە لـە دەروونـە گشـتییەکانیش (ئـاو، هـە وا، ئـاگر ، خـۆڵ) ی دروسـتکردوە لەخۆڵیش ئادەمیزادو زیندەوەرو پێکهاتـەکانی دروسـتکردن کە لـەژێر چەرخی مانگـدان ، وە ئەسـتێرەکانی لەڕێگـەی دەروونـە یەکەمیەکانـەوە دروسـتکردن بۆئەوەی ببن بەژمێریاری کات. ( افلاطون ل١٨٧ )

سقرات بەم شێوەیە باسی ئەم خاوەن دەسەڵاتە دەکات :-

بـێ جەسـتەیە و زانایـە و لەهـەموو شـوێنێك ئامادەیـە ودەسـەڵاتێکی فـراوان وئاوەڵای هەیەو ئەرکەکانی بوونەوەر جێبەجێ دەکـات و بەڕێوەی دەبـات بـەبێ

ئەوەی هەستی پێبکرێت، وە زانستی هەیە بەهەمووشتەکان هەروەها توانای بەسەر هەمووشتێکدا هەیە ( افلاطون ل٥٧ )

لە زۆر شوێندا لەقورئانی پیرۆزدا پەروەردگار شێوەو بوون ودەسەلأتەکانی خۆی بەم شێوانە بۆبەندەکانی ڕووندەکاتەوە :–

قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾

بلێ خوا تاك و تەنهایە ،

ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾

خوا جێگەی نیاز و ئومێدە

لَمۡ يَلِدۡ

کەس لەو نابێت ،

وَلَمۡ يُولَدۡ ﴿٣﴾

وە لە کەسیش نەبووە ،

وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ﴿٤﴾ سُورَةُ الإخلاص

وە هەرگیز کەسێك وەکو ئەو نابێت

واتە خوا تاك و تەنیایەوجێگەی نیازو ئومێدە ، کەس لەو( لە دایك ) نەبووە وە لەکەسیش( لە دایك) نەبووە ، (هەرگیز) کەسێك نابێت هاوتای ئەوبێت

بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٞ

داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە چۆن منداڵی دەبێت لەکاتێکدا کە هاوسەری نەبووە.

وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١٠١﴾ سُورَةُ الأنعام

وە هەموو شتێکی دروستکردووەوبە هەموو شتێك زانایە.

وواتە داهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە ودروستکەری هەموو شتێکە لەم بوونەوەرەدا ، هەرگیز هاوسەری نەبووە، ئەی کەواتە چۆن منداڵی دەبێت

لەکاتێکدا کەئەو بەهەموو شتێك زاناو ئاگادارەو دروستکەری هەمووشتەکانەو زانایەپێیان. ( لە تەفسیری القرطبی و ابن کثیر )

لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ الأنعام

چاوەکان درکی پێناکەن ونایبینن ئەو درك بەچاوەکان دەکات ودەیانبینیٚ وە ئەوچاکەکاروشارەزایە

واتە کەس پەروەردگار نابینێت بەلاَم پەروەردگار ئەوان دەبینێت بەهەموو وردەکاریەکانیانەوەو ئەم پەروەردگارە چاکەکارە بۆبەندەکانی وزاناو شارەزایە بە وردەکاری و نهێنی کارەکان

وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٢١٠﴾ البقرة

وە هەموو کارەکان بۆلای خوا دەگەڕێنەوە

واتە خوا سەرپەرشتی کەرو چاودێری کەری هەموو کارو ڕووداوەکانە وخۆی خاوەنی بڕیارە.

وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾ البقرة

وە خوا بیٚ ئاگا نیە بەوەی کە ئێوەدەیکەن.

واتە خوا بیٚ ئاگا نیە لەکردەوەکان کەبەنهێنی وبەئاشکرا ئەنجامیان دەدەن و بیٚ ئاگا نیە لەوویستە دەروونیەکانتان کەلای خۆتان وا هەست دەکەن کەسی تر پێیان نازانێت

إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ

بەڕاستی خوا چاکەکارەکانی خۆش دەوێت

إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٩﴾ آل عمران

بە ڕاستی خوا لەوادەو پەیمانی خۆی لانادات

واتە خوا دژایەتی وادە وپەیمانەکانی خۆی ناکات

وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِى ٱلْقُبُورِ ﴿٧﴾ سُورَةُ الحَجِّ

وە بەڕاستی ڕۆژی دوایی دێت وگومانی تێدانیەو بەڕاستیش خوا هەرچی لەناو گۆڕەکاندان زیندویان دەکاتەوە

واتە وادە وپەیمانی خوایە بەڕاستی ڕۆژی دوایی بەڕێوەیەو دێت وهەموو مردوەکانیش زیندوودەکرێنەوە

أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَـٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ﴿٣﴾

ئایا ئادەمیزاد وادادەنێت کە ئێمە ئێسکەکانی کۆناکەینەوە ؟

بَلَىٰ قَـٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّىَ بَنَانَهُۥ ﴿٤﴾ سُورَةُ القِيَامَةِ

بەڵێ توانامان هەیە کە نەخشی سەری پەنجەکانیان وەکوخۆیان دروستیان بکەینەوە

واتە وادەوپەیمان لەکاتی زیندوکردنەوەتاندا نەک تەنها هەر ئێسکەکان کۆدەکەینەوە بەڵکو نەخشی سەری پەنجەکانیشتان کەجیاوازن لەکەسێك بۆ کەسێکی تر وەکوخۆیان دروستیان دەکەینەوە

إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ سُورَةُ مَرْيَمَ

ئەگەر فەرمانی کارێکی دا هەر ئەوەندە پێی دەڵێت ببە دەبێت

ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ

خوا ڕەوشەنی ڕووناکی ئاسمانەکان وزەوییە

مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشْكَوٰةٍ فِيهَا مِصْبَاحٌ

وێنەی ڕەوشەنی ڕووناکیەکەی وەکوچرادانێك وایە گڵۆپێکی لەناودابێ

ٱلْمِصْبَاحُ فِى زُجَاجَةٍ

گڵۆپەکە لەناو شوشەیەکدا بێت

ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوْكَبٌ دُرِّىٌّ

شوشەکە وەکو ئەستێرەیەکی پڕشنگدار وایە

يُوقَدُ مِن شَجَرَةٍ مُّبَـٰرَكَةٍ زَيْتُونَةٍ لَّا شَرْقِيَّةٍ وَلَا غَرْبِيَّةٍ

له دار زەیتونێکی پیرۆزەوە پێدەکرێ کە نەڕۆژهەڵاتیە نەڕۆژئاوایی واتـە شـوێنی ئـەم دارزەیتونـە لەسـەر گـۆی زەوی لەخاڵێکدایـە کـە نەبـەرەو ڕۆژهەڵاتە نەبەرەو ڕۆژئاوا، وواتـە لـەنێوانی هەردووکیاندایـە ، کـە لەبەشـەکانی داهاتوو بەووردی باسی دەکەین

يَكَادُ زَيْتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوْ لَمْ تَمْسَسْهُ نَارٌ

خەریکە زەیتەکەی ڕووناکی دەدات هەرچەند ئاگریشی نەگەیەندرابێتێ

نُّورٌ عَلَىٰ نُورٍ

ڕووناکیەکەی چین چینە. (چینە ڕووناکییە لەسەر چینە ڕووناکی).

يَهْدِى ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْأَمْثَـٰلَ لِلنَّاسِ
وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٣٥﴾ النور

خـوا ڕێگـە نیشـانی ئەوکەسـانە دەدات کـەبۆخۆی دەیـەوێت بگـەن بەڕەوشـەنی ڕووناکیەکـەی، وە خـوا نمونـەکان بۆخـەڵکی دێنێتـەوە، وەخـوا بەهەمووشـتێك ئاگادارە.

هەروەها لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت

وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ﴿١٨٠﴾ سُورَةُ الأَعرَاف

وە بۆ خوا ناوی پیرۆز هەن ، جا بەوناوانە بانگی بکەن.

هــەموو ناوەکــان لــەقورئانی پــیرۆزدا ئاشــکران و هەریەکــەیان توانــا و دەسەڵاتێکی پەروەردگار بەدەردەخەن وتایبەتن بەپـەروەردگارەوە ، گونجاونیە ئەم ناوانە ئادەمیزادیان پێناوبرێت مەگەر بەبەکارهێنـانی ووشـەی بەندایـەتی وخۆ بچوککردنەوە بەرامبەر بەگەورەیی ئەوناوانە

إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ سُورَةُ البَقَرَة

بەڕاستی خوا دەست درێژکەرانی خۆش ناوێت

إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٧﴾ سُورَةُ البَقَرَة

بەڕاستی خوا بینایە بەوەی کەئێوە دەیکەن

ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ

**خـوا ئـەو پەروەردگارەیـە کەلـەوزیاتر هـیچ پـەروەردگاری تـر نیـە، زینـدووەو ڕاوەستاوەو وەنەوزوخەو نایباتەوە**

لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ

**هەرچی لەئاسمانەکان و زەویدایە هی ئەوە**

مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ

**کیٚ یە ئەوکەسەی بتوانیٚ تکای لەلابکات مەگەر بەڕەزامەندی ئەونەبیٚ ؟**

يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ

**زانستی هەیە بەئێستاو داهاتویان و ئەوەی بەسەریاندا ڕابردووە**

وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ

**وە پەی بەهیچ شتێك لەزانستیەکەی نابەن ئەگەر بەوویستی ئەونەبیٚ**

وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ

**فراوانی دەسەلأتەکەی ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە**

وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ

**پاراستنی ئاسمانەکان و زەمین کاری ئەو گران ناکەن و ئەو بەرزوپیرۆزە**

وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٖ مِّن مَّآءٖۖ فَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ بَطۡنِهِۦ

وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ رِجۡلَيۡنِ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰٓ أَرۡبَعٖۚ

يَخۡلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٤٥﴾ النُّور

**خوا هەموو گیان لەبەرێکی لەئاو دروستکردووە ، ئینجا لەواندا هەیانە لەسەر سك دەخشیٚ وە هەیانە لەسەر دووقاچ دەڕوات وە هەیانە لەسەر چوار قاچ دەڕوات ، ئەوەی خوا وویستی لەسەربێت دروستی دەکات ، بەڕاستی خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە**

وَلِلَّهِ ٱلْمَشْرِقُ وَٱلْمَغْرِبُ فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا۟ فَثَمَّ وَجْهُ ٱللَّهِ
إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾ سُورَةُ البَقَرَة

**ڕۆژهەلات وڕۆژئاوا هەر بۆخوایە جا ڕووتان لەهەر شوێنێ بکەن ڕووی خوا لەوێیە، بەڕاستی خوا فراوان وزانایە**

**لێرەدا فراوانی وگەورەیی دەسەلاتەکەی دەردەکەوێت و پێمان ڕادەگەیەنێت کە هەرکاتێك وویستتان پەیوەندی پێوەبکەن ڕووی ئێوە لەکوێ بێت ئەوا ڕووی ئەویش لەوێیە**

هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ
عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾ سُورَةُ الفَتْح

**ئەو پەروەردگارەیە کەپێغەمبەرەکەی ناردووە بەقورئان وئاینی ڕاستەوە بۆ ئەوەی بەسەر هەمووئاینەکانی تردا سەری بخات ، وەشاهیدی خوا بەسە بۆڕاستی ئەم باسە**

مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ﴿٢٩﴾ الفَتْح

**محمد پێغەمبەری خوایەو ئەوانەش کەلەگەڵ ئەودان توندو تیژن لەسەر بێباوەڕکان و بەبەزەین لەناوخۆیاندا**

وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ﴿٢٩﴾ الكَهْف

**وە ئەی محمد بلێ ڕاستی لەلایەن پەروەردگاری ئێوەوەیە، ئینجا هەرکەسێك وویستی با باوەڕبێنێ و هەرکەسێك وویستی با بێباوەڕبێ**

**ئینجا لەگەڵ ئەم هەموو ئازادیەش کەداویەتی بەبەندەکانی خۆی ڕوویان تێدەکات و دەفەرموێت :-**

إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ
وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ سُورَةُ الفُرْقَان

تەنها ئەوانەی کە تۆبەدەکەن و پەشیمان دەبنەوەو باوەڕ بەخوا دێنن و کردەوە وکــاری چــاك دەکــەن ، ئینجــا ئەوانــە پــەروەردگار کــردەوە خراپــەکانیان کەکردویانن بۆیان دەگۆڕێت بەچاکەو خوا هەمیشە لێبوردەوخاوەنی بەزەییە

وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾ سُورَةُ طه

وە بەڕاســتی مــن لێبــوردەم بۆئەوکەســەی کەپەشــیمان دەبێتــەوەو تۆبــەدەکاو باوەڕدێنێ وکاری چاکدەکات وئینجا ڕێگەی ڕاست دەگرێ

فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلْمُفْلِحِينَ ﴿٦٧﴾ القَصَص

جا ئەگەر کەسێك تۆبەی کردو باوەڕی هێناوکاری چاکی کرد ئومێد هەیە کە لەڕزگاربووەکان بێت (واتا ئومێد هەیە کە سەرفرازبێت )

وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ سُورَةُ آل عِمرَان

وە چارەنووسی هەمووان بۆلای خوایە

ئینجا بە بەرنامەیەکی تێر وتەسەل نەخشەکانی دروستکردنی ئەم بوونەوەرەی جێگیرکردن وهەنگاوەکانی درووستکردن، دەستیان پێکرد.

## چۆنیەتی دروستکردنی ئەم بوونەوەرە

یاسا بنەڕەدیەکانی ئیسلام و هەموو ئاینە ئاسمانیەکان وهەموو قوتابخانە فکریەکان لەسەر باوەڕ دامەزراون ، چۆن دەبێت تۆ کەسێکی مارکسی بیت و دژی مارکس بیت و باوەڕت پێی نەبێت کەخاوەنی قوتابخانەکەیە؟ چۆن دەبێت کەسێك لەسەر ئاینی مووسابێت وباوەڕی بەخواومووسا نەبێت ؟

کەواتە بناغەی یاساکانی ئیسلام باوەڕە ، وواتە هەر کەسێك باوەڕی بەهێزو دەسەلأتەکەی پەروەردگاری نەبێت بەدڵنیاییەوە بەرنامەکەی خوایشی بەلاوە سەیر دەبێت و نامۆدەبێت بەناوەڕۆکەکەی ، مرۆڤ ئەگەر مەترسی دەسەلأتێکی سەروی خۆی نەبێت ئەوا بەدڵنیاییەوە دەبێت بەجانەوەرێك و تەنها هەوڵی جێبەجێ کردنی ئارەزووەکانی خۆی وپەیوەندیدارەکانی دەدات دڵنیاشم هەرکەسێك خاوەنی زەڕەیەك ویژدان بێت پشتیوانی لەم بۆچوونە دەکات ومێژووش شاهیدێکی بەوویژدانە

باوەڕبوون بەخوا چەکێکی بەهێزە بۆئادەمیزاد بۆئەوەی لەبەرامبەر هەڕەشەکانی خوادا خۆی بەبچوك بزانێت و مافی خەڵکی هەژارو داماو دەست بەسەردا نەگرێت، ولەبەرامبەر سۆزو پاداشتی پەروەردگاریشدا خۆی بەخاوەن بەش بزانێت، کەواتە باوەڕهێنان بەخوا ئادەمیزادەکان دووردەخاتەوە لە سەرگەردانی ، وە گرێ کوێرەکانی ژیانی دونیاو دواڕۆژیان بۆدەکاتەوە

سەرەتای هەمووکارێك پێویستی بەبیرکردنەوەو لێکدانەوەو ووردبینی ولە هۆش خۆبوون هەیە بۆئەوەی ووردەکارانە وێنەو نەخشەی کارەکە دابڕێژرێت.

ٱلَّذِى خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗا ③ سُورَةُ المُلۡكِ

ئەوخوایەیە کەحەوت ئاسمانی لەسەریەك دروستکردووە

وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِ ⑤ سُورَةُ المُلۡكِ

وە ئاسمـانی یەکـەممان ڕازاندۆتـەوە بەچـراکان و وامـان لێکـردووە نـەفرین ئەربێت بۆ شەیتانەکان.




Microsoft Encarta World Atlas 1998 Edition

قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سُورَةُ المُؤمِنُونَ

ئەی محمد پێیـان بڵـێ کێیـە خـاوەنی حـەوت ئاسمانـەکان وخـاوەنی عەرشـی گەورەوپیرۆز ؟

ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ ﴿١٢﴾ الطَّلَاق

ئەو خوایـەی کەحـەوت ئاسمـان ولـەزەوییش بەوێنـەی ئـەوانی دروسـتکردووە فەرمانەکانی خوا لەنێوانیادا دەهێنرێنە خوارێ

وەکـو لەوێنەکـەدا ئاشـکرایە کۆمەڵەکـە ( ٩ ) ئەسـتێرەن ، دووانیـان (عـەتاردو زوهـرە) لـەژێر زەویـەوەن وەشەشـیان (مـەریخ، مـشتەری، زوحـەل، ئۆرانیـۆس، نیپتـۆن، پلۆتـۆ) لەسـەروی زەویـەوەن لـە زەویـەوە بۆسـەرەوە ئەگـەر هـەر ئەسـتێرەیەیی سـنوری ئاسمـانی خـۆی هـەبێت ئـەوا کـۆی ئاسمانـەکان لـە سەرسـەری خـەڵکی زەویـەوە دەکاتەحـەوت ئاسمـان وەکـو خـوای گـەورە لـە ئایەتەکەدا ڕوونی کردۆتەوە کە لەسەروی ئاسمانی حەوتەمیشەوە عەرشەکەی

خۆی هەیە. کەواتە گونجاوە لەسەروی ئاسمانی حەوتەمیشەوە شتی تر هەبێت، ئەگەر توانا هەبێت بۆدۆزینەوەی

| ئەستێرە | دووری لە خۆر ملیون کم | نیوە تیرە کم | چڕی غ/سم٣ | ماوەی سوڕانەوە بە دەوری خۆر | ماوەی خولانەوە بە دەوری خۆیدا |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| **ئەستێرە بەردینیەکان** | | | | | |
| عەتارد | ٥٧,٩ | ٢٤٣٧,٦ | ٥,٤٣ | ٨٧ ڕۆژ ٥٧ خولەک | ٨٥ ڕۆژ ٣٩ خولەک |
| زوهرە | ١٠٨,٢ | ٦٠٥٢ | ٥,٢٥ | ٢٢٤ ڕۆژ ١٢ خولەک | ٢٤٣ ڕۆژ |
| زەوی | ١٤٩,٦ | ٦٣٧٨ | ٥,٥٢ | ٣٦٥ ڕۆژ ٦ کات ژمێر ٨ خولەک | ٢٣ کات ژمێر ٥٦ خولەک ٤ چرکە |
| مەریخ | ٢٢٧,٩ | ٣٣٩٧ | ٣,٩٥ | ١ ساڵ ٣٢١ ڕۆژ ١٠ کات ژمێر ٤ خولەک | ٢٤ کات ژمێر ٣٧ خولەک ٢٢ چرکە |
| **ئەستێرە گازیەکان** | | | | | |
| مشتەری | ٧٧٨,٣ | ٧١,٤٩٢ | ١,٣٣ | ١١ ساڵ ٣١٤ ڕۆژ ٢٣ کات ژمێر ٢ خولەک | ٩ کات ژمێر ٥٠ خولەک ٢٧ چرکە |
| زوحەل | ١٤٢٧ | ٦٠,٢٦٨ | ٠,٦٩ | ٢٩ ساڵ ١٦٧ ڕۆژ ٦ کات ژمێر ٤٣ خولەک | ١٠ کات ژمێر ١٣ خولەک ٥٨ چرکە |
| ئۆرانۆس | ٢٨٧٧,٣٨ | ٢٥,٥٥٩ | ١,٢٩ | ٨٤ ساڵ ٣ ڕۆژ ١٥ کات ژمێر ٢٨ خولەک | ١٧ کات ژمێر ٥٤ خولەک |
| نیبتۆن | ٤٤٩٧,٠٧ | ٢٥,٢٦٩ | ١,٦٤ | ١٦٤ ساڵ ٢٨٨ ڕۆژ ١٣ کات ژمێر ١٤ خولەک | ١٩ کات ژمێر ١٢ خولەک |
| پلۆتۆ | ٥٩١٤,٦٥ | ١١٥٢ | ٢,٠٣ | ٢٤٨ ساڵ ١٩٧ ڕۆژ ٥ کات ژمێر ٤٢ خولەک | ٦ ڕۆژ ٩ کات ژمێر ١٧ خولەک ٣٦ چرکە |

**اطلس العالم/ دار الشرق العربي ص ٦**

خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَا ......... ﴿١٠﴾ سُورَةُ لُقۡمَانَ

ئاسمانەکانی دروستکردوون بەبێ کۆڵەگە ئێوە دەیبینن

( بغير عمد ترونها ) واتە ( بعمد لا ترونها ) ،ئاسمانەکانی دروستکردوون وە بە کۆڵەگە ڕایگرتوون ئێمە نایان بینین ئەم کۆڵەگانە کەئێمە نایان بینین لەوانە هەوا کەتوانای ڕووبەڕووبوونەوەی بەستانێکی زۆری هەیە ئەوەتا قورسایی ئۆتۆمۆبیلێک بەهۆی پەستانی هەوای ناوتایەکانیەوە دەتوانێت بەسەرزەویدا

بڕوات ، هەروەها کایەی کارەبایی وکایەی موگناتیسی و هێزی کێش کردن و چڕی پێکهاتەکان گونجاون کۆڵەکەی نێوان ئاسمانەکان بن

لَخَلْقُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ سُورَةُ غَافِر

بەڕاستی دروستکردنی ئاسمانەکان وزەوی گەورەترە لەدروستکردنی خەڵکی، بەڵام زۆربەی خەلکی پێنازانن

جاخوێنەری بەڕێز بەلاتەوە سەیر نەبێت ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئەستێرەی تازە بدۆزرێنەوەو فراوانی ئەو ئاسمانانەتان بۆ ڕوون ببێتەوە ، تائێستا کەمێك لەوانە دۆزراونەتەوە کەپەروەردگار پەنجەی بۆدرێژکردوون ، ئێمە تائێستا هەر لەسنوری کۆمەڵەی خۆردداین توشی سەرسوڕمان مەبن کەڕۆژێك هەواڵی دارگێوژێك ببیستن لەئاسمانی حەوتەمین دایە،وەکو پەروەردگار دەفەرمووێت

عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ سُورَةُ النَّجْم

لەو شوێنەدا کەدارگێوژەکەی لێیە (کە دوا شوێنی ڕێگەدراوە )

وواتە شوێنی دارگێوژەکە دواخاڵی سنورە بۆگەیشتن بەبارەگای پەروەردگار لەوێوە کەس بۆی نیە زیاتر بچێتە پێشەوە جا بابزانین ئەم دارگێوژە چۆنە ، ( سدرة )ووشەیەکی عەرەبییە ناوێکی مێیەیە بۆدارێك پێی دەوترێت گێوژ : النبق کە نێرینەی ناوەکەی لەزمانی عەربیدا دەبێت بە (سدر ) کەواتە ئەو دارەی کەلەوێیە دارێکی مێینەی بەردارە ، کەواتە ئەم دارەش وەکو داری خورما دەبێت نێرەو مێیەی هەبێت (سدر و سدرە ) ، ( نخل و نخلە ) بەبێ نهێنیش نیە ئەم بەروگەڵای داری گێوژە ئەم هەموو کەڵکانەی هەن بۆچارەسەری نەخۆشیەکان، وەفراوانی ئەوداره ئەوەندە گەورەیە کەئەسپ سوارێك لەژێر سێبەری لقێکیدا سەدساڵ دەڕوات ، یان لەژێر سێبەری لقێکیدا سەد ئەسپ سوار جێگەی دەبێتەوە وەگەڵاکانی ئەوەندەی گوێچکەی فیل دەبن.( تفسیر القرطبی ایة ١٤ سورة النجم )

جا ئەم دارە لەشوێنێکدایە کە

عِندَهَا جَنَّةُ ٱلۡمَأۡوَىٰٓ ﴿١٥﴾ سُورَةُ النَّجۡمِ

کە لەوێیە بەهەشتی حەوانەوە (شوێنی مانەوە).

کەواتە لە دارگێوژەکەوە بۆسەرەوە ئەو بەهەشتە دەست پێدەکات کە پەروەردگار وادەی بەخاوەن باوەڕوچاکەکارەکان داوە

دەربارەی کەلودارەکان ( بورجەکان ) پەروەردگار دەفەرمووێت

وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡبُرُوجِ ﴿١﴾ سُورَةُ البُرُوجِ

سوێند بەو ئاسمانەی کە کەلوکەلوە.

کەواتە ئاسمان کۆمەڵێك بازنەی کەلودارە پەیوەندیەکی ڕاستەوانە هەیە لەنێوان کەلوەکان وئەستێرە گەڕۆکەکاندا

ئەم کەلودارانە دەبنە هۆی ئەوەی هەر جوڵەیەك لەکەلودارێکدا بکرێت لە کەلو دارەکانی تردا دەردەکەوێت بەخێرایی جیاجیا بەپێی ژمارەی کەلووەکان لەهەر کەلودارێکدا.

تَبَارَكَ ٱلَّذِي جَعَلَ فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجٗا وَقَمَرٗا مُّنِيرٗا ﴿٦١﴾ سُورَةُ الفُرۡقَانِ

پیرۆزی بۆ ئەوکەسەی کە لەئاسماندا کەلودارەکانی داناوە وەلەناویاندا چرایەك ومانگێکی ڕەوشەنداری داناوە

( کەلودارێك خولانەوەی خۆری لەئەستۆدایە، کەلودارێك سوڕانەوەی مانگی لەئەستۆدایە، کەلودارێك سوڕانەوی زەوی لەئەستۆدایە، بەم شێوەیە هەر کەلودارێك سوڕانەوەی ئەستێرەیەکی لەئەستۆدایە ).( تفسیرالجلالین ٦١ الفرقان )

کۆمەڵە ئەستێرەی کەلوی کیژۆڵە ( ٩٥ ) ئەستێرەی تێدایە بەچاو دەبینندرێن لەبەهاراندا وەدەکەوێتە باشووری ئاسمانەوەو بەباشی بەدی دەکرێن بەبێ بەکارهێنانی تەلسکۆب  هەروەها کۆمەڵە ئەستێرەی کەلوی دووپشك کە سەد

ئەستێرەی تێدایە ، وە کۆمەلە ئەستێرەی کەلووی (هەلۆ ) حەفتا ئەستێرەی
تێدایە ، وە کۆمەڵە ئەستێرەی کەلووی پێگاس (١٠٠ ) سەد ئەستێرەی
تێدایەو کۆمەڵەئەستێرەی قرژاڵ ( ٦٠ ) شەست ئەستێرەی تێدایە کۆمەڵە
ئەستێرەیەك کە( ٣٢٠ ) ئەستێرەن، دوای ( ٥٢٠ ) ساڵ ڕووناکیەکانیان دەگەنە
سەرزەوی ) ( گۆڤاری کاروان ژمارە ٣٩/ ئاسمانیپڕلە نهێنی ل ٨٨/ جەلال تەقی )

خلق ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٣﴾ سُورَةُ التَّغَابُنِ

ئاسمانەکان وزەوی بەڕاستی و بەبێ کەموکوڕی دروستکردون و وێنەی بۆ
ئێوە کێشاوەو ئینجا وێنەکانی ئێوەی چاکترو باشتر کردووەوچارەنوس و
سەرئەنجامیش هەر بۆلای ئەوە

کەواتە خوا سەرەتا وێنەو نەخشەکانی دروستکردوون ، ئینجا ئەم وێنەو
نەخشانەی بەباشترین شێوەی لێکردون ئینجا بەدوابڕیار شتەکانی
دروستکردون لەباشترین شێوەدا

فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ سُورَةُ الانفِطَارِ

( خوا ) وویستی لەسەر کام وێنەو شێوە بێت پێکت دێنێ

لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ ﴿٤﴾ سُورَةُ التِّينِ

وە بەدڵنیاییەوە ئادەمیزادمان لەباشترین شێوەدا دروستکردووە

کەواتە دەبێت وێنەو نەخشەکان لەشوێنێکدا لەلای پەروەردگار پارێزراوبن

أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ بَلۡ هُمۡ فِي لَبۡسٖ مِّنۡ خَلۡقٖ جَدِيدٖ ﴿١٥﴾ سُورَةُ قٓ

ئایائێمە بێتوانابووین لەدروستکردنی یەکەم جاریاندا ؟ بەڵکو ( ئێستا ) ئەوان
لەپۆشاکێکدان لەدروستکردنێکی نوێدا

مەبەست لەپۆشاك جل وبەرگ نیە، بەڵکو بارێکی تازەی دروستکردنە لەلایەن
پەروەردگارەوە کە تایبەتمەندە بەژیانی سەرزەوی

کەواتە ئێمە هەموومان جارێکی تر پێش ئەم لەدایك بوونە بەدروستکردنێکی یەکەمی دروستکراوین ئینجا لەپۆشاکێکی نوێی دروستکردندا بەم شێوەیە دروستکراوین کەگونجاوبێت بۆژیان لەسەرزەوی ، کەواتە دروستکردنە یەکەمیەکەمان فراونترە چونکە ئەم دروستکردنە هەموو بوونی ئێمەی تێدا رەچاوکراوە لەمردن و ژیان و زیندوبوونەوەو ژیانی نەمری بەهەشت یان دۆزەخ. چونکە بەدڵنیاییەوە لەژیانێکدا کەمردنی تێدابێت ئەوژیانە پێویستی بەوەهەیە لەدایك بوونیشی تێدابێت ، کەواتە بوونی کۆئەندامەکانی زاوزێی نێرە ومێیە پێویست دەبن لەوژیانەدا ، بەلاّم بۆژیانێکی وەکو ژیانی بەهەشت یان ژیانی دۆزەخ کەنەمرین و مردنیان تێدانیە کەواتە لەدایك بوون پێویست نیە ، کەواتە بوونی کۆئەندامەکانی زاوزێی نێرە ومێیە بەم شێوەیەی ئێستا پێویست نابن لەوژیانە نەمریەدا ، ئافرەت کەمندالّی نەبێت و شیر نەدات بەمندالّەکەی مەمکەکانی بەم شێوەیەی ئێستا بۆچین ؟ بۆیە پەروەردگار پێمان رادەگەیەنێت کەئادەم وحەوا لەبەهەشتدا دامێنەکانیان دیارنەبوون تا ئەوکاتەی کەئامادەکران بۆژیانی سەرزەوی و لەبەری دارەکەیان خوارد دامێنەکانیان بەدەرکەوتن

فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا ﴿٢٠﴾ الأعراف

جاشەیتان دڵەراوکەی لەوانکرد بۆئەوەی لێیان دەرکەوێت ئەوشتەی کەلێیان شاردراوەتەوە لەدامێنەکانیان

فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا
وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ﴿٢٢﴾ الأعراف

بە لوتبەرزیەوە رێگەی نیشاندان ، وەکاتێك کە لەدارەکەیان چێشت دامێنەکانیان لێیان بەدەرکەوتن، وە دەستیانکرد بەپێکەوەنان وپێوەنوساندنی گەلاّی دارەکانی بەهەشت بەدامێنەکانیانەوە ( بۆ داپۆشینیان )

کەواتــە گومــان نامێنێــت کــەدوای خــواردنی بــەری دارە قەدەغەکراوەکــە دامێنەکانیان بەدەرکەوتن   کەواتە بەدەرکەووتنی دامێنەکان بۆبوونی ژیانی سەردوونیایە وەکو لەسەرەوە باسمانکرد ، بوونیان بەم شێوەیە بۆژیانی دواڕۆژ پێویست نیە ، لێرەدا یەکێك دەپرسێت :- ئەدی ئەگەر ئەم دامێنانە لەژیانی بەهەشتدا نەبن ئەم هەموو (حۆری و قاصرات الطرف )ە بۆچی؟ ئێمەش دەڵێین   عەورەتەکان لەژیانی دونیادا بۆکێلاّن و تۆو پێوەکردن بوون بۆمەبەستێك کەزاوزێ کردن بووە ، بەلاّم لەبەرئەوەی ژیانی دواڕۆژ نەمرییە کەواتــە عەورەتــەکان دەبێــت تایبــەتبن بــەبوونی نــەمری دواڕۆژەوە وتــەنها بۆمەبەستی تام ولەزەت ، دەنا ئەگەر وانەبێت ئەگەر پیاو لەزەت لەحۆری وەربگرێت ئەدی ئافرەت چۆن لەزەتی لێوەردەگرێت؟ کەواتە گومان نامێنێت لەوەی لەدرووست کردنە یەکەمیەکەماندا بارێکی تایبەتی بۆلەزەت وەرگرتن لەگەڵ کاری جووتبووندا داندراوە بۆژیانی سەرزەویمان کەجیایە لەوەی کە بۆ ژیانی دواڕۆژ داندراوە کەتایبەتە بەلەزەت وەرگرتن   ئینجا خۆ لەبەهەشتا ئەو مافانەی کە بۆپیاوان هەیە بەبێ کەم وکوڕی بۆ ئافرەتانیش هەیە   وە هەردووکیان بەچاوێك وەکو ئادەمیزاد سەیردەکرێن و لەهیچ شوێنێکدا لە قورئانی پیرۆزدا لەژیانی دواڕۆژدا جیاوازییەك نەخراوەتە نێوان ئافرەت و پیاوەوەو مافەکانیان وەکویەکن ، بەپێچەوانەی ژیانی سەردونیا کەدووئافرەت وەکو شاهیدێك سەیر دەکرێن و ئافرەت منداڵی دەبێت و ئافرەت خوێنی بێدەست نوێژی پێدادێت و ئافرەت لەپیاو مارەدەکرێت و ئافرەت تەلاّق دەدرێت، سەرنج بدە ئایا لەژیانی دواڕۆژدا ئەمانە هەن ؟ کەواتە لەهەموو بوارەکاندا دواڕۆژ تایبەتمەندی خۆی هەیە

وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ ﴿٣٨﴾ يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِندَهُ أُمُّ الْكِتَابِ ﴿٣٩﴾ سورة الرعد

بۆ هیچ پێغەمبەرێك نەبووە کە بەڵگەو نیشانەیەك بهێنێ مەگەر کەخوا ڕێگەی

**پێـدابێت، بۆهـەموو کـاتێکی دیـاریکراو نوسـراوێك هەیـە(٣٨)وە کتێبـە بنەڕەتیەکە لـەلای ئـەوە، ئـەوەی بیـەوێت لایـدەبات ونـایهێڵێ وئـەوەی بیـەوێت جێگیری دەکات (٣٩).**

**کەواتـە دروسـتکردنە یەکەمیەکـەمان فـراوانتر بـووە ، چـونکە بـۆ هـەموو قۆناغـەکانی بوونەکـەمان بـووە ئـەم درووسـتکردنەی ئێسـتای سـەرزەویمان تایبەتـە بۆژیـانی دونیـا ، وە لەدروسـتکردنە یەکەمیەکەمانـەوە وەرگـیراوە وەبوونیشـمان لـەقۆناغی مـردن و زینـدوکردنـەوە بۆژیـانی دواڕۆژ هـەر لەهـەمان دروستکردنە یەکەمیەکەمانەوەیە**

**کەواتە نەخشە بنەڕەتیەکەمان لەلای پەروەردگارە بەپێی وویستی خۆی چۆنی بووێت ئاوەها دروستمان دەکات بۆژیانی سەرزەوی و دەمانگۆڕێت بۆهـەبوونی ناوگۆڕ کەڕزاندنی لاشەکەیەو گەڕاندنەوەیەتی بۆ ئەوکەرەسە خاوانـەی کە لێـی دروسـتکردوین و زینـدوومان دەکاتـەوە بۆژیـانی نـەمری دواڕۆژ لـەوکات و شوێنانەدا کەخۆی وویستی لەسەرە**

عَبْدِ اللَّهِ بنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ، قَالَ : سمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ : (كَتَبَ اللَّهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ. قَالَ: وَعَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ). صحيح مسلم بشرح النووي ٦٦٩٧ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سلاَوی خوای لێ بێت) دەفەرموێت :(خـوا ئەنـدازەی دروسـتکراوەکانی نوسـیوەتەوە بەپەنجاهـەزار سـاڵ پـێش ئـەوەی ئاسمانـەکان وزەوی دروسـت بکات، وەعەرشەکەی لەسەرئاوبوو ).**

قالَ عُبَادَةُ بنُ الصَّامتِ لابْنِه:سمِعْتُ رَسُولَ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ: إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ الله تَعَالَى الْقَلَمَ فقال لَه: أُكْتُبْ ، فقَالَ :رَبِّ وَمَاذَا أَكْتُبْ؟قال: أُكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ، سنن إبي داوود ٤٥٨٣ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سلاّوی خوای لیّ بێت) دەفەرمووێت :( یەکەم شت کەخوا دروستی کرد پێنووس بوو، پێی گووت  بنووسە ، پێنووس ووتی:خوایەچی بنووسم؟ فەرمووی  (ئەندازەی هەموو شتەکان بنووسە هەتا دواکاتی بوونەوەردێت).**

أنّ النّبيّ صلى الله عليه وسلم قالَ: ( لَمّا خَلَقَ اللّهُ الْخَلْقَ، كَتَبَ فِي كِتَابِهِ، فَهُوَ عِنْدَهُ فَوْقَ الْعَرْشِ: إِنّ رَحْمَتِي تَغْلِبُ غَضَبِي). صحيح مسلم ٤ ١ ٩ ٦ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سلاّوی خوای لیّ بێت) فەرمووی :( کاتێک کەخوا بوونەوەری دروستکرد لەکتێبەکەی خۆیدا کەلەلای خۆیەتی لەسەروی عەرشەوە نووسی: بەخشندەییەکەم زاڵدەبێت بەسەر توڕەییەکەمدا ).**

عن أنس بن مالك عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: ( لما خلق الله عز وجل الأرض جعلت تميد، فخلق الجبال فألقاها عليها فاستقرت ، فتعجب الملائكة من خلق الجبال فقالت: يا رب هل من خلقك شيء أشد من الجبال ؟ قال: نعم الحديد، قالت: يا رب هل من خلقك شيء أشد من الحديد؟ قال: نعم النار، قالت: يا رب هل من خلقك شيء أشد من النار ؟ قال: نعم الماء، قالت: يا رب هل من خلقك شيء أشد من الماء ؟ قال: نعم الريح، قالت: يا رب هل من خلقك شيء أشد من الريح ؟ قال: نعم ابن آدم يتصدق بيمينه يخفيها من شماله ).

مسند الإمام أحمد ١ ٥ ٩ ١ ١ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سلاّوی خوای لیّ بێ) فەرمووی :( کاتێک کەخوای گەورە زەوی دروستکرد وایلێکرد ڕاخراوبێت، ئینجا شاخەکانی دروستکردن ولەسەرزەوی دانان زەوی جێگیر بوو، فریشتەکان سەریان سوڕما لەدروستکردنی شاخەکان بۆیە فریشتەکان ووتیان : ئەی پەروەردگار ئایا لەدروستکراوەکانی تۆدا**

شتێك هەیە پتەوتربێت لەشاخەکان؟ فەرمووی بەڵێ ئاسن، ووتیان ئەی پەروەردگار ئایا لەدروستکروەکانی تۆدا شتێك هەیە پتەوتربێت لەئاسن ؟ فەرمووی بەڵێ ئاگر، ووتیان ئەی پەروەردگار ئایا لەدروستکراوەکانی تۆدا شتێك هەیە پتەوتربێت لەئاگر؟ فەرمووی بەڵێ ئاو ، ووتیان ئەی پەروەردگار ئایا لەدروستکراوەکانی تۆدا شتێك هەیە پتەوتربێت لەئاو؟ فەرمووی بەڵێ «با»، ووتیان ئەی پەروەردگار ئایا لەدروستکروەکانی تۆدا شتێك هەیە پتەوتربێت لە « با »؟ فەرمووی بەڵێ ئادەمیزاد کەبەدەستی ڕاستی دەبەخشێت وە لەدەستی چەپی بشارێتەوە ). (واتە بەنهێنی بەدەستی ڕاستی ببەخشێتەوە دەستی چەپی پێنەزانێت).

پەروەردگار ئەم بوونەوەرەی لەماوەی (٦) ڕۆژدا درووستکرد.

( الکتاب المقدس التکوین / الاصحاح الثانی/ ص٥)

إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ﴿٣﴾ سورة يونس

بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە ئەوخوایەیە کەئاسمانەکان وزەمینی لەشەش ڕۆژدا دروستکرد، ئینجا جێگیر بوو لەسەر (عەرش) کاروفرمانەکان بەڕێوەدەبات

واتە جێگیربوو لەسەر تەختی گەورەیی وپیرۆزی هێزو دەسەلأتەکانی کەبە (عەرش) ناسراوەو دەزگای ناوەندی بڕیارەو لەوێوە کاروفەرمانەکانی هەموو بوونەوەر بەڕێوەدەبرێت.

وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ سورة الحج

ڕۆژێك لەلای پەروەوردگاری تۆ وەکو ژماردنی هەزار ساڵی ئێوەوایە

کەواتە درووستکردنی ئەم بوونەوەرە لەلایەن پەروەردگارەوە بەشەش هەزار ساڵی کاتی سەرزەوی تەواوو بووە بەکام کاتەی سەرزەوی ؟ بەکاتی مێژووی میلادی یان بەکاتی مێژووی کۆچی یان بەکاتی مێژووی کوردی ( نەورۆز )؟

کاتی مێژووی میلادی و مێژووی کوردی( نەورۆز ) پابەندن بەخولانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا لەکاتێکدا کەخۆریش لەجوولەدایە

وَٱلشَّمْسُ تَجْرِى لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ﴿٣٨﴾ سُورَةُ يسٓ

وەخۆر دەڕوات بەرەو ئارامگاکەی خۆی

خۆر لەجوڵەدایەودەڕوات بەرەوشوێنێك کەتیایدا ئارام دەگرێت وڕادەوەستێت ئایائەم شوێنە کوێیە ؟ ئایا دوای وەستانەکەی چی لێبەسەردێت ؟

وسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴿٥﴾ سُورَةُ الزُّمَرِ

وە ( خـوا )ڕۆژ ومـانگی ملکـەچ کـردون بۆفەرمانـەکانی خـۆی و هەریەکـەیان دەڕوات بەرەو کاتێکی دیاریکراو.

لَا ٱلشَّمْسُ يَنۢبَغِى لَهَآ أَن تُدْرِكَ ٱلْقَمَرَ وَلَا ٱلَّيْلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِ
وَكُلٌّ فِى فَلَكٍ يَسْبَحُونَ ﴿٤٠﴾ سُورَةُ يسٓ

گونجاونیە بۆخۆر کەبەدوای مانگدا بڕوات و بیگاتێ، وە نەشەویش پێش ڕۆژ دەکەوێت ، وە هەریەکەیان لەخولگەی خۆیاندا مەلەدەکەن

کەواتە بەدڵنیاییەوە ئەوڕەوشەنەی مانگ ڕووناکیەکی هەڵقوڵاونیـە لەمانگەوە ، وە ڕاستەوخۆنیە لەمانگەوە ، بەڵکو دانەوەی تیشکە کەبەر زەوی دەکەوێت و هـەموو کـاتێکیش تیشـکە گەڕاوەکـە بـێ هێزتـرە. بۆیـە لـەکاتی گیرانـی خـۆردا ڕووی مـانگ بـەتاریکی دەردەکـەوێت ، وەهەربۆیەشـە کـەزەوی بکەوێتـە نێـوان خۆرو مانگەوە لەسەر هێڵێکی ڕاست هـیچ بوارێك نامێنێت ئەو تیشکدانەوەیە بگاتە مانگ بۆیە بەتاریکی و گیراوی دەردەکەوێت

عنْ أبي ذر أنّ النّبيّ صلى الله عليه وسلّم قَالَ، يوْما:

( أَتَدْرُونَ أَيْنَ تَذْهَبُ هَذِه الشَّمْس ؟ ) قَالُوا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ: ( إِنَّهَا هَذِه تَجْرِي حَتَّى تَنْتَهِي إِلَى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ، فَتَخِرُّ سَاجِدَةً. فَلاَ تَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُقَالَ لَهَا: ارْتَفِعِي، ارْجِعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ، فَتَرْجِعُ. فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَطْلِعِهَا، ثُمَّ تَجْرِي حَتَّى تَنْتَهِي إِلَى مُسْتَقَرِّهَا تَحْتَ الْعَرْشِ، فَتَخِرُّ سَاجِدَةً. وَلاَ تَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُقَالَ لَهَا: ارْتَفِعِي، ارْجِعِي من حَيْثُ جِئْتِ، فَتَرْجِعُ. فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَطْلِعِهَا. ثُمَّ تَجْرِي لاَ يَسْتَنْكِرُ النَّاسُ مِنْهَا شَيْئا حَتَّى تَنْتَهِيَ إِلَى مُسْتَقَرِّهَا ذَاكَ، تَحْتَ الْعَرْشِ. فَيُقَالُ لَهَا: ارْتَفِعِي، أَصْبِحِي طَالِعَةً مِنْ مَغْرِبِك . فَتُصْبِحُ طَالِعَةً مِنْ مَغْرِبِهَا ) فَقَالَ رَسُولُ اللَّه صلى الله عليه وسلم: أَتَدْرُونَ مَتَى ذَاكُمْ؟ ذَلِكَ حِينَ ﴿لاَ يَنفَعُ نَفْسا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرا﴾ (الأنعام آية:١٥٨).صحيح مسلم ٢٥٤ الحديث الشريف

پێغەمبەر(سلاوی خوای لێ بێت) ڕۆژێکیان فەرمووی:( ئایا ئێوە دەزانن ئەوخۆرە بۆکوێ دەچێت؟) ووتیان خواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، ووتی (بەڕاستی ئەو خۆرە دەڕوات هەتاکۆتایی دێت بەئارامگەکەی خۆی لەژێر بارەگای خوادا ئینجا دادەکەوێت وکڕنوش دەبات وهەروادەمێنێتەوە هەتا پێیدەوترێ هەستەوەو بەرزبەرەوەو بگەڕێوە ئەوشوێنەی کەلێوەی هاتووی ، ئینجا دەگەڕێتەوەو وایلێدێت دەرکەوتوبێت لەشوێنی بەدەرکەوتنەکەیەوە ، ئینجا دەڕوات هەتاکۆتایی دێت بەئارامگەکەی خۆی لەژێر بارەگای خوادا ئینجا دادەکەوێت وکڕنوش دەبات و هەروادەمێنێتەوە هەتا پێیدەوترێ هەستەوەو بەرزبەرەوەو بگەڕێوە ئەوشوێنەی کەلێوەی هاتووی ، ئینجا دەگەڕێتەوەو وای لێدێت کەدەرکەوتوبێت لەشوێنی بەدەرکەوتنەکەیەوە ، ئینجا دەڕوات خەلکی هیچ شتێکی لێوە بەخراپە نازانن هەتا کۆتایی دێت بەئارامگەکەی خۆی لەژێر

بارەگـای خـوادا ئینجـا پێیـدەوترێ هەسـتەوەو بەرزبـەرەوەو وات لێبێـت لەخۆرئاواکەتـەوە بەدەرکـەویت ، ئینجـا وایلێـدێت لەخۆرئاواکەیـەوە بەدەردەکەوێت). ئینجا پێغەمبەری خوا فەرمووی ئایا دەزانن ئەوڕۆژەتان کەی دێت؟

لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ﴿١٥٨﴾ الأنعام

واتـە :-{ ( يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ﴿١٥٨﴾ الأنعام ) ئەوڕۆژەی کـە هەنـدێك لـە بەڵگە ونیشانەکانی خوا دێن ودەردەکەون باوەڕهێنـانی هـیچ خـاوەن دەروونێك بەکـەڵکی نایـەت ئەگـەر پێشـتر بـاوەڕی نـەهێنابێت یـان چـاکەیەکی لەباوەڕهێنانەکەی دەستنەکەوتبێ }

کەواتـە خولگـەی سوڕانەوەی زەوی بـەدەوری خـۆردا خولگـەیـەکی داخراونیـە ، کەواتـە زەوی دەبێـت بەخولگـەیـەکی سـپرینگی دانـەخراو بـەردەوام بـەدەوری خۆردا بخولێتەوە،لەکاتێکدا کەخولگەی مانگ بەدەوری زەویدا نیمچە داخراوە.

خولگەیـەکی سـپرینگی بـەدەوری گۆیەکـدا کەگۆیەکـە لەجووڵـە دابێـت لـەخاڵی دەست پێکردنیەوەو جارێك سوڕانەوە تائاستی هەمان خاڵ لەسـەرخۆیەوە یـان لەژێرخۆیـەوە درێژیەکـەی دەبێـت زیاتربێـت لەدرێـژی ئەوبازنەیـەی کەلەهـەمان خاڵەوە دەست پێدەکات و لەهـەمان خـاڵ کۆتـایی دێـت بـەهۆی لادانـی خـۆرەوە لەئەنجامی جووڵەکەیدا

زەوی بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە لەماوەی (٢٥ ، ٣٦٥ ) ڕۆژدا سـاڵێکی ڕۆژی (شمسـی) پێـك دەهێنێـت لەکاتێکـدا ئەسـتێرەی عـەتارد کەنزیکترە لـەخۆرەوە لەچـاو زەوی لـەماوەی ( ٨٨ ) ڕۆژدا خولەکـەی خـۆی تـەواو دەکـات ، وە دوورتـرین ئەسـتێرە لـەخۆرەوە ( ٢٤٨ ) سـاڵی دەوێـت لەسـاڵەکانی ئێمـە بـۆ ئەوەی جارێك خولگەکەی تەواوکات بەدەوری خۆردا

زەوی خولێك بەدەوری خۆیدا تەواودەکات لەماوەی ٢٣ کاتژمێر، ٥٦خ ، ٠٩، ٤ چ ، کەئەمـە درێـژی ڕۆژی ئەسـتێرەی زەوییـە ، بـەڵام درێـژی ڕۆژێـك بـەپێی

سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا کەپێی دەگوترێت ڕۆژی هەتاوی یەکسانە بە ( ٢٤ ) کات ژمێر .

زەوی لەخولگەیەکی هێلکەییدا بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوەو لەماوەی ساڵێك خولێك تەواودەکات کەدرێژی ئەوساڵە =

(٣٦٥ ) ڕۆژو( ٥ ) کاتژمێرو ( ٤٨ ) خولەك و (٦٨، ٤٥) چرکە کەئەوە درێـژی ساڵێکی خولگـەیی ( مـداری )یـە بـەڵام ساڵی ڕۆژژمێری ئەوا درێـژی یەکـەی یەکسانە بە ( ٢٥، ٣٦٥ )سێ سەدو شەست و پێنج ڕۆژو چارەگە ڕۆژێك

( الجغرافيا العامة ص ١٠ ، ١١ )

بەڵام ئەگەر خـۆر جوڵا ئەم خولگە هێلکەییە تێکدەچێت و لەماوەی ساڵێکدا جەمسەرەکانی تێکناکەنەوە بەهۆی جووڵەی خۆرەوە

کەواتـە تـۆ لـەڕۆژی ١/ ١/ ٢٠٠٥ تـا ڕۆژی ٢٠٠٦/١/١ پێویستیت بـەکاتێکی درێـژتر هەیـە تادەگیتـەوە هـەمان خـاڵی دەسـت نیشـانکراو ئـەویش بـەهۆی جـووڵانی خـۆرو ڕاکێشـانی خولگـەی خولانـەوەی زەوی بەدەوریـدا کـەدەیکات بەخولگەیەکی سپرینگی

هـەر لەبـەر ئـەم هۆیەشـە ڕۆژەکـانی ساڵی میلادی دەبێـت زیاترین لـەڕۆژەکانی ساڵی کۆچـی ئێمـە ناچارین بۆدیـاری کردنـی کـەژەکان پشـت بەسـوڕانەوەی زەوی ببەسـتین بـەدەوری خـۆردا ، هەربۆیەشـە مێـژووی مـیلادی و مێـژووی کــوردی ( نــەورۆز ) جێگیرکــراون بــەهۆی جــێگیری کەژەکانــەوە بــەڵام بۆبـەکارهێنانی کـات سـوڕانەوەی مـانگ بـەدەوری زەویـدا نـەگۆڕەو بـواری هـیچ زیـادو کەمیـەك نیـە لـە مـاوەی ساڵێکدا لەمـەدارێکی نیمچـە داخراودایـە بەهۆی کــورتی مــاوەی خولانەوەیــەکی مــانگ بــە دەوری زەویــدا لــە چــاو درێــژی خولانەوەیەکی زەوی بە دەوری خۆردا.




ئاراستە ی جووڵەی خۆر وسوڕانەوەی زەوی بە دەوریدا

مادام خۆر لەجووڵەدایە کەواتە دەبێت خولگەی سوڕانەوەی زەویش بەدەوری خۆردا لەجووڵەدابێت .چونکە گونجاونیە خۆر بڕوات وزەویش بەجێبمێنێ. کەواتە وەکو ڕوونمان کردەوە گومان نیە لەوەی کەخولگەی زەوی بەدەوری خۆردا سپرینگیە ، ئینجا ئایا گۆشەی لاری ئەم خولگەیە لەچاو باری ئاسۆیی گۆی خۆردا دەبێت چەند پلەك بێت ؟ بۆ ئەوەی زەوی بەڕێك وپێکی لە خولگەکەی خۆیدا بخولێتەوەو لەخۆر دانەبڕێت و شوێنی کەژو ساڵەکان شێواویان تێنەکەوێت لەژێر کاریگەری جووڵەی خۆردا
خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا بەگۆشەی ( ٢٣:٥ )پلە لارە لەچاو ئاستی هێڵی ستونیدا الجغرافیا العامة ص ١٣ )

کەواتــە خولگــەی زەوی دەبێــت بەهــەمان خێرایــی جوولــەی خــۆرو بەگۆشــەی (٢٣،٥) پلەك ونیو بجوڵێت بۆئەوەی لەخۆر دوانەکەوێت
ئینجا بەهۆی ئەوەی کەخولگەی سوڕانەوەی زەوی پێچەوانەی ئاڕاستەی میلی کاتژمێرە کەواتە دەبێت گۆی زەویش بەهەمان لاربوونەوە بێت بەلای ڕاستدا نەك بەلای چەپدا واتە دەبێت لەزستانەی نیوەی باکوردا لوتکەی باکوری گۆی زەوی دووربکەوێتەوە لەخۆرو لەهاوینیەکەیدا لوتکەکەی نزیك بکەوێتەوە لەخۆر، وە لەنیوەکەی خوارویشدا بەهەمان شێوە لەبەرئەوەی لەیەککاتدا لەسەر گۆی زەوی کە لەنیوەی سەرەوەی زستان بێت ئەوا لەنیوەی خوارەوەی هاوینە وەئەگەر لەنیوەی سەروەیدا بەهار بێت ئەوا بێگومان لەنیوەکەی خوارەوەی پایزە وە بەپێچەوانەشەوە
ڕۆژی یەك شەممەی ڕێکەوتی ٢٢ \ ١ \ ٢٠٠٦ کەناڵی ئاسمانی( الجزیرە ) ڕایگەیاند کە لەووڵاتی ڕۆمانیا ( ١٤٠ ) کەس بەهۆی سەرماوە گیانیان لە دەستداوەو لەهەمان کاتدا لەووڵاتی ( استرالیا ) بەهۆی گەرماوە ئاگرێکی زۆرکەوتۆتەوە وبۆتە هۆی سوتانی دارستانەکان وپچڕانی تەزووی کارەبا
لە کاتێکدا کەنیوەی سەرەوەی گۆی زەوەی لەهاوین دایە ڕۆژەکانی درێژن و شەوەکانی کورتن لەهەمان کاتدا نیوەی خوارەوەی گۆی زەوی لەزستان دایە و ڕۆژەکانی کورت و شەوەکانی درێژن لەوکاتەدا ماوەی نێوان خۆر و زەوی = ١٥٢ ملیۆن کم
بەڵام لەکاتێکدا کەنیوەی سەرەوەی گۆی زەوی لەزستاندایە ڕۆژەکانی کورتن و شەوەکانی درێژن لە هەمان کاتدا نیوەی خوارەوەی گۆی زەوی لەهاوین دایەو ڕۆژەکانی درێژو شەوەکانی کورتن لەوکاتەدا ماوەی نێوان خۆر وزەوی = ١٤٧ ملیۆن کم
بەهۆی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆیدا شەوو ڕۆژ پێکدێن و بەهۆی سوڕانەوەی زەوی بەئاڕاستەی پێچەوانەی میلی کاتژمێر واتە لەخۆر ئاواوە

بەرەوخۆرهـەڵات شـوێنی خۆرهـەڵات و خۆرئـاوابوونی زەوی دیـاری دەکرێـت، لەژێر ڕووناکی فەرموودەکەدا دەبێت خۆر بەرەو سەرەوە بڕوات تادەگات بەژێر عەرشی پەروەردگار لەوێدا جاری یەکەم و جاری دووەم فەرمانی پێدەکرێت کە بگەڕێتـەوە بـۆ ئەوشـوێنەی کەلێوەیـەوە هـاتووە ئینجـا ئەگـەر ڕۆیشـتنەکەی بـەهێڵێکی ڕاسـت یـان بەشـێوەی لـولی سـپرینگی بێـت ئـەوا کاتێـك دەگاتـە ئارامگاکـەی و فـەرمانی پێـدەکرێ کەبگەڕێتـەوە هـیچ ڕێگەیـەك نیـە تـەنها ئـەوە نەبێت کە بەپێچەوانەی ئاڕاستەکەی بگەڕێتـەوە لـەم کاتەشـدا دەبێـت خولگـەی سوڕانەوەی زەویش ئاڕاستەکەی بگۆڕێت بەئاڕاستەی میلی کاتژمێر، بۆ ئەوەی شوێنی کەژەکان و شوێنی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوابوون نەگۆڕێت

کەواتـە تاکـە ڕێگـا بۆگەڕانـەوەی خـۆر بۆئەوشـوێنەی کـەلێوەی هـاتووە سـوڕانەوەیەتی لەخولگەیـەکی بازنـەیی یـان هێلکەییـدا کـەخۆر دەگەیەنێتـەوە بەشـوێنەکەی خـۆی بـێ ئـەوەی هـیچ گۆڕانکاریـەك بەسـەر شـوێنی کـەژەکان و خۆرهەڵاتندا بێت

بـەڵام لـەجاری سـێیەمدا کەفـەرمانی پێـدەکرێت بگـەڕێرەوە بـۆ ئەوشـوێنەی کەلێوەی هاتووی و لەخۆرئاواکەتەوە دەربکەوەوە ئەوە دەگەیـەنێت کـەدەبێت خـۆر لەسـەر هـەمان ئـەم خولگەیـە بـەردەوام بێـت تادەگاتـەوە ئەوشـوێنەی کـەلێوەی هـاتووە ئەوسـا لـەوێوە بەئاڕاسـتەی پێچـەوانە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئارامگەکـەی لـەژێر عەرشـی خـوادا ئینجـا کـەڕۆژ ئاڕاسـتەکەی خـۆی گـۆڕی کەواتە دەبێت ئاڕاستەی سوڕانەوەی زەویش بەدەوری خۆردا بگۆڕێت بۆئەوەی لـەخۆر دوا نەکـەوێت کەواتـە دەبێـت ئەوکاتـە خولگـەی زەوی بـەدەوری خـۆردا بەئاڕاستەی میلی کاتـژمێر بسوڕێتەوە کەدەبێتـە هـۆی دەرکـەوتنی خـۆر لـەلای ڕۆژئـاوای گـۆی زەوی‌یـەوە کەواتـە دەبێـت پەیوەندیـەکی ڕاسـتەوخۆ هـەبێت لـەنێوان ئاڕاسـتەی جوڵـەی خـۆرو ئاڕاسـتەی خولگـەی زەوی بـەدەوری خـۆردا هەرکاتێك کە یەکەمیان گۆڕا دووەمیشیان لەگەڵیدا دەگۆڕێت

لەو سەردەمەی ئێستادا خۆر ٧٠ ٪ هایدرۆجین و ٢٨ ٪ ی هێلیۆمە
( www. Yahoo.com الشمس )

وەکو ئاشکرایە هایدرۆجین گازێکە خۆی دەسوتێت ، وە هێلیۆم گازێکی تەمبەڵ و سوکەو لەبەرزبوونەوەدایە ، کەواتە گومان نیە لەوەی کەدەبێت گۆی خۆر لەجووڵە دابێت  ئینجا وەکو لەزانستەکەی سەرەوەدا ئاشکرایە کەلە وسەردەمەی ئێستاماندا جووڵەی خۆر لەژێر کاریگەری هایدرۆجین و هێلیۆمە کەکێشەکانیان بەرەو سەرەوەن . کەواتە گونجاوە لەسەردەمێکی تردا لە ئەنجامی سووتانی گازەکانی خۆر گازی وەها پەیدا ببێت کەکێشەکانیان لە هایدرۆجین و هێلیۆم زیاتربێت و ببێتە هۆی دابەزاندنی گۆی خۆر و گۆڕینی ئاراستەکەی

زۆر دیاردەی جوگرافیایی هەن کەپشتیوانی لەیاسای جووڵەی خۆر دەکەن و دەیسەلمێنن کەنابێت خۆر وەستاوبێت  بۆنمونە :-

ئەگەر خۆر لەخاڵێکی جێگیر بووایەو نەجولاَبایە ئەوا بەدڵنیاییەوە دەبوو سەرمای زستانی هەموو ساڵەکان لەیەکەوە نزیك بوانایە وە هەروەها دەبوو گەرمای هەموو هاوینەکانیش وەکو یەکتری وابان ، بەلاَم ئەوەش لای هەمووان ئاشکرایە کەوانیە  کەواتە دەبێت هۆیەك هەبێت کە لەنێوان زستانی ئەمساڵ و زستانی ساڵی داهاتوودا کاریگەرییەکی وەهای هەبێت لەسەر گۆی زەوی بەشێوەیەك کەزستانی ئەمساڵ ووشك و بێ بەفرو باران بێت و زستانی ساڵی ڕابردوش بەفرو باراناوی بووبێت  هەروەها زیادکردنی ڕۆژێك لەمانگی شوبات لە ٢٨ بۆ ٢٩ لەماوەی چەند ساڵێکدا بەڵگەیەکی ئاشکرایە کە ڕۆژێکی زیاد هەیە لەماوەی چەند ساڵێکدا بەمێژووی میلادی کە لەئەنجامی جووڵەی خۆرەوە پەیدا دەبێت



زەوی : سوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا
خۆر : جوولەی خۆر بەرەو ئارامگەکەی خۆی .

لە سەدەی بیستەم دا زوو زووهەواڵی ( صحن طائر ) بەرگوێمان دەکەوت و لەزۆر شوێندا دەبیندران

ئایا بۆ ئێستا نابیندرێن ؟ ئایا ئەم ڕووداوانە بەپلەی یەکەم ئەوە ناگەیەنن کە زەوی لە ئەستێرەکانی ئەوان نزیك بۆتەوەو ئەوانیش بۆناسینی گۆی زەوی و تێگەیشتن لەوەی کەهێزێکی دۆستە یان دوژمنە لێمان نزیك دەبوونەوە بەڵام ئێستا کەئێمە لێیان دورکەوتوینەوە مەترسیان نەماوەو ئەوانیش لێمان نزیك نابنەوە ئایا ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزنیە بەوەی کەگۆی زەوی لەخولگەیەکی دانەخراو بەدەوری خۆر دەخولێتەوەو لەجێگۆڕکێ دایە لەژێر کاریگەری جولەی خۆردا ؟

رَبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ﴿٢٨﴾ سُورَةُ الشُّعَرَاءِ

پەروەردگاری ڕۆژهەلات و ڕۆژئاواو ئەوەی کە لەنێوانیان دایە

واتە دەست نیشانکردی شوێنێك لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ دەرکەوتن و ئاوابوونی خۆر لەهەر خاڵێکی سەرزەوییەوە

رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴿١٧﴾ سُورَةُ الرَّحْمَٰنِ

پەروەردگاری دوو ڕۆژهەڵات و پەروەردگاری دوو ڕۆژئاوا

دوو ڕۆژهەڵات و دوو ڕۆژئاوا واتە لەماوەی خولێکی خولانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا لەساڵێکدا شوێنی خۆرهەڵات وخۆرئاوابوون دەگۆڕدرێن لەوپەڕی بەرزییەوە بۆ ئەوپەڕی نزمی لەژێر کاریگەری دوورو نزیکی خۆر لەگۆی زەوییەوە.

فَلَآ أُقْسِمُ بِرَبِّ ٱلْمَشَٰرِقِ وَٱلْمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ سُورَةُ الْمَعَارِجِ

لە بەر دڵنیایی لەهێزو تواناو دەسەڵاتەکەی ، پەروەردگار دەفەرموویێت سوێندناخۆم بەشوێنەکانی هەڵاتنی خۆر و شوێنەکانی ئاوابوونی خۆر، ئێمە تواناداریــن.

واتە لە دوو شوێن زیاترن ، کەدەکەوەنە نێوان بەرزترین شوێنی خۆرهەڵاتن وخۆرئاوابوون و نزمترین شوێنی خۆرهەڵاتن وخۆرئاوابوون لەژێر کاریگەری گۆڕانی ماوەی نێوان خۆرو زەوی

لەهاوینەی نیوەی باکوری گۆی زەویدا خۆر لەبەرزترین شوێنی دەرکەوتنی دایە بۆیە ڕۆژەکان درێژن وە لەزستانەکەیدا لەنزمترین شوێنی دەرکەوتنی دایە بۆیە ڕۆژەکان کورتن وە لە بەهاران و پایزاندا لەناوەڕاستی ئاستە بەرزو ئاستە نزمەکەی دایە بۆیە شەو وڕۆژەکان یەکسانن .وە لەپایزەوە بەرەو زستان بۆلای ئاستە نزمەکەی دەجووڵێت بۆیە ڕۆژەکان کورت دەبنەوە ، وە لەمام ناوەندی بەهاران بەرەو هاوین بەرەو ئاستە بەرزەکەی دەجووڵێت بۆیە ڕۆژەکان بەرەو درێژی دەڕۆن




اطلس العالم ار الشرق العربي ص 10

لەمێژووی میلادیدا بەهۆی ساڵەکانەوە ماودی مانگەکان دیاریکراون وە ساڵێك کراوە بەدوانزدە مانگ و هەندێك لەمانگەکان (٣٠ ) یان (٣١) ڕۆژن وەمانگی شوبات (٢٨) ڕۆژە وە ئەوزیادوکەمیەی کە لەپێشەوە باسمانکرد وادەکات لەماوەی چەندساڵێکدا مانگی شوبات ببێت بە (٢٩) ڕۆژ

بەلاّم ساڵی کۆچی بەهۆی مانگەکانەوە دیاریدەکرێت مانگەکانیش بەهۆی تەواوکردنی قۆناغەکانی سوڕانەوی مانگ بەدەوری زەویدا دیاریدەکرێن

وَٱلْقَمَرَ قَدَّرْنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلْعُرْجُونِ ٱلْقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ سورة يس

وەمانگمان ئەندازە گرتووە بەپێگەکانی هەتا دەگەڕێتەوە وەکو لاسکە خورمای وشك ( دەردەکەوێت ).

وواتە دەرکەوتنی مانگمان ئەندازە گرتووە بەپێگەکانی کە هەرڕۆژە لەپێگەیەکەوە بۆپێگەیەکی تر بەرەو کەمی دەڕوات تا لەکۆتایدا دەرکەوتنەکەی واکەمدەبێتەوە وەکو لاسکە خورمای ووشکی باریك ولاواز دەردەکەوێت و کۆتایی مانگەکەو لەدایك بوونی مانگێکی تازە ڕادەگەیەنێت

(القمر) تاكە مانگێکی سرووشتی خوا کردە بۆزەوی و ( ٣٨٤٤٠٠ ) کم لێیەوە دوورە و تیرەکەی (٣٤٧٦ )کم (www Yahoo.com)




پاشەکشێکانی مانگ لە ماوەی یەك مانگ دا

سەرەتای ساڵی کۆچی بەیەکەم ڕۆژی مانگی ( محرم ) دەست پێدەکات. سەرەتای هەموومانگێکی کۆچی لەسەر گۆی زەوییەوە وەکو دەمەداسێك لەلای ڕۆژئاواوە دەبیندرێت ڕۆژ لەدوای ڕۆژ مانگەکە بەرزدەبێتەوەو پڕتر دەردەکەوێت تا وای لێدێت لەناوەڕاستی ئاسماندا وەکو بازنەیەکی ڕووناك دەبیندرێت ئینجا وردە وردە کەمدەکات تا لەکۆتایی مانگەکەدا لەگەڵ بەربەیانی دواڕۆژدا لەلای ڕۆژهەڵاتەوە بزر دەبێت و بۆ ئێوارەی ڕۆژی دوایی لەلای ڕۆژئاواوە دەبینرێت کەموژدەی هاتنی مانگێکی تازەیە

مانگەکان لەمێژووی کۆچیدا یان (٢٩ ) یان (٣٠) ڕۆژن بەپێی پێگەکانی سوڕانەوەی مانگ بەدەوری زەویدا ئەم پێگانە لەمانگێکەوە بۆمانگێکی تر یان لە ڕەمەزانی ساڵێکەوە بۆڕەمەزانی ساڵێکی تر دەگۆڕێن بەهۆی گۆڕانی شوێنی زەوی بەدەوری خۆردا لەژێر کاری گەری جووڵەی خۆردا بۆیە ڕۆژەکانی

هەرمانگێك لەچاو ساڵەكانەوە جێگیر نیە ، لەوانەیە ڕەمەزانی ئەم ساڵ ( ٢٩ ) ڕۆژ بێت بەڵام ڕەمەزانی ساڵی داهاتوو (٣٠) ڕۆژبێت

إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ
يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴿٣٦﴾ سُورَةُ التَّوْبَةِ

بەڕاستی ژمارەی مانگەكان لەلای خوا دوانزدە مانگن لەكتێبی خوادا ئەو ڕۆژەی كەئاسمانەكان وزەوی دروستكرد

ئینجا بۆدیاری كردنی ڕۆژەكانی مانگێكی كۆچی بەوەی ئایا ئەم مانگە (٢٩) ڕۆژە یان (٣٠) ڕۆژە ، ئەوا پەنا بۆبەر ئەم لێكدانەوەیە دەبەین :-

ماوەی سوڕانەوەی مانگ بەدەوری زەویدا لە شەوڕۆژێكدا هەمان ئەو ماوەیەیە كە زەوی دەیبڕێت لە خولێك بەدەوری خۆیدا

مانگ لەكاتی سوڕانەوەیدا بەدەوری زەویدا بە (٢٣) كاتژمێرو ( ٥٦ ) خولەك و (٤,٠٩ ) چركە پاشەكشێكانی خۆی تەواو دەكات تادەگات بەكۆتایی، كەواتە ئەگەرمانگەكە (٣٠) ڕۆژ بێت ئەوا (٢٣) كاتژمێرو ( ٥٦ )خولەك و( ٠٩، ٤ ) چركە دابەش دەكرێت بەسەر (٣٠) ڕۆژەكەدا بۆ ئەوەی بزانین هەر ڕۆژەی مانگەكە چەند لەكورتی دەدات

٢٣ × ٦٠ = ١٣٨٠ خولەك

١٣٨٠ خولەك + ٥٦ خولەك - ١٤٣٦ خولەك

١٤٣٦ × ٦٠ = ٨٦١٦٠ چركە

٨٦١٦٠ چركە + ٠٩ ، ٤ = ٠٩، ٨٦١٦٤ چركە ماوەی شەو و ڕۆژێك لە سەر گۆی زەوی

٠٩، ٨٦١٦٤ چركە ÷ ٣٠ ڕۆژ = ١٣٦٣٣٣٣٣ ، ٢٨٧٢ چركە بۆهەر یەك ڕۆژ پاشەكشێ

١٣٦٣٣٣٣٣ ، ٢٨٧٢ چركە ÷ ٦٠ چركە = ٨٦ ٨٨٨٨ ، ٤٧ خولەك بۆ هەر یەك ڕۆژ پاشەكشێ

واتـه ئەگـەر شـەوێك مـانگ كاتـژمێر (٩) لـەخاڵێكی دیـاریكراوی سـەرزەویەوە بەدەركەوت و بۆشەوی دوایی لەهەمان خاڵەوە كات ژمێر ( ٤٨ ٩ ) نۆ و چل و هەشت خولەك دەركەوت ئەوا ئەومانگە (٣٠ )ڕۆژە

بەهــەمان شـێوە ئەگــەر (٢٣) كاتــژمێرو ( ٥٦ ) خولــەك و( ٠٩، ٤ ) چـركە دابەشی(٢٩) ڕۆژ بكرێت :-

٠٩، ٨٦١٦٤ چـركە ÷ ٢٩ ڕۆژ = ١٧٥٥١٧، ٢٩٧١ چـركە بـۆ یـەك ڕۆژ پاشەكشێ

١٧٥٥١٧، ٢٩٧١ چركە ÷ ٦٠ چـركە = ٥١٩٥٩١، ٤٩ خولـەك بـۆ یـەك ڕۆژ پاشە كشێ

ئەگـەر شـەوێك مـانگ كاتـژمێر(١٠) لـە خـاڵێكی دیـاریكراوەوە لەسـەرزەویەوە دەركـەوت و بۆشـەوی دوایـی لەهـەمان خاڵـەوە كاتـژمێری (٥٠: ١٠) دەوپـەنجا خولەك بەدەركەوت ئەوا ئەومانگە (٢٩) ڕۆژە

هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ
لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ﴿٥﴾ سُورَةُ يُونُس

ئـەو خوایەیـە وای لـەخۆر كـردووە كـەڕووناك بێـت ومـانگ ڕەوشـەندار بێـت و ئەنــدازەی پێگــەكانی بۆمــانگ دانــاوە بۆئــەوەی فێــری ژمــارەی ســاڵەكان و ژمێریاری ببن

كەواتـە لێـرەدا گومـان نـامێنێ كـەمانگ تایبەتمەنـدە بـەدیاریكردنی مانگـەكان و ساڵەكانەوە. ئینجا ئەم دوو مێژووە هەردووكیان مێژووی بەرنامەی ئاسمانین و پـیرۆزن، خـوا لـە باسـی مێـژووی مانـەوەی خـاوەن باوەڕەكـانی پـەیڕەوانی پێغەمبەری مەزنمان عیسا( سەلامی خوای لێبێت ) لەئەشكەوتەكەیاندا بەهەردووك مێژووەكە ڕووداوەكە دەگێڕێتەوە دەفەرمووێت :-

وَلَبِثُوا۟ فِى كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِا۟ئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا ﴿٢٥﴾ سُورَةُ الكَهْف

وەمانەوە لە ئەشكەوتەكەیاندا سێ سەدساڵ ونۆ ساڵیشیان زیادكرد.

واتە (٣٠٠) ساڵ مانەوە بەمێژووی میلادی و (٩) ساڵیان زیادکرد بۆئەوەی ببێت بە (٣٠٩) ساڵ بەمێژووی کۆچی ، کەواتە لێرەدا پەروەردگار پێمان ڕادەگەیەنێت کەجیاوازی نێوان مێژووی میلادی و مێژووی کۆچی بۆهەر (٣٠٠) ساڵ (٩) ساڵە. واتە ئەگەر پشت بەسوڕانەوەی زەوی ببەسترێت بەدەوری خۆردا بۆدیاریکردنی ساڵەکان ئەوا جیاوازی یەك دروست دەبێت بەهۆی جووڵەی خۆرەوە کە بۆهەر ٣٠٠ سێ سەد ساڵێك بەپێی سوڕانەوەی زەوی بەدەوری خۆردا دەکاتە ٣٠٩ ساڵ بەپێی سوڕانەوەی مانگ بەدەوری زەویدا

لەشیکردنەوەو لێکدانەوەی مانای ئایەتەکەدا پەروەردگار بانگ لەپێغەمبەری ئیسلام ( محمد ) (سەلامی خوای لێ بێت) دەکات :-

وَإِنَّ يَوْمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ سُورَةُ الحَجّ

واتە ئەی محمد بەڕاستی ڕۆژێك لەلای پەروەردگاری تۆ وەکو ژماردنی هەزار ساڵی ئێوە وایە هەزار ساڵی سەردەمێك کەمحمد(سلاوی خوای لێ بێت)پێیەوە پابەندبووە کەپشت بەستن بووە بەخولانەوەی مانگ بەدەوری زەویدا

کەواتە دروستکردنی بوونەوەر لەلایەن پەروەردگارەوە (٦٠٠٠) شەش هەزار ساڵی کۆچی دەگەیەنێت

لەو ماوەیەدا ئەم زەوی و ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە و ئاسمانەکان و زەڕڕەو گەردیلەو باوباران و هەورە تریشقە و ئاووهەواو ئاگرو خاك و.........هەرچی هەیە زۆر بەئەندازەیی و وورده کارانە دروستیکردن

إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ سُورَةُ القَمَر

ئێمە هەموو شتێکمان بەئەندازە دروستکردوە.

ئەم بوونەوەرە ئەوەندەی لەمرۆڤ ئاشکرایە لە (١٠٦) توخم پێکهاتووە کە ئەوانیش ئەو توخمانەن کە لەخشتەی (مندلیف) دیاریکراون ولەپێکهاتەکانی بوونەوەرەدا بەشدارن

ئەم توخمانە هەندێکیان لەدۆخی ڕەقیدان و هەندێکیشیان لەدۆخی شلی یان گازیدان و هەریەکەیان ڕەوشتی تایبەتی خۆی هەیەو ڕێژەکەی دیاریکراوو نەگۆڕە، لەئەنجامی کارلێکردنی کیمیائی لەنێوان دوو توخم یان زیاتر پلەی گەرمی یان گڵپەوگڕو ڕووناکی و بڵێسە یان گازێکی کوشندەی ژەهراوی یان ترشێکی سوتێنەر ....پەیدا دەبن

( گەرد )بچوکترین بەشی ماددە دەگەیەنیٚ کە ڕەوشتەکانی ئەوماددەیەی تیادا هەبێت

(گەردیلە) بچوکترین ووردیلەی توخمێکە کە لە کارلێکی کیمیائیدا بەشداری دەکات . بۆ زیاتر شارەزابوون لەپێکهاتەی دروستکروەکان پێویستیمان بەوە هەیە چاك لەگەڵ گەردیلەدا یەکتری بناسین و لەڕێگەی ئەم یەکترناسینەوە بگەینە نهێنی پێکهاتنی جەستەی دروستکروەکان

# پێك هاتنی گەردیلە

١- ناوك :- قەبارەیەكی بچوكە لەناو گەردیلەدا چڕو پڕە لەتەنۆكەی بنچینەیی پێكهاتووە كە ئەمانەی خوارەوەن :-

أ- پڕۆتۆن :- تەنۆكەی بچوكی بارگە گەرمن (+) ژمارەیان لە توخمێكدا جێگیرەو لەتوخمێكەوە بۆتوخمێكی ترجیاوازە ، لە بوارە زانستیەكاندا بەنیشانەی ($p^+$) ناسراوە

ب- نیوترۆن :- تەنۆكەی بچوكی هاوبارگەن بارستەی هەریەكەیان بەئەندازەی پڕۆتۆنێك دەبێت و لەبوارە زانستیەكاندا بە ( n ) ناسراوەو ژمارەیان وەكو ژمارەی پڕۆتۆنەكانە

٢- ئەلكترۆن :-

تەنۆكەی زۆر بچوكن بارگەساردن ( - ) بارستەی هەریەكەیان ( ١/١٨٣٧ ) ی بارستەی پڕۆتۆنێكە ، بارگەكەیان ئەوەندەی بارگەی پڕۆتۆنەو لەبوارە زانستیەكاندا بەنیشانەی (e) ناسراوەوژمارەیان وەكو ژمارەی پڕۆتۆنەكانە.

ئەلكترۆنەكان لەچەند بوارێكدا كەپێیان دەڵێن بەرگ بەدەوری ناوكە گەردیلەدا دەخولێنەوە ، بەرگی یەكەم جێگای (٢) ئەلكترۆن و بەرگی دووەم جێگای (٨) ئەلكترۆن وە بەرگی سێهەم جێگای (١٨) ئەلكترۆن دەبنەوە

بۆ نمونە :- گەردیلەی $O_2$

ژمارەی $p^+$ = 8

ژمارەی n = 8

ژمارەی e = 8



واتە گەردیلەی ئۆکسجین لەبەرگی دووەمیدا کەجێگەی(٨) ئەلکترۆن دەبێتەوە تەنها (٦) شەش ئەلکترۆنی هەیە واتە توانای وەرگرتنی دوو ئەلکترۆنی هەیە بۆئەوەی پڕببێت وەتێر ببێت وەبەمەش جێگیر دەبێت

هەروەها گەردیلەی هایدروجین ( H ) :-




ژمارەی $p^+ = 1$

ژمارەی $e = 1$

واتە گەردیلەی هیدروجین لەبەرگی یەکەمدا کەجێگەی دوو ئەلکترۆن دەبێتەوە تەنها (١) ئەلکترۆنی هەیە

بە یەکگرتنی دووگەردیلە هیدرۆجین ( H ) گەردێك لەگازی هیدرۆجین ( $H_2$ ) دروست دەبێت




دوو گەردیلە هیدرۆجین گەردێك گازی هیدرۆجین دروست دەکەن

وامان بەباش زانی گازی هیدرۆجین ($H_2$) و گازی ئۆکسجین ($O_2$) وەکو نمونەکان بخەینە ڕوو لەبەر ئەوەی ئەم دووگازە بەشێوەیەکی بنچینەیی بەشداری دەکەن لەپێکهاتەیەکی نوێ کەئاوە ( $H_2O$ ) کە ئەم پێکهاتە نوێیە کەرەسەیەکی بنەڕەدییە بۆدروستکردنی هەموو پێکهاتە زیندووەکان.

بەیەك گرتنی گازی هیدرۆجین ($H_2$) لەگەڵ گازی ($O_2$ ) ئەوا پێکهاتەیەکی تازەمان بۆدروست دەبێت پێی دەگوترێت ئاو $H_2O$




واتە تواندرا لەم دووڕەگەزە پێکهاتەیەکی تر دروست بکرێت کە ئاوە $H_2O$ ئینجا ئەم ئاوەش لەهەموو پێکهاتوە زیندووەکانی ئەم بوونەوەرەدا بەشداری دەکات

وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ﴿٣٠﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

وەئێمە هەمووشتێکی زیندوومان لەئاو دروستکردووە

بەم شێوەیە لەئەنجامی یەکگرتنی ئەو توخمانە کەلەلایەن دروستکەرەکەیانەوە زانست وئارەزوویان پێدراوە کە لەگەڵ یەکتریدا یەکتربگرن و بەهەزاران ماددەو پێکهاتەیان لێپێکبێت ، هەرتوخمێك ڕەوشتی تایبەتی خۆی پێدراوە لەژمارەی پرۆتۆن ونیوترۆن وئەلیکترۆن ولەڕەنگ وبۆن وکێش ودرەوشانەوەو کپی و تیشکدان و پاراستنی ڕەوشتە بنەڕەدیەکانی لەکاتی کارلێکردندا لەگەڵ توخمەکانی تردا هیچ توخمێك زیادەڕەوی ناکات لەو ئەرکەی کەپێی سپێردراوە.

لەپێکهاتەی ئاوەکەدا ئۆکسجین و هیدرۆجینەکە ڕەوشت و تایبەتمەندی یەکانی خۆیان دەپارێزن ، بۆیە هەرکاتێك کەوویستمان دەتوانین ئاوەکە لەیەك هەڵوەشێنینەوەوهەمان هیدروجین و ئۆکسجین دەردەکەونەوە کەئاوەکەیان

لێپێکهـاتبوو، وه ووردیلەیـەکیش لـەکێش و ڕەوشـت و تایبەتمەندییـەکانی خۆیان بزرناکەن   کەواتە دەتوانین بڵێین :-
لـەنێوانی کەرەسـەو دروسـتکروەکاندا پەیوەندییـەکی بـەهێز هەیـە بـەدوو ئاڕاستەی پێچەوانە لەکاتی بوونی وویستێك کەهۆیەکی یاریدەدەرە
لەکاتی یەکگرتنی گازی هیدروجین وگازی ئۆکسجینەکەدا هیدرۆجین کە بارگە گەرمە (+) دوو ئەلکترۆنەکانی خۆی دەدات وە ئۆکسجین کە بارگەکەی ساردە (−) دوو ئەلکترۆنـەکان وەردەگرێـت   کەواتـە دەتوانـدرێت بووترێـت لەئەنجامی یـەکگرتنی هیـدرۆجینی نێرینـە و ئۆکسـجینی مێینـە کۆرپەیـەکی سـاوا لـەدایك دەبێـت کـە نـاوی ئـاوە   ئاوەکـە لەشـێوەی دەرەوەیـدا سـیمای هیـدرۆجین و ئۆکسـجینەکەی پێـوە دیـارە کەبـە $H_2O$ ناسـراوە بـەلاَم ڕەنگدانـەوەی دیـوی نـاوەوەی ئـەم ئـاوە کەدەروونەکەیـەتی جیاوازیـەکی زۆری هەیـە لەگـەڵ ئـەو ئۆکسجین و هیدرۆجینەی کە لێیان پێکهاتووە
($H_2O$) شێوەی دەرەوەی ئاوە بەلاَم دیوی ناوەوەی ئاو تینویەتی دەشکێنیٚ و ئاگر دەکوژێنێتەوەو بەشدارە لەپێکهاتەی هەموو زیندەوەرێکدا
لەکاتێدا کـەدیوی دەرەوەی ئۆکسـجین بە ( $O_2$ ) ناسـراوە بـەلاَم دەسـەلاَتەکانی دیـــوی نـــاوەوەی کەدەســـەلاَتی دەروونەکەیـــە یارمـــەتی ســـوتان دەدات و بۆهەناسەدان بەکاردێت و لـەئاودا دەتوێتـەوە ، بەهـەمان شـێوە دیـوی دەرەوەی هیـــدرۆجین بـــە ( $H_2$ ) ناســـراوە بـــەلاَم دیـــوی نـــاوەوەی کەدەســـەلاَتی دەروونەکەیەتی ئەوەیەکە گازێکە بۆخۆی دەسوتێت
لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتـەوە کەهـەموو توخمێك یـان هـەر پێکهاتەیـەك خـاوەنی دەروونێکی تایبـەتی خۆیـەتی کـەجیاوازە لەگـەڵ دەروونـی هەرپێکهاتەیەك یـان توخمێکی تردا
لەگەڵ پەیدابوونی ئاوەکەدا دەسەلاَتە دەروونیەکانی هیدرۆجین و ئۆکسجینەکە بزر دەبن ئایا چیان بەسەردا دێت ؟

وەکاتێك کە ئاوەکە بەهۆی گەرمکردنەوە دەمرێندرێت و لەیەك هەڵدەوەشێتەوە بەبێ هیچ کەموکوڕیەك هیدرۆجین و ئۆکسجینەکە دەردەکەونەوەو ئاوەکە بزر دەبێت ، ئایا ئاوەکە چی لێهات ؟

لەوەلامی پرسیاری یەکەمدا کەئاوەکە پەیدابوو دەسەلاتە دەروونیەکانی هیدرۆجین و ئۆکسجینەکە دەگەڕێندرێنەوە بۆلای دروستکەرەکەی لەشوێنێکدا دەپارێزرێن تاکاتی دروستکردنەوەیان دێتەوە. دروستکەرەکەی هەرخۆی دەزانێ لەکوێ دەیانپارێزێ و تائێستا زانست پەی بەم شوێنە نەبردووە

لەوەلامی پرسیاری دووەمدا کەئاوەکە دەمرێت و لەیەك هەڵدەوەشێت و دەگەڕێتەوە بۆکەرەسە خاوەکەی کە هیدرۆجین و ئۆکسجینن، ئەوا دەروونەکەی دەگەڕێندرێتەوە بۆلای دروستکەرەکەی تاکاتی دروستکردنەوەی.

وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ
وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ
وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ﴿٥٩﴾ سُورَةُ الأَنعَام

کلیلەکانی دنیای نادیار هی ئەون ولای ئەون کەس نایانزانێ تەنها ئەونەبێ،وەزانیاری هەیە بەوەی لەوشکایی ولەدەریادان و لەگەڵ وەرینی گەلای دارێك هەر پێیدەزانێ وە نەدانە دەنکێك لەتاریکایەکانی زەویدا و نەهیچ تەڕ ونەهیچ وشکێك نەماوە هەر لەکتێبەکە ڕوونکراوەتەوە

لە دروستکراوە زیندووەکاندا ئەوەی کەدەمرێت تەنها دیوی دەرەوەیەتی کەڕێژە وپێکهاتە و ئەندازە و شێوەی یەکگرتنی دروست بوونی لاشەکەیەتی و دیوی ناوەوەی کەدەروونەکەیەتی ڕەنگدانەوەی ڕێژەو پێکهاتە و ئەندازەو شێوەی ئەو توخمانەیە کەلاشەکەی لێپێکهاتووە ، ئەم ڕەنگدانەوەیە کە دەروونەکەیەتی لەلایەن پەروەردگارەوە وەردەگیرێتەوەو هەر خۆی دەزانێ لەکوێ دەیپارێزێ و لەکاتی زیندوکردنەوەیدا بۆی دەگێڕێتەوە

ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا
فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى
إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ سُورَةُ الزُّمَرِ

خـوا دەسـەلاتی دەروونـەكان وەردەگرێتـەوە لـەكاتی مردنیانـدا بەشـێوەیەك كەلـەكاتی خەوتوییانـدا نـامرن ، ئینجـا ئـەوەی كـەمردن بەسـەریدا زاڵبـووە خوادەیگرێتـەوە لـەلای خـۆی وە یـەكێكی تـر دەنێـرێ تاكـاتێكی دیـاریكراو بەڕاسـتی لـەم كـردارەدا بەڵگـە و نیشـانە هـەن بـۆ گـەل و نەتەوەیـەك كەبیردەكەنەوە. ئەم باسە بەووردی لەبەشەكانی داهاتوودا ڕووندەكەینەوە

لەیـەككرتنی هیـدرۆجین و ئۆكسـجین ئـاو پێكهـات ، هـەمان هیـدرۆجین لەكارلێكێكی كیمیائی لەگەڵ كلۆر پێكهاتەیەكی نوێ دروست دەبێت كەپێی دەگوترێت هیدروكلۆریك ئەسید ( Hcl ) كەپێكهاتەیەكی ترشەڵۆكەو توانای تواندنەوەی هەنێك لەپێكهاتەكان و خانەزیندووەكانی لەشی زیندەوەرانی هەیە لەكارلێكە كیمیائیەكاندا ، وە بەشداری دەكات بۆ دروست بوونی پێكهاتەی نوێ

$$H_2 + cl_2 \longrightarrow 2\ Hcl$$

لەكاتێكـدا كـەكارلێكی كیمیـائی ڕودەدات لـەنێوان ( Hcl ) و ( NaOH ) هیدرۆكسیدی سۆدیۆم ، پێكهاتەی نوێ پەیدادەبن وەكو ( Nacl ) كەخوێی چێشتە لەگەڵ ئاو ( $H_2O$ )

ئینجـا ئـەو كلۆریـدی سـۆدیۆمە لەگـەڵ ئاوەكـە دەتوانرێـت بـەهۆی لێـك جیاكردنـەوەی كارەباییـەوە لەیـەكتر هەڵبوەشێندرێنەوە بۆ گازی هیدرۆجین و گازی كلۆرو هیدرۆكسیدی سۆدیۆم

$$NaOH + Hcl \longrightarrow Nacl + H_2O$$

الكيمياء اللاعضوية ل (٢٥٠)

$$2NaCl + 2H_2O \xrightarrow[\text{کارە با یی}]{\text{لیك جیا کردنە وەی}} 2NaOH + Cl_2 + H_2$$

الكيمياء اللاعضوية ل (٢٢٨)

لێرەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەلەئەنجامی کارلێکی کیمیائی ئەو (١٠٦ ) توخمەی ناو بوونەوەر دەتواندرێت بەهەزاران پێکهاتەی تر دروست بکرێت کەبەشدارن لەپێکهاتەی جەستەی تەنەزیندووەکان و تەنەمردووەکاندا.کەواتە ئەگەر زانستیمان هەبێت دەتوانرێت پێکهاتەکانی ئێسك و کرکراگە و گۆشت و دەمار و جومگە و خانەکانی کۆئەندامی هەست وبینین و خانە ورد و بەتواناکانی مێشك و پەردە تەنکەکانی گوێ و خانەکانی کۆئەندامی هەناسە و هەرس و زاوزێ ڕەنگی پێست و پرچ بزاندرێت، دەتوانرێت ڕەنگاوڕەنگی گوڵ و بۆنەکەی و سەوزی گەڵا و خانەپتەوەکانی قەد وخانە زیرەکەکانی ڕەگ بۆمژینی توخمەکانی خاك بناسرێن

دەتوانرێت شەکر و خوێ وقاوە و کەکاو و شیر و گەنم و برنج و سەوزەو میوەو تایت وسابوون وشامپۆ وبۆنەخۆشکەرەکان بناسرێن، دەتوانرێت پەینی کیمیائی وداوودەرمان و گازی کوشندەدروست بکرێن ، دەتوانرێت زێڕو زیوو دوڕ ومەرجان و بەردە بەهادارەکان بناسرێن بەلأم ئایا ئێمەچەند زانستیمان پێدراوە؟

ناوکی کولەکە بڕێکی باش لەتوخمی زینگی تێدایە کە لەڕەگەکانیەوە لەخاك وەری دەگرێت کە بۆچارەسەری نەخۆشیەکانی پرۆستات بەکاردەهێندرێت.

( 1001 NATURAL REMEDIES P. 47 )

گێزەر ( جزر ) carrot ٠,٠٣ ٪ چەوری و ٩٪ شەکری تێدایە جگە لەوەی کە گۆگرد و فۆسفۆر وکلۆر و صۆدیۆم و پۆتاسیۆم و مەگنیسیۆم و کالیسیۆم ئاسنی تێدایە ( کەڵە فەرهەنگ ل ٣٢٢ )

ئایا گێزەرو ناوکەکولەکە ئەم توخمانەیان لەکوێوە هێنان ؟ بە ئارەزووی خۆیان کۆیانکردنەوە ؟ یان بەڕێکەوت بوو ؟ یان بەفەرمانێکی باڵابوو ؟

**بەرو گەلاَی داری گێوژ بۆچارەسەری زۆر لەنەخۆشیەکان بەکاردێت وەکو :**
**((فشـــاری خـــوێن ، ســـینگەکوژی ، ڕەق بوونـــەوەی بۆڕیـــەکانی خـــوێن، و ڕێکخســـتنی لێدانـــەکانی دڵ ، وە بۆچارەســـەری بەرزبوونـــەوەی کۆڵســـترۆڵ لەخوێندا ))** ( زانکۆ ل ٢٨٦ ).
**ئایا ئەم داری گێوژە ئەم هەموو دەرمانانەی لەکوێوە کۆکردنەوە؟ ئایا لە زەویدا بەشێوەی دەرمان هەن یان بەچەندین قۆناغدا بوون بەودەرمانانە ؟**
**( بنەڕێواس و سیرو پیوازو گوژاڵك بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی شەکرە بەکار دەهێندرێن).** ( زانکۆ ل ٢٩٢ ).
**ئایا ئەم ڕێواسی بنبەردی بەتام ومزرە لەگەڵ ئەم سیرو پیوازە تیژە لەگەڵ ئەم گوژاڵکە تاڵە ، ئەم دەرمانانەیان لەکوێوە کۆکردەوەو بەفەرمانی کێ بوو؟**
**( کەلـەرم ( لهانـە ) = ملفـوف = کرنـب cabbage ٨٥ ٪ ی ئـاوە و ٧. ٥ ٪ کاربوهیدرات و ٥ ٪ ی چەوری و ٣ .٨ ٪ پرۆتین و ٠ .٥ ٪ خوێی کانزایی و بڕێکی زۆر فیتامین c و k و کالیسیۆم و گۆگرد و ئاسن و فۆسفۆری تێدایە ، بـۆ نمونـە بڕێکـی زۆر گـۆگردی تێدایـە کەبۆتـە هـۆی ئـەوەی بـۆنێکی تایبـەتی لێبێت کەزۆر لەخەڵکی حەز لەبۆنەکەی ناکەن )** (کەڵە فەرهەنگ ل ٢٥٩ )
**ئینجـا سـەرەڕای ئـەم هـەموو هـەوڵ و تێکۆشـان و شـانازی بەخۆکردنـەی ئادەمیزاد بەخۆی و زانستەکانی، پەروەردگار ڕووی تێدەکات و پێیدەڵێت :**

وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾ سُورَةُ الإِسۡرَاء

**وە لەزانست کەمێك نەبێت بەئێوە نەدراوە**
**واتـە پـەروەردگار کـەمێکی لەزانسـتەکانی خـۆی بەئێمـە بەخشـیوە و بۆیـە ئێمـە بواری بیرکردنەوەو داهێنانەکانمان لەسنوری ئەم برە زانستیە دەرناچێت.**
**( لـەو توخمانـەی کەهـەن لـە بوونـەوەردا تـەنها ( ٩ ) دانـەیان بەیەکگرتنـە جیـا جیاکانیـان ٩٩ ٪ ی پیکهاتـەی هـەزاران بـەرد پێکـدەهێنن کەئـەوانیش تـوێکڵی**

زەویان پێکهێناوە ، گرنگترینی ئەو توخم و کانزایانەی کەبەشداری دەکەن لە پێکهاتە بەردینەکانی گۆی زەوی ئەمانەن

ئۆکسجین ٤٧ ٪ ی کۆی کێشی توێکڵی زەوی پێکدەهێنێت ، چونکە بەشداری دەکات لەپێکهاتەی زۆربەی کانزاکاندا

سلیکۆن ٢٨ ٪ ی کۆی کێشی توێکڵی زەوی پێکدەهێنێت ، وە کەرەسەیەکی خاوە لەگەڵ ئۆکسجین یەکیگرتووە

ئەلەمنیۆم ٨ ٪ ی کۆی کێشی توێکڵی زەوی پێکدەهێنێت ، وە بەیەکگرتوویی دەبیندرێت لەگەڵ ئۆکسجین لەپێکهاتەی زۆر لەکانزاکان

ئاسن ٦ ٪ ی کۆی کێشی توێکڵی زەوی پێکدەهێنێت

کالیسیۆم ٤ ٪ ی کۆی کێشی توێکڵی زەوی پێکدەهێنێت

صۆدیۆم ٢ ٪ ی کۆی کێشی توێکڵی زەوی پێکدەهێنێت

پۆتاسیۆم :٢ ٪ ی کۆی کێشی توێکڵی زەوی پێکدەهێنێت .بەلاّم کلۆر و کاربۆن و کبریت بەرێژەیەکی کەمتر هەن ) . ( الجغرافیا العامە ص ٣٥ )

گازی ئۆکسجین لەدەورەی زەوی لەچینەنزمەکانی هەوادا بەرێژەی ( ٢١٪ ) هەیە، گازێکە یارمەتی سوتان دەدات و بۆهەناسەدانی زیندەوەران بەکاردێت بۆیە پەروەردگار کێشێکی وەهای پێبەخشیوە لەچینەکانی ژێرەوەی هەوا دابێت و دەوری گۆی زەوی بدات ، بەتواوەیش لەناو ئاودا هەیە بۆهەناسەدانی گیانەوەرە ئاویەکان ( کیمیای دووەمی ناوەندی ل ٧٦ )

ئەگەر ئۆکسجین کەمێك لەکێشەکەی یان ڕەوشتێکی خۆی بزربکات ئەوا بەرەو چینەکانی سەرەوەی هەوا سەردەکەوێت و گۆی زەوی بەجێدێڵێت و ئەوسا هەناسەدان نامێنێت و کەسیش ناتوانێت لەماڵەکەی خۆیدا ئاگرێك بکاتەوە

مرۆڤ و زیندەوەرەکان بۆهەناسەدان گازی ئۆکسجین بەکاردێنن و لەناو سیەکاندا یان لەناو کۆئەندامی هەناسەداندا کارلێکی کیمیائی دەکات و لەئەنجامدا گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دروست دەبێت کەگازێکی

ژەهراویـەو لـە ئۆکسـجین قورسـترەو ئەگـەر بێـت و ڕێژەکـەی لـەزیادبوون دابێـت مەترسیەکی گەورە دەکەوێتە سەر ژیانی زیندەوەران
بەلآم پەروەردگار بۆچارەسەری ئەم کێشە پڕمەترسیدارە زانیاری داوە بەئێمەی مرۆڤ کە لەتاقیگەکاندا گازی ئۆکسجین دروستبکەین و لەنەخۆشخانەکاندا بۆ فریاگوزاری نەخۆشەکان بەکاری بهێنین یان لەبواری پیشەسازیدا وەکو هێزێك کەیارمـەتی سـووتان دەدات ، بۆبڕینـەوە و بەیەکـەوە لکـان بـەکاری بهێـنین ، هـەروەها زانیـاری ئـەوەی بەئێمـەداوە کاتێك بۆجوانکـاری کۆگـا و ماڵـەکانمان لەشوشـەبەندێکی بـەخێوکردنی ماسـی دا ئامرازێـك لـەناو ئاوەکـەدا دابنـێین بۆگواسـتنەوەی هـەوای دەرەوە و تێپـەڕکردنی بـەناو ئاوەکـەدا کەلەئەنجامـدا بەشێك لەئۆکسـجینی نـاو هەواکـە لـەناو ئاوەکەدا دەتوێتـەوە و ماسـیەکان بـۆ هەناسەدان بەکاری دەهێنن
بەهــەمان شـێوە پــەروەردگار زانسـتی داوە بەهــەموو ڕووەك وســەوزاییەکان لەکاتێکدا کەتیشکی خۆر بەدەرەوەیە گازی ئۆکسجین هەڵبمـژن و لەئـەنجامی کـارلێکی کیمیائیـدا خـواردن بۆڕووەکەکان دروسـت دەبێـت ودووەم ئۆکسـیدی کاربۆن فڕێدەدرێتە دەرەوە ، بەلآم کاتێـك کەتیشـکی خـۆر نـەماو بـوو بەتاریکی ئـەم ڕووەکانـە زانیـاری ئـەوەیان دراوەتـیٚ کـەکرداری هەناسـەدانەکە پێچـەوانە بکەنەوەو گـازی دووەم ئۆکسـیدی کـاربۆن هەڵبمـژن و گـازی ئۆکسجین بدەنـەوە بـەم شـێوەیە ئـەم دووەم ئۆکسـیدی کاربۆنـەی کەڕێژەکـەی زیـادی کـردووە لەئەنجامی هەناسەدانی زیندەوەرەکانەوە لەڕێگەی هەناسـەدانی شەوانەی دارو درەختەوە چارەسەری بۆداندراوە بەمەش ڕێژەکەی بەنەگۆڕی دەمێنێتەوە
کاتێك (٣ ) سیٚ ئۆکسجین یەکتردەگرن شێوەیەکی تری ئۆکسجین نیشـان دەدەن کـە پێیــدەگوترێت گــازی ئـۆزۆن کەبــەهۆی کاریگــەری تیشــکی ســەروی بنەوشـەییەوە پەیـدادەبێت و لەچـینە بـەرزەکانی هــەوادا لەبـەرزایی ٢٥ کـم بــەرزترین چــڕی هەیــەو وادادەنــدرێت پیکهــاتنی ئـۆزۆن بــەم شــێوەیە لــەو

هۆکارانەیە کەلەچینە بەرزەکانی هەوادا بەبەردەوامی لەسەنگەردایەو ئامادەیە بۆ پاراستنی ڕووی زەوی لەزیاد بەرکەوتنی تیشکی سەروی بنەوشەیی وەپێکهاتەی گەردیلەی ئۆزۆن بەم شێوەیەیە:-



گۆشەی هاوبەند لە نێوان ئۆکسجینێك و دوو ئۆکسجینەکەی تردا = $116^\circ\ 44' \pm 30'$

الکیمیاء اللاعضویة ل (٢٩٨)



لە کاتێکدا لە ئۆکسیدی جیوەدا ، گۆشەی هاوبەندی نێوان ئۆکسجینێك و دووجیوەکە = $109^\circ$ لە هەمان کات دا گۆشەی هاوبەندینێوان جیوەیەك و دوو ئۆکسجینەکە = $179^\circ$

الکیمیاء اللاعضویة ل٢٧٦



لە هەمان کات دا لە فلۆریدی هیدرۆجین گۆشەی هاوبەندی نێوان فلۆرەکە و دوو ئۆکسجینەکە = $140^\circ$

الکیمیاء اللاعضویة ل١٠٨

خوێنەری بەڕێز سەیری ئەم ووردە کارییە، هەموو یەکگرتنێك گۆشەی تایبەتی خۆی هەیە ، ئایا هەموو ئەم نهێنیانە بەڕێکەوت دروست بوون ؟ یان دەبێت هیزێکی بالآ خاوەنی ئەم هەموو ووردەکاریەبێت ؟بەم شێوەیە لەیەکگرتنی توخمێك لەگەڵ توخمێکی تردا پێکهاتەیەکی نوێ پەیدا دەبێت کەڕەوشت و تایبەتمەندییەتی خۆی هەیە

کاربۆن کەتوخمێکی بنەڕەتیە لەپێکهاتەو پێداویستیەکانی زیندەوەران بەهۆی شێوەی یەکگرتن و کاریگەری پلەی گەرمی و پەستان ، پێکهاتەی تازەی کاربۆن پەیدادەبن ، لەوانە گرافت کەپێکهاتەیەکی فشەڵی بێ هێزە وبەئاسانی تێکدەشکێندرێت و چڕیەکەی ( ٢٢، ٢ ٪ غم / سم ٣ )یە وە لەئەنجامی

ســووتاندنی تەنــە زیندووەکانــدا ئەوخــەڵوزەی پەیــدا دەبێــت یەکــەی ووردی گــرافیتن دەتوانــدرێت گرافیــت بکرێــت بــە ئــەڵماس لــە پلــەی گــەرمی( ١٦٠٠)
پلەی سەدی و پەستانێك لەنێوان (٥٠٠٠٠ - ٦٠,٠٠٠ ) کەژ
ئەڵماس پێکهاتەیەکی کاربۆنی بەهێزەو بێرەنگەوچڕیەکەی (٣,٥١غم/سم٣) یە، وە لەپلەی (٣٦٠٠ ) پلەی سەدی دەتوێتەوە .( الكيمياء اللاعضوية ل ٢٢٨- ٢٢٩).
هــەر هــەمان کــاربۆن بەشــداری دەکــات لەپێکهاتــە خۆراکیەکانــدا بــەهۆی بــوونی هۆی یاریدەدەرەوە
ئــەو ئــاوەی کەڕووەکــەکان هەڵیدەمــژن و ئــەو دووەم ئۆکســیدی کاربۆنــەی کــە هەناســەی پێــدەدەن دەگــۆڕدرێن بۆپێکهاتــەی شــەکری بــەهۆی بــوونی تــوخمی مەگنیســیۆم لــە پێکهاتــەی (کلۆرۆفیــل ) ی ســەوزی گەڵاکانــدا کــەووزەی خــۆر دەمــژێت و دەبێتــە هــۆی گــۆڕانی ئــەو ئــاوو دووەم ئۆکســیدی کاربۆنــە بــۆ خۆراکێکی شەکری بۆ بەردەوام بوونی ژیانی دارودرەختەکان
ئەگــەر مەگنیســیۆم نەبوایــە (کلۆرۆفیــل )ی ســەوزایی دارودرەختــەکان نــەدەبوو ئەگەر سەوزایی دارودرەختەکانیش نەبوایە ووزەی خۆر نەدەمژرا و خۆراك بۆ دارودرەختــەکان دروســت نــەدەبوو، واتــە هــەموویان لەبرســان دەمــردن و ووشــك دەبوونەوە ، ئەگەر دارودرەخت و سەوزایش نەبوایە بژێوی ژیــانی گیانــدارەکان نەدەبوو، لە هــەمان کاتیشــدا هەناســەی شــەوانەی دارودرەختــەکان نــەدەبوو بــۆ گۆڕینەوەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بۆ ئۆکسجین و هەناسە نەدەماو کۆتــایی بەژیان دەهات
کەواتە ئەگەرمەگنیسیوم نەبوایە ژیان لەسەر زەوی نەدەبوو
( الكيمياء اللاعضوية ل ١٥٠ )
زۆرینــەی مرۆڤــەکانی ســەر گــۆی زەویــش تــا ئێســتا مەگنیســیوم ناناســن و ئاشنایەتیان لەگەڵیدا نیە کەبەشداری ژیانیان دەکات

ئەو خاوەن دەسەڵاتەی مەگنیسیۆم و هەموو توخمەکانی تری درووستکردون زۆر ووردەکارانە ، هەر توخمەی ڕێژەو کێش و چڕی و پلەی گەرمی و پلەی تواندنەوەو ئەرکەکانی بۆ دیاریکردوون بۆ نموونە :-

ڕێژەی ئەم توخمانەی خوارەوە لەچاو زەویدا بەم شێوەیەیە :-

| | |
|---|---|
| کالیسیۆم | ٣,٤ کگم/تەن |
| مەگنیسیۆم | ١ کگم/تەن |
| بریلیۆم | ١٠ گم/تەن |
| ڕادیوم | ١ ملگم/تەن |

ئاوی دەریا (٠,١٣ ٪) مەگنیسیۆمی تێدایەو سەرچاوەیەکی بنەڕەتیە بۆ ئەوتوخمە ( الكيمياء اللاعضوية ل ١٥٠ ل ١٥١ )

پلەی کولاّن و تواندنەوە و ڕەنگی ئەم توخمانەی خوارەوە بەم شێوەیەیە :-

| توخم | $F_2$ | $Cl_2$ | $Br_2$ | $I_2$ |
|---|---|---|---|---|
| ڕەنگ | گازێکی زەردی کاڵە | گازێکی سەوزە | شلەیەکی کایی سور هەڵاتووە | ڕەقی بنەوشەییە |
| پلەی کولاّن C | ٢٨٨- | ١٠١- | ٧- | ١١٣ |
| پلەی توانەوە C | ١٨٨- | ٣٥ - | ٥٩ | ١٨٣ |

( الكيمياء اللاعضوية ل ٣٢٥ )

ئینجا توخمەکان ئەگەر بەزانایی و بەژیری بەکارنەهێنرێن ئەوا کارەساتی گەورەیان لێدەکەوێتەوەو چەندین پێکهاتەی تیشکدەر و سوتێنەرو ژەهراویان لێپێکدێت ، وەکو گازی سیانۆجین کەگازێکی بێڕەنگە و لەگەڵ گازە کوشندەکانی وەکو خەردەل هەرەشە لەژینگەو زیندەوەران دەکەن

( الكيمياء اللاعضوية ل ٢٣٩)

ظَهَرَ ٱلۡفَسَادُ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ بِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِي ٱلنَّاسِ ﴿٤١﴾ سُورَةُ الرُّومِ

خراپەکاری بەدەرکەوت لەووشکایی و دەریادا بەهۆی ئەوشتە خراپانەی کە دەستی خەڵکی کەوتون

(لەئەنجامی دورکەوتنەوەویاخی بوونیان لەفەرمانەکانی خوا ، و تێکچوون و خراپ بوونی باری ژیان لەسەر ووشکایی و ناودەریاکاندا )

خوێی چێشت لە بوارە زانستیەکاندا بە ( Nacl ) دەناسرێت بەشێوەی کلۆریدی سۆدیۆم لەخاکدا هەیەو بەهۆی لێك هەڵوەشانەوەی کارەبایی لێك هەڵدەوەشێت و کلۆرو سۆدیۆم پەیدادەبن

$$2Nacl \xrightarrow{\text{لێك هەڵوەشاندنەوەی کارەبایی}} 2Na + cl_2$$

هیدرۆکسیدی سۆدیۆم لەپیشەسازیەکانی سابوون و کاغەزو نەوت وچنیندا بەکاردەهێندرێن ، وەخوێ یەکانی پۆتاسیۆم وەکو زبڵی کییمیائی و پێك هاتەکانی لیثیوم لەپیشەسازی شوشەدا بەکاردەهێندرێن

( الكيمياء اللاعضوية ل ١٤٩ )

کەواتە لەڕێی زانستەکانی کیمیاوە دەتوانرێت پێکهاتەی ئەندامەکانی لەشی خۆت یەکەیەکە دیاری بکەیت لەئێسقان و گۆشت و دڵ و جگەر و گورچیلە و میزڵدان و ماسولکە و مێشك و هێلکە و تۆو کە پێکهاتەکانیان لەو توخمانەن کە لەسروشتدا هەن ، نەنگییە بۆ ئادەمیزاد تەنها ناوی خۆی و دایك و باوك و باپیرانی و خێزان و گەل و نەتەوەکەی بزانێت و زانیاری نەبێت لەسەر چۆنیەتی پێکهاتنی خانەو شانەو ئەندامەکانی لەشی خۆی و نەزانێت ئەو کەرەسە خاوانە چین کەلاشەکەی پێکدێنن

چاوەکانی ئادەمیزاد لەپێکهاتەیەکی چەوری دروستکردون بۆیە دروستکەرەکەی لەپێناوی مانەوەو بەردەوام بوونیاندا لەناو گۆمێکی خوێدا دەیانپارێزێت هەتا کاتی دیاریکراو بۆئەوەی نەتوێنەوەو بۆگەن نەکەن

پاپا یوحنا دەڵێت :-لەبەر نەخۆشی توێژینەوەی زۆریان لەسەر کردم ، لە ئەنجامی ئەم توێژینەوانەدا شارەزایم لەناسینی هەندێك ئەندامانی لەشدا پەیدا کردووە کەپێشتر هەر نەمدەناسین

( بەرنامەکانی کەناڵی ئاسمانی (LBC) ٤ / ٤ / ٢٠٠٥)

ئینجا ئەم خاوەن دەسەلاتە کە ئەم بوونەوەرەی بەتەواوی و بەبێ کەموکوڕی دروستکردو زەوی ڕاخست

ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا ﴿٢٢﴾ سُورَةُ البَقَرَة

ئەو خوایەی بۆ ئێوە زەوی وەکو ڕاخراوێك لێکردووە

شتێك کەڕادەخرێت بۆمەبەستی فراوان کردن و تیادا هەڵسوڕانە ، کەواتە پەروەردگار زەوی ڕاخست بۆئەوەی ژیان لەسەری دەست پێبکات زەوی ئامادەکراو بەدەسەلاتی پەروەردگار لەخاك و خۆڵەکەی ئەندازەیەکی دیاریکراو وەرگیراو کرا بەقوڕ .

هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ سُورَةُ الإِنسَان

ئایا سەردەمێك لەم بوونەوەرەدا بەسەر ئادەمیزادا هاتووە کە شتێکی وا نەبووە باسبکرێت واتە بەڵێ سەردەمێك لەم بوونەوەرەدا ئادەمیزاد شتێك نەبووە کەناوی بهێندرێت و باسی لێوەبکرێت

کەواتە گومان نامێنێ کەپێش ئادەمیزاد شتی تر هەبووە

وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ سُورَةُ المُؤْمِنُون

وەبەدڵنیاییەوە ئادەمیزادمان لەدابێژراو و لەپاك کراوەیەك لەقوڕ دروستکردووە

قال رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم

(إِنَّ الله تعالى خَلَقَ آدَمَ مِنْ قُبْضَةٍ قَبَضَهَا مِنْ جميعِ الأَرْضِ، فَجَاءَ بَنُو آدَمَ عَلَى قَدْرِ الأَرْضِ ، فَجَاءَ مِنْهُمْ الأَحْمَرُ وَالأَبْيَضُ وَالأَسْوَدُ وبين ذَلِكَ وَالسَّهْلُ وَالْحزنُ وَالْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ) .

جامع الترمذي ٣٨ ، ٣ الحديث الشريف

پێغەمبەر(سلاوی خوای لێ بێت) فەرمووی (خوای گەورە ئادەمی دروستکرد لە هەندێکی وەرگیراو لەهەموو پێکهاتەی زەوی، ئینجا ئادەمیزادەکان لەو

ئەندازەیــەوە هاتنــە کایــەوە ، لەوانــدا ســور وســپی ورەش ولــەنێوانی ئــەم ڕەنگانەداو کەسانی ئاسان وخەمبار و پیس و چاك هاتنەکایەوە

إِنَّا خَلَقْنَاهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍ ﴿١١﴾ سُورَةُ الصَّافَّاتِ

ئێمە ئەوانمان دروستکردوە لەقوڕێکی لینج

لەو قوڕە لینجە بەوشێوەیەی کەخۆی وویستویەتی ئادەمی دروستکرد

لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ ﴿٤﴾ سُورَةُ التِّينِ

بە دڵنیاییەوە ئادەمیزادمان بەباشترین شێوە دروستکردووە

لاشەی ئادەمیزاد لەملیۆنەها خانە و سەدان دەزگا بۆبینین و بیستن و ڕۆیشتن و بیرکردنــەوە و هەســتکردن و یادکردنــەوە و جــووت بــوون و خــواردن و خواردنەوەو چاککردنەوەی لاشە و بۆنکردن و چەندین کارگەی تایبەتی بۆ دروستکردنی هێلکە و تۆو وشیرو منداڵ و فرمێسك وئارەقە وخوێن وپلازماو .......هتد کە هەریەکێك لەم کارگانە جێگەی سەرسوڕمانی مرۆڤن

بوونی چەندین گلاندی جیاجیا لەشوێنە جیاکانی لەشی مرۆڤدا ئەوڕاستیە دەسەلمێنن کەدروستکردنی لاشەی مرۆڤ لەباشترین شێوەدایە ، گلاندی زراو کە بەسەر جگەرەوەیە یارمەتی هەرسکردن دەدات و گلاندی پەنکریاس ڕێژەی شەکر لەناو خوێندا ڕادەگرێت و ملەقۆرتە گلاند لێدانەکانی دڵ ڕیکدەخات و گلاندی لیك لەناو دەمدا ئاسنکاری دەکات بۆ شلکردنەوەی خواردنەکان لەناو دەمداو لەڕێگەی توێژینەوە لەسەر ئەم لیکە دەتوانرێت سەرەتاکانی سك پڕبوونی ئافرەت بزانرێت و لیکە ڕژێنەکان لیك دەردەدەن ئەویش شلەیەکی خەستە ئەنزایمی ( تایلینی ) تێدایە کە نیشاستە لەدەمدا هەرس دەکات و دەیگۆڕێت بۆ ماددەی جووتە شەکر .

ئینجا پەروەردگار ئەوەمان پێڕادەگەیەنێت کە بەدەستەکانی خۆی ئادەمی لە قوڕ دروستکرد

قَالَ يَا إِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَيَّ ﴿٧٥﴾ سُورَةُ صٓ

خـوا فـەرمووی ئـەی ئیبلـیس چـی بـوو نەیهێشـت کـەکڕنوش بـەری بـۆ ئەودروستکراوەی کەمن بەدەستەکانی خۆم دروستمکرد

کەواتـە لێرەدا بیرۆچکەی هێڵـی پەرەسـەندن ڕەددەکرێتـەوە چـونکە بەئاشـکرا دروست کەرەکە دەڵێت ئێمە ئادەمیزادمان لەقوڕێکی لینج و لەباشترین شێوەدا دروسـتکردووە ، کەواتـە لینجـی قورەکـەو باشـترینی شـێوەکەی تایبەتمەنـدن بـەئادەمیزادەوە ، دروستکردنەکەشـی لەلایـەن وەسـتاکەیەوە بـووە کـە بەدەستەکانی خۆی دروستیکردووە

هـەموو گـۆڕانێکیش گواسـتنەوەیە لەدژێکـەوە بۆدژێکی تـر لـەنێوان هـەردووك لایەکـەدا بـەدوو ئاڕاسـتەی پێچـەوانە بەیارمـەتی هۆیـەکی یاریـدەدەر( کـە دەسەڵاتی دروستکەرەکەیەتی ) لەکاتێکی دیاریکراودا

مردن دژی ژیانە کەواتە گۆڕینی ژیان بۆمردن گواستنەوەیە لەژیانەوە بۆمردن ، لەگـەڵ بـوونی هۆیـەکی یاریـدەدەر کەوویسـتی دروسـتکەرەکەیەتی لـەکاتێکی دیاریکراودا

بە پێچەوانەشەوە ژیان دژی مردنە واتە گۆڕینی مردن بۆژیان گواستنەوەیە لە مردنـەوە بـۆ ژیـان ، لەگـەڵ بـوونی هۆیـەکی یاریـدەدەر کەوویسـتی دروسـت کەرەکەیەتی وە لەبەر ئەوەی ژیان و زیندوبوونەوە دژ بەیەکتری نین بۆیە هیچ گواستنەوەو گۆڕانکارییەك ڕوونادات لەنێوانیان

مِنْهَا خَلَقْنَـٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾ سُورَةُ طه

لـەو خاکـە دروسـتمانکردون و بۆنـاو ئـەم خاکـە دەتانگێڕینـەوەو لـەم خاکـەوە جارێکی تر دەرتان دەهێنینەوە

قَالَ رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم

(كُلُّ ابْنِ آدَمَ يَأْكُلُهُ التُّرَابُ إِلاَّ عَجْبَ الذَّنَبِ. مِنْهُ خُلِقَ وَفِيهِ يُرَكَّبُ).

الحديث صحيح مسلم ٧٣٥٩ الحديث الشريف

پێغەمبەر(سلاوی خوای لێ بێت) فەرمووی :هەموو جەستەی ئادەمیزاد گڵ دەیخوات تەنها کلێنچەی نەبێت لەو دروستکراوەو لەویش پێکدەهێنرێتەوە.
کەواتە گڵ و جەستەی زیندەوەران دژی یەکترین لەکاتی بوونی هۆیەکی یاریدەدەر کەوویستی دروستکەرەکەیەتی کەئەو وویستەش مراندنە
کەواتە گۆڕینی قوڕ بۆپێکهاتەکانی جەستەی ئادەمیزاد گواستنەوەیە لە کەرەسەی خاوەوە بۆ شێوە دروستکراوەکە بەپێی وویستی دروستکەرەکەی
وە بە ئاڕاستەی پێچەوانەشەوە گۆڕینی جەستەی ئادەمیزاد بۆقوڕ یان گڵ گواستنەوەیە لەدروستکراوەکەوە بۆ کەرەسە خاوەکەی بەپێی وویستی دروستکەرەکەی.کەواتە دروستکردنی ئادەمیزاد پەرەسەندن نیە. وە لەو ڕۆژەشەوە کە ئادەم دروستکراوە هەتائێستاش نەوەکانی ئادەم هەروەکو باوکە گەوەرەیان تەنهاخاوەنی دوودەست و دووقاچ و دووچاوو دووگوێن .....نەبووە ئادەمیزادێك کلکی لێڕوابێت و بووبێت بەحوشتر یان پەڕوباڵی لێڕوابێت و بوبێت بەکۆتر.مەگەر بەهێزو تواناو دەسەلاتێکی فراوانی دروستکەرەکەی
وە بۆڕاستی ئەم باسە پەنا بۆبەر ئەم ڕووداوە مێژووییە دەبەین

وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْا۟ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ
فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ

وە بەدڵنیاییەوە زانیتان ئەوانەی لەئێوە دەست درێژیان کرد لەڕۆژی شەممەدا وە ئێمە پێمان ووتن ببن بەمەیمونی ڕیسوا

فَلَمَّا عَتَوْا۟ عَن مَّا نُهُوا۟ عَنْهُ قُلْنَا لَهُمْ كُونُوا۟ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿١٦٦﴾ سُورَةُ الأَعْرَافِ

جاکە گوێیان نەدا بەوەی لێیان قەدەغە کرا پێمانگوتن ببن بەمەیمونی ڕیسوا

مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ
أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٦٠﴾ سُورَةُ المَائِدَةِ

کەسێك خوا نەفرینی لێکردبێ و ڕقی لێداگرتبێ لەوانە کردوونی بەمەیمون و بەراز و زۆردار پەرستی، ئەوانە خراپترین پلەوپایەیان هەیە، وەلایانداوە لەچەقی ڕێگا

کەواتە ئەوەشیان پەرەسەندن نیە، لەبەر ئەوەی لەچاکەوە ڕۆیشتووە بەرەو خراپ، پەرەسەندنیش بەپێچەوانەوە دەبێت هەمان جۆر بەرەوباشتر بڕوات.

بەهەمان شێوە کەرەسەخاوەکانی پێکهاتەی جەستەی سەگ تایبەتمەندە بەو گیانەوەرەوە کەبەوەفاداری ناسراوەو هەروەهاپێکهاتەکانی جەستەی ڕێوی تایبەتمەندە بەوگیانەوەرەی کە بەفێڵباز ناسراوە لەبەشەکانی داهاتوودا زیاتر ئەوە ڕوون دەکەینەوە کەزانستە بۆماوەیەکان بەهیچ شێوەیەك بەبێ فەرمانێکی بالا لەسەرووی دەسەلاتی مرۆڤەوە ڕێگە بەوەنادەن مەیمونێك بکرێت بەمرۆڤ هەرچەندە پێکهاتەی گەردی ناوکە ترشی ( DNA ) لە مرۆڤ ومەیمونـدا لەیەك نزیکن شوێنەوارو دەروبەریش کاریگەری خۆیان هەیە بەلام ئەم کاریگەریەش نەبۆتە هۆی گۆڕینی ڕەگەزی مرۆڤ ، بۆ نموونە خەڵکی ڕۆژهەلاتی ئاسیا پێست زەرد و بالاکورت و چاو بچووکن خەڵکی ئەورووپا پرچ زەرد و چاو شین و پێست سپین و بالابەرزن بەهۆی ساردی ناوچەکەیان و کزی تیشکی خۆر لەسەریان خەڵکی ئەفەریقا هەموویان ڕەشن و پرچ لولن و بالا بەرزن بەهۆی گەرمی ناوچەکەیان و بەهێزی تیشکی خۆر لەسەریان خەڵکی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بالا کورت و مام ناوەندین چاو تۆخ وموو ڕەش و ڕەنگ گەنمین بەهۆی مام ناوەندی ئاووهەوا و تیشکی خۆر لەسەریان خەڵکی ئەمریکا بالا بەرزو چاوکاڵ و پرچ کاڵن پێست سپی و پێست ڕەش و پێست سورن لەبەر ئەوەی کۆمەڵگایەکی تێکەڵن .بەلام هەمووشیان هەر ئادەمیزادن و جیاوازی نیە لەنێوانیاندا

دوای ئەوەی کەئادەمیزاد لەبوارە زانستیەکاندا هەنگاوی زۆر گەورەی نا، گەیشتە ئاشکراکردنی ئەو نهێنیانەی کەپێشتر هەندێك لەزاناکان بەمەزندەی

**بیری خۆیان سەپاندبوویان بەسەر مرۆڤایەتیدا بۆنموونە : کە پێشتر خانە هەرئەوەندە ناسرابوو کەناوەڕۆکەکەی پێکهاتەیەکە جەڵی ( هیلامی ) یە بەڵام (مایکل دانتون مامۆستای زانستی زیندەوەرزانی) بەم شێوەیە ڕاستیەکان دەخاتە ڕوو ( بۆئەوەی ڕاستی ژیان تێبگەین بەم شێوەیەی کەزانستە ووردەکانی زیندەوەرزانی ئاشکرای کردووە، پێویستە لەسەر ئێمە کە خانەیەك هەزار ملیۆن جار گەورەبکەین، جا بەم کارە خانەیەك وەکو باڵۆنێکی زەبەلاح دەردەکەوێت کەدەتوانێت شارێکی گەورەی وەکو نیۆیۆرك یان لەندەن داپۆشێت ئەگەر بۆمان گونجا لەوخانەیە نزیك ببینەوەوتوێژینەوەی لەسەر بکەین ، دەبینین کەچەند ملیۆن دەرگای بچوکی تێدایە ، هەر یەکێك لەو دەرگایانە خاڵی پشکنینی زۆر توندوتیژن ، ئەوەی ڕێگەی پێنەدرێت ناتوانێت لەیەکێك لەودەرگایانەوە بچێتە ژوورەوە وە ئەگەر توانیمان لەیەکێك لەم دەرگایانەوە بچینە ژوورەوە خۆمان دەبینینەوە لەجیهانێکی تەکنۆلۆجیای سەرسوڕهێنەری یەجگار ئاڵۆزداین )**

( MICHAEL DENTON \ A Theory incrisis p. 242 )

**هەروەها(مایکل باهی پرۆفیسۆر و مامۆستا لە کیمای زیندەوەریدا) لەباسی چاودا بەم شێوە نووسیویەتی : ﴿ بەهیچ شێوازێکی ئاخافتن دەربارەی پەرەسەندن ئامێرایەتی بینین و شیکردنەوەی بنەماکانی پێکهاتەی بەشەکانی چاو لێکنادرێتەوە بۆیە داروین بێ توانا بوو لە پێش کەش کردنی شیکردنەوەیەك دەربارەی چاو . وە ئەو شیکردنەوانەی کە داروینیەکان کردیانن یەجگار نەزۆك بوون لەم بارەیەوە بەشێوەیەك ئەم شیکردنەوانە ناتوانن ئەم کردارەی کە لەناوچاودا ڕوودەدەن شیانبکەنەوە کەیەجگار ئاڵۆزن بەئەندازەیەك** ( لەبەر ووردی و بەهێزی کارەکان ) **باوەڕ ناکرێت** ( بەوەی ئەم هەموو کارانە لە چاودا ڕوودەدەن ) **و زۆریش گرانە نووسینەوەی لەسەر کاغەز )**

( MICHAEL J. BEHE \ Dawin s' Black Box, p.22 )

لە کاتێکدا کە تۆ سەرقاڵی کارێکی و ڕوداوێکی لەپڕ لەسەر جەستەکەت ڕوودەدات وەکو پێوەدانی مێشە هەنگوینێك بەشوێنێکی لەشتەوە ، یەکسەر دەزگا چاودێریکەروجاسوسیەکانی ناو ئەوخانانەی کەمێشەکە پێوەی داون هەواڵەکە دەگەیەنن بە بەڕێوەبەرایەتیەکەیان لەیەکێك لەگەڕەکەکانی مێشکی ئەوکەسەدا ، لەوێشەوە زۆر بەپەلەو بێدواکەوتن دیوانی کۆماری بوونی ئەم مرۆڤە ئاگادار دەکرێتەوەو کۆمەڵێك بڕیاری بەپەلە دەردەچن بەم شێوەیەی خوارەوە

لە دیوانی کۆماری جەستەی مرۆڤەوە

١- بۆ دەزگای مل تکایە بەزوترین کات و بەبێ دواکەوتن بە گۆشەی (؟) ئاسۆیی دیاریکراو ئاڕاستەی خۆت بجوڵێنە بەرەو ڕووی شوێنی ڕووداوەکە

٢- بۆ دەزگای سەر ، تکایە بەزوترین کات و بەبێ دواکەوتن بە گۆشەی (؟) ستونی دیاریکراو ئاڕاستەی خۆت بجوڵێنە بەرەو ڕووی شوێنی ڕووداوەکە.

٣- بۆ دەزگای چاو، تکایە بەزووترین کات و بەبێ دواکەوتن بە گۆشەی (؟) ستونی و گۆشەی (؟)ئاسۆیی دیاریکراو ئاڕاستەی خۆتان بجوولێنن و چاوێك بەڕووداوەکەدا بخشێنن وە بەزووترین کات ئاگادارمان بکەنەوە وبەردەوام بن لەناردنی پێش هاتەکاندا

٤- بۆ گوێکان و دەزگای بیستن و ڕادارەکان و پێگە هەستیارەکان تکایە لە ئامادەباشی دابن

٥- بۆ وەزارەتی سوپای جەستە ، تکایە بەزووترین کات کاری پێویست بکەن بۆ چارەسەری ڕووداوەکە

وەزارەتی سوپاش دەکەوێتەکارو ئەم فەرمانانە دەردەکات :

ا – بۆ هێزی دەستەکان ، بە گۆشەی ( ؟ ) دیاریکراو بەرەو شوێنی ڕووداوەکە بڕۆن
ب– بۆ پەنجەکانی دەست لەوپەڕی ئامادەباشیدابن کاتێك گەیشتنە دوژمن پەلاماری بدەن و ڕیشەکێشی بکەن و بەزەییتان پێدانەیەتەوە
ج– بۆ هێزەکانی دەم وزمان وددان ، ئەگەر ڕووداوەکە پێویستی بەگەزتن ومژین هەبوو ڕۆڵی خۆتان ببین
د– بۆ هێزە تایبەتیەکانی خڕۆکەی سپی تکایە لەئامادەباشی دابن
جا کەهەموو ئەم بڕیارانە جێبەجێ کران ئەوسا دیوانی کۆماری بڕیارێکی تر دەردەکات
٦– لە دیوانی کۆماریەوە بۆ وەزارەتی تەندرووستی جەستە ، تکایەو بەبێدواکەوتن کاری پێویست بکەن بۆ چاککردنەوەی شوێنە برینداره‌کە
وەزارەتی تەندروستیش کۆمەڵێك بڕیارو ڕێ نیشاندان ڕادەگەیەنێت
ا– بۆ هەموو نەخۆشخانەو بنکە تەندروستیەکانی ئەم ناوچەیەی کە ڕووداوەکەی تێدا ڕووداوە ، تکایە بەزووترین کات ڕۆڵی خۆتان ببینن بۆ چارەسەری شوێنی ڕووداوەکە
ب– بۆتیمە گەڕۆکەکانی ڤیتامین ( k ) تکایە ئامادەبن بۆ گیرسانەوەی خوێنەکە بەزووترین کات
جا ئەگەر برینەکە پێویستی بەلەفاف و پێچان هەبوو ئەوا لای ئەوان دەست ناکەوێت بۆیە بەناچاری هانا بۆ بەر نەخۆشخانەی سەربازی جەستە دەبەن ، ئەوانیش لەلای خۆیانەوە هێزی دەست و پەنجە و ددانەکان ئاگادار دەکەنەوە کە بەشێك لەجلەکانی خۆتان دادڕن وبرینەکەی پێ بپێچن و بەزووترین کات بیگەیەنن بۆلای دکتۆرێك

خوێنـەری بـەڕێز سـەیری ئـەم هـەموو فـەرمان و جێبـەجێ کردنانـە لـەنێوان پێوەدانی مێشەهەنگوینەکەو دەرهێنانەوەی چزوەکەی کاتێکی ئەوەندە کەمە کە دیاری ناکرێت، ئایا سەر لێشێواوی نییە بۆکەسانێك کە بڵێن هەموو ئەم وردەکاریانە بەڕێکەوت درووست بوون ؟

تـائێرە کەهـەبوونێکی بێگیـان هـەبووین ، پـەروەردگار لەوپێکهاتانـەی زەوی کۆیکردینەوەو دروستی کردین

ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ﴿٢﴾ المُلك

ئەو خوایەی کەمردن و ژیانی دروستکردووە بۆئەوەی تاقیتان بکاتەوە کامەتان کردارەکانتان باشترە وە ئەوخاوەن دەسەڵات و لێبووردەیە

پـەروەردگار لێرەدا مردنـی خستۆتە پـێش ژیانـەوە کەواتـە دەبێـت پـێش ژیـان مردن هەبوبێت کەهەبوونەکەمانە بەکەرەسەی خاوی   ئینجا لـەکاتی مردنماندا دەمانگێڕێتەوە بۆهەمان ئەو کەرەسەخاوانە

كَيۡفَ تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا فَأَحۡيَٰكُمۡۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢٨﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ

چۆن بـاوەڕ بـەخوا نـاهێنن لەکاتێکدا کـەئێوە مردوبـوون ئـەو زیندوویکردنـەوە ئینجـا دەتانمرێنێتـەوەوجارێکی تـر زینـدووتان دەکاتـەوەئینجا بـۆلای ئـەو دەگەڕێنەوە.

مـادام گەڕانـەوە هەیـە کەواتـە گومـان نیـە لـەوەی کـەدەبێت هـاتنیش هـەبوبێت، چونکە گەڕانەوە ئەنجامی ئامانجی هاتنەکەیە بەچاك یان بەخراپ

کەواتە ئێمە لەلایەن پەروەردگارەوە نێردراوین بۆ ئەنجامدانی کارێك لـەکاتێکی دیاریکراودا ، وە دەبێت دوای ئەنجامدانی کارەکە بگەڕێینەوە بۆلای ئەو.ئێمە لەپێشـەوە باسمـانکرد کەهـەر پێکهاتەیـەك دیـوی نـاوەوەی خـۆی هەیـە

کەڕەنگدانـەوەی دیـوی دەرەوەیـەتی کـە لەپێکهاتەیەکـەوە بۆپێکهاتەیـەکی تـر دەگۆڕێت بەپێی ڕێژەی بەشداربوونی توخمەکان تیایدا

دەوترێـت مرۆڤێکـی زیرەکـە واتـە ڕێـژەی ئەوتوخمانـەی کەڕەنگدانەوەکـەیان زیرەکییە بەڕێژەیەکی چاك هـەن لەپێکهاتـەی جەسـتەی ئەومرۆڤەدا ، هـەروەها دەوترێت مرۆڤێکی داوێن پاکە واتە ڕێژەی ئەوتوخمانەی کەڕەنگدانەوەکـەیان داوێنپاکیە بەڕێژەیەکی چاك هەن لەپێکهاتەی جەستەی ئەومرۆڤەدا

دەوترێت مرۆڤێکـی دەروون پاکە یان دەروون پیسە مەبەست لـەپاکی وپیسـی لاشەی ئەوکەسە نیە بەڵکو مەبەست لەڕەنگ دانەوەی دیوی ناوەی ئەوکەسەیە، ئەگــەر لەپێکهاتــەی لاشــەی ئەوکەســەدا ڕێــژەی ئــەو توخمانــەی کــە ڕەنگدانەوەکەیان چاکەکارییە بەڕێژە یەکی چاك هەبوون ئەوا ئەوکەسـە وەکو دەروون پـاك دەردەکـەوێت ، بەپێچەوانەشـەوە ئەگـەر لەپێکهاتـەی لاشـەی ئـەو کەسەدا ڕێژەی ئەوتوخمانـەی کەڕەنگدانەوەکەیان خراپەکارییـە ئەوا ئەوکەسە وەکو دەروون پیس دەردەکەوێت .

کەواتـە هـەموو پێکهاتەیـەك دەروونێکـی تایبـەتی خـۆی هەیە کەڕەنگدانـەوەی پێکهاتــەکانی جەســتەکەیەتی وە لەگــەڵ گــۆڕانی ڕێــژەی توخمــەکان لــەو پێکهاتەیەدا جۆری دەروونەکەش دەگۆڕێت

لەخێزانێکـدا دوو بـرا کەلەهــەمان دایـك وبـاوکن دەگونجێـت دەروونـەکانیان جیـاوازبن بـەپێی ڕێـژەو جـۆری ئەوتوخمانـەی کەلاشـەکەیانی لێپێکهـاتووە ، دەگونجێـت یـەکێکیان درۆزن و ئـەوەی تریـان ڕاسـتگۆ بێـت .دەشـگونجێت کـە دەروونەکانیان لەیەکەوە نزیکبێت وهـەردووکیان ڕاستگۆبن بـەڵام هـەرگیز ئـەو ڕێژەیە لەنێوانیانـدا نابێـت بـە ١٠٠ ٪ لەبەرئـەوەی ڕێـژەی بـوونی توخمـەکان لـە پێکهاتەی جەستەکانیاندا جیاوازەو هۆکارەکانی دەوروبەر وشوێنەوار و جۆری خـواردن کاریگـەرییـەکی دیـارو بەرچـاویان هەیـە لەووروژانـدن وخاوکردنـەوەی دەروونەکاندا.

ئەفلاطون هێزەکانی دەروون بە سێ هێز دەستنیشان دەکات :-

یەکەم :- هێزێکی شەڕانگوێزی نەخۆشەو بەلای ئارەزوو مەیل بازیدایە

دووەم :- هێزێکی مام ناوەندییە لەنێوان هێزی یەکەم و هێزی سێهەم دایە

سێهەم:- هێزێکی بەتوانای چاکە کارە ، بەهێزی خۆبەگەورەزان وتوڕەیی و ڕق دەناسرێت ( افلاطون ل ٢٠٣ )

هێزەکانی دەروون ناکەونەکار هەتا لەلایەن دروستکەرەکەیانەوە فەرمانیان پێنەکرێت پەروەردگار ئەوفەرمانە ناودەبات بە ( ڕوح )

قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى ﴿٨٥﴾ سُورَةُ الإِسْرَاءِ

ئەی محمد بڵێ ڕوح لەفەرمانی خوایە (واتە ڕوح بەشێکە لەفەرمان و دەسەڵاتی خوا) ( أمر ) ووشەیەکی تاکە ئەگەر کۆبکرێتەوە دەبێت بە (أوامر) ، ( روح ) ناوێکی تاکە ئەگەر کۆبکرێتەوە دەبێت بە (أرواح )

هەموو ناوەتاکەکان کەدەسەڵاتی خوان ، ناوی گشتین ، هەموو زیندەوەرەکان لەجێبەجێکردنی ئەم فەرمانانە هاوبەشن وەك :-

الموت مردن ، البعث زیندوبوونەوە ، الحیاة : ژیان

ئەم ناوانە هەموویان تاکن بەلام وەکو مافێك گشتین بۆهەموو زیندەوەرەکان و هاوبەشن تیایاندا ، مردنی هەژارێك و دەوڵەمەندێك یان پاشایەك و گەدایەك جیاوازی نیە لەهەموو بارەکاندا مەبەستێك هەیە ئەویش مردنە

كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٥٧﴾ سُورَةُ العَنكَبُوتِ

هەموو دەروونێك تامی مردن دەچێژێ ئینجا بۆلای ئێمە دەگەڕێنەوە

ژیانیش بەهەمان شێوە هەموو کەس ئەوەندەی کە بۆیدانراوە دەبێ بژیەت ، ژیان بەهەژاری وبەساغی بێت و یان بەدەوڵەمەندی و نەخۆشی بێت لەهەموو بارەکاندا بۆیەك مەبەستە ئەویش ژیانە بۆکاتێکی دیاریکراو

زیندوبوونەوەش مافی هەموانە ، هەرهەموومان بەیەکەوە زیندوودەبینەوە بەبێ هیچ جیاوازیەك

ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾ سُورَةُ المُؤمِنُونَ

ئینجا ئێوە ڕۆژی دووایی زیندودەکرێنەوە

کەواتە ئەم ناوانە ناوی تاکن بۆدەسەلاتەکانی پەروەردگار وەمانای مافی گشتی دەگەیەنن بۆزیندەوەرەکان ،جۆری چاك و خراپیان نیە، ڕوح هەر ڕوحە مردنیش هەرمردنە بەهەرهۆیەکەوە بێت ، زیندوبوونەوەش بۆ هەمووانەو گومانی تێدانیە

کەواتە هەرچی ڕوح هەیە لەم بوونەوەرەدا فەرمانێکی پەروەردگارە و جۆری چاك و خراپ و مام ناوەندی نیە وپارچەپارچە نیەو زیادوکەم ناکات ، ڕوحی منداڵێکی ساوا هەر هەمان ڕوحە لەتەمەنی گەنجیەتی و پیریەتیشدا گەشە ناکات و زیادو کەم ناکات

ئینجا بۆبەکارخستنی هێزە دەروونیەکانی ئادەم پەروەردگار ڕوحی کرد بەبەر ئادەمدا و هەموو هێزەکانی کەوتنەکارو ژیان دەستیپێکرد

لە بەشەکانی داهاتوودا زیاتر باسی جیاوازی ڕوح و دەروون ڕوون دەکەینەوە

دەبێت لەپێش دروستکردنی ئادەمدا دروستکراوی تری پەروەردگار هەبووبن کە بەفریشتە ناسراون

وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ﴿٣٠﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ

وەکاتێك پەروەردگار بەفریشتەکانی گووت جێ نیشینێکم داناوە لەزەویدا

کەواتە ئەی ئادەمیزاد تۆکە ئەوەندە گەورەو پیرۆزی خوا شەرەفی ئەوەی پێداوی کەتۆی کردووە بەجێ نیشینی خۆی لەسەر زەوی بۆئەوەی ئاوەدانی بکەیتەوەو تیایدا بژیت وکاری چاکەی تێدا ئەنجام بدەیت ، تاوانێکی گەورەیە مرۆڤ لەم مافە پیرۆزە خۆی بێبەش بکات

ئینجا بۆ ڕێزلێنان لەجێ نیشینەکەی داوا لەدروستکراوەکانی خۆی دەکات کەسەری ڕێز بۆئەم دروستکراوە دانەوێنن

وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ وَٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ سُورَةُ البَقَرَة

وەكاتێك كەداوامان لەفریشتەكان كرد سەری ڕێز بۆئادەم دانەوێنن هەموو سەریان دانەواند تەنها ئیبلیس نەبێت ڕازی نەبوو، وەخۆی بەگەورەزانی و لەبێباوەڕەكان بوو.

ئینجا پەروەردگار بۆسزادانی شەیتان لەیاخی بوونەكەی لێی پرسی:-

قَالَ يَـٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ﴿٧٥﴾ سُورَةُ ص

خوا فەرمووی ئەی ئیبلیس چی بوو نەیهێشت كەكڕنوش بەری بۆئەو دروستكراوەی كەمن بەدەستەكانی خۆم دروستمكرد ؟

قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿٧٦﴾ سُورَةُ ص

ئیبلیس ووتی من لەوچاكترم ، منت لەئاگر دروستكردووەو ئەویشت لە قوڕ دروستكردووە

قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٣٤﴾

پەروەردگار فەرمووی جا لەوێ بڕۆدەرێ ئەواتۆ نەفرین لێكراوی

قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٣٦﴾ سُورَةُ الحِجر

ئیبلیس ووتی خوایە بمهێڵەرەوە تا ئەوڕۆژەی زیندودەكرێنەوە

قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٣٨﴾ سُورَةُ الحِجر

پەروەردگار فەرمووی ئەوا تۆ لەوانەی كەدەمێننەوە ، تاڕۆژی كاتی زانراو

قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٣٩﴾ سُورَةُ الحِجر

ئیبلیس ووتی ئەی پەروەردگار بەوەی كەگومڕات كردم منیش جوانكاریان بۆ دەكەم لەژیانی سەرزەوی و تێكڕا هەمووان گومڕاو سەرلێشێواو دەكەم

إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ سُورَةُ الحِجر

تەنها بەندەكانی تۆ نەبێت ئەوانەی كەدڵسۆزن

ئەوەی کەدڵسۆزە لەهەموو سەردەم وزەمانێکدا کەس ناتوانێت پەی پێبەرێت ، وە شەیتانە ئادەمی و جندیەکان پێبیناوێرن

قَالَ فَٱلۡحَقُّ وَٱلۡحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ سُورَةُ صٓ

پەروەردگار فەرمووی بەڕاستی وڕاستی دەڵێم

لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٨٥﴾ سُورَةُ صٓ

سوێندبێ جەهەندەم پڕدەکەم لەتۆو ئەوانەی لەوان کەشوێنی تۆکەوتوون

ئینجا کەواتە ئادەمی باوك ، ئادەمی نێرینە پێویستی بەمێینەیەك هەیە بۆ تەواوکردنی ئەو ئەرکەی کەپێی سپێردراوە بۆبەردەوام بوونی ژیان و پەیدابوونی نەوەی نوێ، بۆ ئەم مەبەستە پەروەردگار مێینەیەکی بەناوی حەوا بەم شێوەیە دروستکرد.

هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَا ﴿١٨٩﴾ الأعراف

ئەوخوایەیە کە ئێوەی لەیەك دەروون دروستکردووە وە لەودەروونەوە هاوسەرەکەی پەیداکرد بۆئەوەی لەلای نیشتەجێبێت

واتە پەروەردگار هەموو ئێوەی لەیەك دەروون دروستکردووە کە دەروونی ئادەمەو لەودەروونەش هاوسەرەکەی دروستکردووە کەحەوایە بۆئەوەی ئادەم لەلای نیشتەجێبێت ومالّ وخێزان پێکبهێنن

ئێمە ڕوونمان کردەوە کەدەروون دیوی ناوەوەی جەستەیەو ڕەنگ دانەوەی دیوی دەرەوەیەتی کەجەستەکەیەتی ، لێرەشدا حەوا لەدیوی ناوەوەی ئادەمەوە دروستکراوە کەواتە دەبێت دیوی ناوەوەی ئادەم وحەوا یەك دیوبن، کەواتە گومان نامێنێ کەدەبێت دیوی دەرەوەشیان یەك دیوبێت کەواتە دەبێت جەستەودەروونی حەوا بەکردارێکی لەبەرگرتنەوە (استنساخ) لەجەستەو دەروونی ئادەمەوە وەرگیرابێت

چونکە بەدڵنیاییەوە حەوا لەتۆوی ئادەم دروستنەکراوە ، بۆیە کاریگەریەکانی تۆو وهێلکەو بۆماوە گونجاونین بۆجەستەی حەوا ، هەروەها حەوا وەکو

کۆرپەیەك بەقۆناغەکانی ناومندالدانـدا تێنەپەڕیوەو وەکو کۆرپـە لەناوسنگی ئادەمـــەوە نەهێنراوەتـــە دەرێ  کەواتـــە گومـــان نـــامێنێ کەحـــەوا لەلایـــەن پـــەروەردگارەوە بەیەکـــەم کـــرداری لەبەرگرتنـــەوە (استنســـاخ ) لەجەســـتەی ئادەمەوە دروستکرا

بەڵام ئادەم نێرینەیەو حەوایش کەلەبەر ئەوگیراوەتەوە مێینـە دەرچووە کەواتـە لێـــرەدا نهێنیـــەك هەیـــە کەپـــەروەردگار پێمانڕادەگەیـــەنێت  کەلـــەکرداری لەبەرگرتنـەوە (استنساخ ) دا لەڕەگەزێکی نێرینـەوە مێینەیـەك دروستدەکرێت کە هاووێنەن لەهەموو پێکهاتە هاوبەشەکانیاندا   کەواتە لێرەدا ئەم بیرۆچکەیە ڕەددەکرێتەوە کەدەڵێت مێینە بنەڕەتییە (الانثی هـی الاصـل ) وەهـەموو پەیامـە ئاسمانیەکانیش ئەوڕاستیە دەسەلمێنن کە ئادەم لەپێش حەوا دروستکراوە

لە تەوراتدا دەڵێت :– لە ئادەمیان پرسی بۆچی بەهاوسەرەکەت دەڵێی (امـراة ) لە وەڵامدا ووتی      (لانها من امرئ ) واتە لەبەرئەوەی لەکەسێکەوەیە

( کتاب المقدس / الاصحاح الثانی / تکوین / ص ٦ )

بۆچونەکەی تەورات پشتیوانیەکی بەهێزە بۆئایەتە قورئانیەکە

کەواتـە دەبێـت کـرداری لەبەرگرتنەوەکـە لەخانەیەکـەوە بوبێـت کـە لەکەلەکـەی چەپی ئادەمـەوە هێنراوەتـە دەرەوە ، ئینجـا بەگەشـەیەکی تایبـەت گەیەنراوەتـە ئاستی تەمەنی ئادەم ، و کراوە بەهاوسەری ، بۆئەوەی ببێتە مایەی حەوانەوەو نیشتەجێ بوون بۆئادەم

وَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ وَكُلَا مِنْهَا رَغَدًا حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ

وە ووتمـان ئـەی ئـادەم خـۆت وهاوسـەرەکەت نیشـتەجێبن لەبەهەشـتدا وەلـە بەروبومەکـەی بخـۆن بـەبێ قەدەغـە ، چـۆنتان ئارەزوولێیـە، وەلـەوداره نزیـك مەکەونەوە چونکە ( بەنزیك کەوتنـەوەتان لـەوداره ) دەچنە ڕیـزی ئەوانـەی کـە ستەمکاران.

فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِ ﴿٣٦﴾ سُورَةُ البَقَرَة

**ئینجا شەیتان ئەوانی هەڵخلیسکاندو دەریکردن لەوەی کەتێیدابوون**

**واتە شەیتان ئەوانی هەڵخلیسکاند بەوەی کەپێی ووتن لەبەری ئەوداره بخۆن بۆئەوەی سەرپێچی فەرمانی خوابکەن ، کە بووبەهۆی دەرکردنیان لەبەهەشت و ئەو نازو نیعمەتەی کەتێیدابوون**

**ویستی پەروەردگارە کەشەیتان سەری ڕێز بۆئادەم دانەنەوێنێ لەوکاتەی کە داوای لێکرد ، بۆئەوەی لەلایەن پەروەردگارەوە لەسەر ئادەم سزا بدرێت ولە بارەگای پەروەردگار بەدەربندرێت ، شەیتانیش لەتۆڵەی ئەم سزادانەیدا ئادەم وهاوسەرەکەی توشی ئەم دەرکردنە بکات ، بۆئەوەی ویستێکی تری پەروەردگار بێتەدی کەئەویش دەرکردنی ئادەم وحەوان لەبەهەشت و جێنیشین کردنیانە لەسەر زەوی بۆمەبەستێك کەدەستپێکردنی ژیانە لەسەر زەوی بۆکاتێکی دیاریکراو**

قُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ مِنۡهَا جَمِيعٗا ﴿٣٨﴾ سُورَةُ البَقَرَة

**ووتمان هەمووتان لەبەهەشت بڕۆنە خوارێ**

**واتەهەرئادەم وحەوا نەبوون لەبەهەشت خرانەخوارێ ( جميعاً ) هەر هەموویان دەگرێتەوە هەرچی لەبەهەشت دابووە لەئادەمیزاد وفریشتە وجندوکەو ئاژەڵ و زیندەوەرو پێکهاتەکانی کەپێویست بوون بۆژیانی سەرزەوی**

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ صلى الله عليه وسلم

(احْتَجَّ آدَمُ وَمُوسَى فَقَالَ لَهُ مُوسَى أَنْتَ آدَمُ الَّذِي أَخْرَجَتْكَ خَطِيئَتُكَ مِنَ الْجَنَّةِ ؟ فَقَالَ لَهُ آدَمُ : أَنْتَ مُوسَى الَّذِي اصْطَفَاكَ اللّهُ بِرِسَالَتِهِ وَبِكَلاَمِهِ، ثُمَّ تَلُومُنِي عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِّرَ عَلَيَّ قَبْلَ أَنْ أُخْلَقَ ؟ فَحَجَّ آدَمُ مُوسَى ). صحيح مسلم بشرح النووي ٤ ٩ ٦ ٦ الحديث الشريف

پێغەمبەر(سلاْوی خوای لێ بێت) فەرمووی ئادەم و موسا دەم بەدەمانێیانکرد ئینجا موسا پێی ووت تۆئەو ئادەمەی کەهەڵەکردنەکەت لەبەهەشت بەدەرینای؟ ئینجا ئادەم پێی ووت:تۆ موسای ئەوکەسەی کەخوا بەنامەکانی و بەووتەکانی خۆی پاکیکردیەوە ، ئینجا تۆ لۆمەی من دەکەی لەسەرفەرمانێك کەخوا بۆمنی دیاریکردوە پێش ئەوەی دروستم بکات ؟ ئینجا پێغەمبەر (سلاْوی خوای لێ بێت) فەرمووی ئادەم موسای بێدەنگ کرد.(واتە وەلاْمەکەی ئادەم ئەوەندە پڕبەڵگەوسەلماندن بووموسای بێدەنگ کرد ).

کەواتە هەرچی بووەو دەبێت لەژێر سێبەری وویستەکانی ئەودایە هیچ چارەو پەناو حەشارگەیەك نییە هیچ قازانج و زەرەرێك نییە هیچ خۆشی وناخۆشی یەك نییە ئەگەر وویستی ئەوی لەسەرنەبێت کەواتە بۆدەستکەوتنی باشترین سەرئەنجام خۆ نزیککردنەوەیە لەم پەروەردگارەوخۆ بەبچوك زانین و بێ دەسەلاْتییە بەرامبەر هێزودەسەلاْت وفەرمانەکانی

وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلْأَنْعَٰمِ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ ﴿٦﴾ سُورَةُ الزُّمَرِ

وەبۆمان ناردونە خوارێ لەئاژەڵەکان هەشت دانەی نێرومێ

مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ ﴿١٤٣﴾ سُورَةُ الأَنْعَامِ

لە مەڕ دوودانە نێرومێ وەلەبزن دوودانە نێرومێ

وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ ﴿١٤٤﴾ سُورَةُ الأَنْعَامِ

وە لەحوشتر دوودانە نێرومێ وەلەمانگا دوودانە نێرومێ

هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً ﴿١٠﴾ سُورَةُ النَّحْلِ

ئەو خوایەیە ئەوکەسەی کەئاوی لەئاسمانەوە هێناوەتە خوارەوە

قُلْ أُوحِىَ إِلَىَّ أَنَّهُ ٱسْتَمَعَ نَفَرٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَقَالُوٓا۟ إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا ﴿١﴾ الْجِنّ

ئەی محمد بلێ لەلایەن پەروەردگارەوە پەیامم بۆهاتووە کە(چەند) کەسێك لەجندوکە گوێیان گرتبوو (کاتێك کەپێغەمبەر نوێژی دەکرد ئینجا کەگەڕانەوە لای جندوکەکانی تر ) ووتیان ئێمە گوێمان لەقورئانێکی سەرنج ڕاکێش بوو

کەواتە جندوکەکانیش بەشێکن لەوانەی هەڵدراونەتە خوارەوە بۆسەرزەوی بەلاّم چاوەکانی ئێمە توانای بینینی ئەوانی نیەو ئەوان لەئاگر دروستکراون و توانای بینینی ئێمەیان هەیە ، پێش هاتنە خوارەوەی قورئان شوێنی تایبەتیان هەبووە لەئاسماندا بۆگوێ گرتن و وەرگرتنی زانست بەلاّم دوای هاتنە خوارەوەی قورئان ئەوەیان لێقەدەغەکراوەو ئەگەر لەئاسمان نزیك بکەونەوە توشی نەهامەتی دەبن

وَأَنَّا لَمَسْنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدْنَـٰهَا مُلِئَتْ حَرَسًا شَدِيدًا وَشُهُبًا ﴿٨﴾ سُورَةُ الجِنِّ

( جندوکەکان ووتیان ) : وەبەڕاستی ئێمە دەستمان بەر ئاسمان کەوت و وامان بینی کەپڕکراوە لەئێشکگری توندوتیژو ئەستێرەی سوتێنەر

وَأَنَّا كُنَّا نَقْعُدُ مِنْهَا مَقَـٰعِدَ لِلسَّمْعِ فَمَن يَسْتَمِعِ ٱلْـَٔانَ يَجِدْ لَهُۥ شِهَابًا رَّصَدًا ﴿٩﴾ الجِنِّ

وەئێمە(پێشتر) دادەنیشتین لەئاسمانا لەوشوێنانەی کە بۆگوێگرتن داندرابوون، بەلاّم ئێستا هەرکەسێك بیەوێت گوێبگرێت خۆی دەبینێتەوە کەدەست نیشانکراوە لەلایەن ئەستێرەیەکی سوتێنەرەوە

وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿٥﴾ سُورَةُ الجِنِّ

وەبەڕاستی ئێمە وامان گومان دەبرد کەئادەمیزادوجندوکە لەبارەی خواوە هەرگیز شتێکی درۆ ناڵێن

کەواتە ئەم جندوکانەش دروستکراوی پەروەردگارن و لەبەهەشتەوە نێردراونەتە سەرزەوی

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
جَاعِلِ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَـٰثَ وَرُبَـٰعَ ﴿١﴾ سُورَةُ فَاطِرٍ

سوپاس وستایش بۆخوا کەداهێنەری ئاسمانەکان وزەوییە، فریشتە خاوەن باڵەکانی کردون بەپەیامبەر کەخاوەنی دووباڵ وسێ باڵ وچوارباڵن.

کەواتە پەروەردگار تەنها فریشتە دوو باڵ وسێ باڵ وچوار باڵەکانی کردون بە پەیامبەر، کەواتە گونجاوە کەفریشتە هەبن بۆکاری تر کەژمارەی باڵەکانیان زیاتربێت ولەهەمان کاتیشدا گونجاوەکە فریشتە هەبن بۆکاری ترکە بێباڵبن.

وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَـٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَـٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ الإنفطار

وەبەڕاستی پارێزگاری کەر بەسەرئێوەوە هەن(١٠)زۆر بەڕێزن ونوسەرن(١١)ئەوەی کەئێوە دەیکەن ئەوان پێیدەزان(١٢).

کەواتە دەبێت ئەم فریشتانە لەگەڵ ئادەم وحەوادا هاتبنەخوارەوەو بەردەوامیش بن لەهاتنەخوارەوە لەگەڵ هەموو پەیدابوون و لەدایك بوونێکدا وە لەوانەیە ئەوان زیاتر ڕێگەیان پێدرابێت کەزیاتر بەرزببنەوە بۆئاسمانەکان وزۆرتردابەزنە قولایی دەریاکان وئەوتواناو دەسەلاتەی کەبەوان دراوە نە بەجندوکەو نە بەئادەمیزاد نەدراوە

عَنْ عائشَةَ قَالَتْ: قال رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم :(خُلِقَتِ الْمَلائِكَةُ مِنْ نُورٍ. وَخُلِقَ الْجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ. وَخُلِقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ).

صحيح مسلم بشرح النووي ٢٩٩٦ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێ بێت) فەرمووی :( فریشتەکان لە ڕەوشەنی ڕووناکی دروستکراون. وەجندوکەکان لەگڕی ئاگرێکی بێ دوکەڵ دروستکراون. وەئادەمیزادیش وا دروستکراوە وەکو بۆتان باسکراوە ).

( مارج ) وواتە ئاگرێکی بێ دووکەڵ ( الصحاح \ مرج \ص ٦٢٠ )

ئاگرێکی بێ دوکەڵ کەرەستەی خاوی دروستکردنی جندوکەکانە، ئایا دەبێت سووتەمەنی ئەم ئاگرە بێ دوکەڵە چی بێت ؟ ئەوەندەی بۆئادەمیزاد ئاشکرایە ئاگری هێزی تەزووی کارەباو ئاگری هێزی ئەتۆمیش دوکەڵدارن ..!!

وەشتێکی تر لەوانەی کەلە بەهەشتەوە ناردراونەتە خوارەوە ئەو بەردە ڕەشەیە کە لەسوچێکی مزگەوتی کەعبە دانراوە

عن ابن عباسٍ أنَّ النبي صلى الله عليه وسلم قال :( الحجر الأسود من الجنّة ) .

سنن النسائي الكبرى ٣٨٨٤ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سلاوی خوای لێ بێت) فەرمووی :( بەردە ڕەشەکە لەبەهەشتەوەیە )**
**کەواتە بەردە ڕەشەکەش لە پێکهاتەکانی بەهەشتەو لەگەڵ دروستکروەکانی تردا داگیرانە سەرزەوی بۆمەبەستێکی تایبەتی لەبەشەکانی داهاتوودا بەووردی باسی هۆی ناردنەخوارەوەی ئەم بەردە ڕووندەکەینەوە**

قال رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم
(نَزَلَ الحَجَرُ الأَسْوَدُ من الجَنَّةِ وهُوَ أشَدُّ بَيَاضاً مِن اللَّبَنِ فَسودَتْهُ خَطَايا بَنِي آدَمَ ) . جامع الترمذي ٨٧٢ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سلاوی خوای لێ بێت) فەرمووی :(خوا بەردە ڕەشەکەی لەبەهەشتەوە هێنایە خوارەوە، زۆر سپیتربوو لەشیر، تاوانەکانی ئادەمیزاد ڕەشیان کرد).**

# ژیان لەسەر زەوی

زانیاریـەکانی زانسـتە مرۆیـەکان وادەگەیـەنن کـە :( ڕەگـەزی ئادەمیزادی عاقـڵ کاتێـــک کـــە دەرکـــەوت لەســـەر زەوی مێژووەکـــەی دەگەڕێتـــەوە بۆنزیکەی(٢٠٠,٠٠٠) دوو سەد هەزارساڵ پێش ئیمڕۆ .( الجغرافیا العامة ص ٣٠٠)

ئـادەم وحـەوا کـە لەبەهەشـت بـەرەو زەوی نێردرانـە خـوارەوە یـەکێکیان لـە خۆرهـەلأت وئەوی تریشـیان لـەخۆرئاوا خۆیـان بینیـەوە ، دوای گـەڕانێکی زۆر بـەدوای یەکتریـدا لەسـەر چـیای (عەرەفـە) لـەنزیك شـاری مەککـەوە یـەکتریان ناسیەوەو چیایەکەش هەربەهۆی یەکتر ناسینەوەی ئەوانەوە ناونرا (عرفە) واتە ناسـینەوە، ئـەم ڕووداوە لـەڕۆژێك دابـوو کەڕێککـەوتی ڕۆژی پـێش جـەژنی قوربانی دەکرد بۆیە ئەوڕۆژەش ناونرا (یوم عرفە) واتە ڕۆژی یەکترناسین

هەر لەم ڕۆژەشدا حاجیەکانی ماڵی خوا بۆبیرەوەری ئەم یادە لەدەوروبەری ئەم جیایە کۆدەبنەوەوخۆیان بەیەکتر دەناسێنن .لەوانەیە یەکێك بپرسێت ئەوکاتە کـەی جـەژنی قوربـان هـەبووە ؟ بـەڵێ جـەژنی قوربـان لەلایـەن پـەروەردگارەوە دیـاریکرا بـەهۆی بەخشـینی پێغەمبـەری مـەزنمان ئیسـماعیل و دیـاری کردنـی مـەڕێك لـەجیاتی ئەو بۆقوربانیـدان لەڕێگـەی خـوادا ، هـەر بۆیەشـە حاجیـەکان دوای گەڕانـەوەیان لەچـیای ( عرفـە ) بـۆڕۆژی دواتـر دەگەڕێنـەوە بۆمەککـەو دەیکەن بەجەژن و قوربانیەکانیان سەردەبڕن ، هـەر کەسێك لـەماوەی ئەم چوار ڕۆژەدا قوربانیەك بۆڕەزامەندی خوا سەرببڕێت وەکو لەپێناوی خوادا کوڕەکەی خۆی سەر بڕیبێت وەهایە ، هەرچەندە قوربانی کردنەکە ئەرکێکی ئاینییە بەڵام بـۆ مەبەسـتی تێرکردنـی هـەژارو بێدەرامەتەکانـە لـەم ڕۆژە پیرۆزانـەدا ، ئـەم بیرەوەریانە لەلایەن پـەروەردگارەوە کـاتی دیاریکراویـان بۆداندراوە بـۆ نمونـە لەگەڵ هاتنی پێغەمبەری مەزن موسا(صلی الله علیە و سلم ) ڕۆژی شـەممە دیـاریکرا

بۆخـوا پەرستی وپشـودان، دوای هـاتنی پێغەمبـەری مـەزنمان عیسـای کـوڕی مریەم (صلی الله علیه و سلم ) ڕۆژی یەك شەممە دیاریکراو لـەوێوە مێـژووی میلادی دەستی پێکردو دوای هاتنی پێغەمبەری مەزنمان محمد (صلی الله علیه وسلم )ڕۆژی هەینی دیاریکراو لەکۆچکردنیەوە بۆمەدینە مێژووی کۆچی دەستیپێکرد ئینجا کـەئادەم وحـەوا لەسـەر زەوی بەیـەکتر شـادبونەوە ژیـان دەسـتیپێکرد، کەواتـە دەبێـت پێشـتر زەوی ئامادەکرابێـت بـۆ جێگیربـوون وژیـانی ئـادەم و نەوەکانی

ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ فِرَٰشًا ﴿٢٢﴾ سُورَةُ البَقَرَة

ئەو خوایەیە کە زەوی بۆ والێکردون ڕاخراوبێت

أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴿٦﴾ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا ﴿٨﴾
وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾
وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾
وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾
وَجَنَّٰتٍ أَلْفَافًا ﴿١٦﴾ سُورَةُ النَّبَإِ

ئایـا زەویمـان بـۆ ئامـادە نـەکردون ؟(٦)وەچـیاکانمان نـەکردون بـە داکـوتراو لەزەویدا ؟(٧) وە ئێوەمان بەجووتە دروست کردووە(٨)وەنوستنەکەی ئێوەمان کردووە بەمایەی پشـودانتان(٩) وە شـەومان کـردووە بەپۆشـاك(١٠) وە ڕۆژمـان کـردووە بەمایـەی بـژێوی(١١) وە لەسـەر ئێـوەوە حـەوت ئاسمـانی پتـەومان دروسـتکردووە(١٢)وە چـرایەکی گـەرمی بەخشـمان دروسـتکردوە(١٣)وە لـە هەورە گوشراوەکانەوە ئاوێکی بە خوڕمان هێنایەخوارەوە(١٤)بۆئەوەی بەوئاوە دەنکـەی دان و ڕووەکـەکانی پـێ بێنینـە دەرەوە لـەزەوی(١٥)وە بـاخ و باخـاتی چڕو تێکچڕژاو(١٦).

وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلْبَحْرَ لِتَأْكُلُوا۟ مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا
وَتَسْتَخْرِجُوا۟ مِنْهُ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا ﴿١٤﴾ سُورَةُ النَّحْل

وە ئەوە ئەوكەسەی دەریای ملكەچ كردووە بۆئەوەی گۆشتێكی تازەی لێوە بخۆن ،وە لێیەوە خشڵ وجوانكاریەكانی لێوەدەربێنن و بەبەرخۆتانی دابكەن

وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٖ مَّعۡرُوشَٰتٖ وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٖ
وَٱلنَّخۡلَ وَٱلزَّرۡعَ مُخۡتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ
مُتَشَٰبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٖۚ كُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ ﴿١٤١﴾ سورة الأنعام

وە ئـەوە ئەوكەسـەی كەبێسـتانی دەسـتكردو خۆرسـكی دروسـتكردووە، وە دارخورمـاو بـەروبوومی كشـتوكاڵێك كـەتامی خواردنـەكانیان جیاوازبێـت، وە زەیتون وهـەناری لەیەكترچوو وجیاجیای درووستكردووە ، لەبەروبومـەكانیان بخۆن كاتێك كەبەریانگرت.

وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ حَمُولَةٗ وَفَرۡشٗاۚ كُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ ﴿١٤٢﴾ سورة الأنعام

وە لەئاژەڵەكاندا بارهەڵگرو ئەوانەی بۆسەربڕین لەزەوی دەدرێن ، بخۆن لەو بژێویەی خوا بەئێوەیداوە

بەم پێیە زەوی بۆژیان ئامادەكراو ژیانی یەكەم خێزان دەستپێكرد

وەكو لەپێشەوە باسمانكرد پـەروەردگار زانسـتی داوە بەگازی ئۆكسـجین كـە لـە ئـاودا بتوێتـەوەو یارمـەتی هەناسـەدانی گیانـەوەرە ئاویـەكان بـدات و زانسـتی ئەوەی دراوەتیٚ كـە سیٚ ئۆكسجین یـەكتری بگـرن و بەرەوچینەكانی سـەرەوەی هـەوا بەرزببنـەوەو ڕووبەڕووی تیشـكی سـەروی بنەوشـەیی ببنـەوە ، بەهـەمان شێوە زانستی داوە بەڕەگەكانی داری زەیتون كە لەخاكـەوە تـەنها ئـەو توخمانـە هەڵبمـژن كـە لـەناو دەنكـە زەیتونێكـدا كۆكراونەتەوە،هـەروەها زانسـتی داوە بـەداری خورمـا كـە لەخاكـەوە تـەنها ئـەو توخمانـە هەڵبمـژێت كـە لەدەنكـە خورمایەكدا كۆكراونەتەوە، وە هـەر پـەروەردگار بۆخـۆی دەزانێـت لـەنێوان پێك هاتـەی خـاك و ڕەگـەكان و قـەد و گـەڵا و دەنكـە خورماكانـدا چـەندین كارلێـك و گۆڕانكاری ڕوودەدەن

بەهەمان شێوە دەنکە گەنمێك و دەنکە برنجێك و هەموو ئەو دانەوێڵانەی کە لەسەر زەوی شین دەبن زانستی ئەوەیان پێدراوە کەتەنها ئەو توخمانە کۆبکەنەوە کە لەپێکهاتەی دەنکەکانی خۆیاندا هەیە کەهەریەکە تام و ڕەنگ و بۆن و کێش و چێژی تایبەتی خۆیان هەیە ، شتێکی سەرنج ڕاکێشە کەچەند ڕووەك ودەنکە دانەوێڵەیەکی جیاجیا لەتەنیشت یەك و لەڕووبەرێکی کەمدا بڕوێنیت هیچیان زیادەڕەویو دەستدرێژی ناکاتە سەر ئەوی تریان وبەڕێك و پێکی هەریەکە کارەکەی خۆی ئەنجام دەدات ، دەکرێت بەهۆی زانستەکانی بۆماوەزانییەوە لەتاقیگەکاندا جۆری چاکترو باشتر دروستبکرێت لەهەمان بەرهەم.

ئاژەڵەکانیش بەهەمان شێوە بۆنمونە مەڕ ومانگاو بزن کەئێمە لە بەرو بومەکانیان دەخۆین زانستیان دراوەتیٚ کەکام گیایە بۆخواردن دەبێت و کام شلەیە بۆخواردنەوە دەبێت ، ئەگەر مەڕ ومانگا کنگر و کاردویان بخواردبا ئەوا گرامێك دەست ئادەمیزاد نەدەکەوت.

ئینجا هەموو ئەم ئاژەڵ وڕووەك و بەروبومانەی کە لەسەر ووشکایی و دەریاکاندا هەن خراونەتە بەردەستی مرۆڤ هەندێکیان ڕێگە بەخواردنیان دراوەو هەندێکیشیان قەدەغەکراون .

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ
وَٱشْكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ

ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە بخۆن لەوشتەخۆشانەی کەپێمان بەخشیون وە سوپاسی خوا بکەن ئەگەر ئێوە هەرئەودەپەرستن

وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨﴾ سُورَةُ النَّحْلِ

وە ئەگەرئێوە نازو نیعمەتەکانی خوا بژمێرن بۆتان سەرژمێری ناکرێت بەڕاستی خوا لێبوردەو خاوەن بەزەییە

حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلْمُنْخَنِقَةُ وَٱلْمَوْقُوذَةُ وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا۟ بِٱلْأَزْلَٰمِ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ ﴿٣﴾ سورة المائدة

لێتان قەدەغە كراوە مردارەوە بوو، وەخوێن وگۆشتی بەرازو ئەوئاژەڵەی كە لەپێناوی كەسێكی كەدا جگەلەخوا سەربڕدرابێت و ئەوئاژەڵەی كە خنكێندراوەو ئەوئاژەڵەی بەلێدان مردووەو ئەوئاژەڵەی لەشوێنێكی بەرزەوە هەڵدێراوەو ئەوئاژەڵەی لەئەنجامی شەڕە قۆچدا گیانی لەدەستداوەو ئەو ئاژەڵەی كەشێر دەیخوات مەگەر ئەوەی كە پاكدەكرێتەوە ، وە ئەوئاژەڵەی لەسەر بتەكان سەردەبڕدرێت ودابەشكردنی شتەكان بەشێوازی خۆتان و بەختی خۆتان ( تیر و پشك ) ئەوە بۆئێوە لادانە لەئاین

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ ﴿٩٠﴾ سورة المائدة

ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە ، بەڕاستی خواردنەوەی سەرخۆشكەروقوماركردن و بتپەرستی و دابەشكردنی شتەكان بەخۆتان و بەختی خۆتان (بە تیر وپشك) پیسین لەكردەوەی شەیتانن لێیان دووركەونەوە.

ئینجا سەرەڕای ئەم هەموو ئاگاداریانەش پەروەردگار سەربەستی تەواوی داوە بە ئادەمیزادەكان و دەفەرمووێت :

إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ سورة الإنسان

ئێمە ڕێگای ڕاستمان نیشانداوە ئینجا یان سوپاسكەر دەبێت، یان بێباوەڕ دەبێت واتە ئێمە ڕێگای ڕاستمان نیشانی ئادەمیزاد داوە ئینجا یان گوێ ڕایەڵی فەرمانەكانی خوادەبێت وبەرەو بەهەشت دەڕوات یان سەرپێچی فەرمانەكانی خوادەكات و بەرەو دۆزەخ دەڕوات

ئینجـا کـە ئـادەمیزاد لــەو بەروبومانــە دەخــوات هێــزو توانایــەك دەکەوێتــە جەستەیەوە ، بەشێك لەوهێزوتوانایە دەبێت بە توانای بینین و بیستن و هەست کردن و جووڵە و بیرکردنەوە و بەشێکیش لەکارگەیەکی تایبەتی نێرینەدا دەبێت بە تۆو وە لەکارگەیەکی تایبەت بەمێینەدا دەبێت بەهێلکە

فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ سورة الطارق

بـا ئـادەمیزاد تەماشـاکات لەچـی دروسـتکراوە(٥)دروسـت کـراوە لـەئاوێك کـە بەتەکان دێتەدەرەوە(٦).

إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعًا بَصِيرًا ﴿٢﴾ سورة الإنسان

ئێمـە ئادەمیزادمـان دروسـتکردووە لـەئاوێکی تێکـەڵ ، بـەتاقی دەکەینـەوە بۆیـە وامان لێکردووە ببینێ وببیستێ

تۆوی نێرینە تێکەڵاوێکە لەگیانەوەری تۆوی نێرە ومێیە ، بەڵام هێلکـەی مێینـە تـاك لایەنەیـەکی مێینەیـە ، کەواتـە لێـرەدا ئـەو بیرۆچـکەیە ڕەددەکرێتـەوە کـە دەڵێت ( الانثى هى الاصل ) چونکە بەڕاستی هەر وەکوچۆن حـەوا لـە ئادەمـەوە دروستکراو ئادەم بنەڕەتییەو بەهەمان شێوەیش پەیدابوونی کۆرپـەی نێرومـێ بێشـك دەبێـت لـەوتۆوەوە پەیـدا ببێـت کەتێکەڵاوێکـە لەگیانـەوەری تـۆوی نێرەومێیە ، ( کە پێویستە لـە ( ١سم٣ )ی شلەی تـۆودا ( ٥٠ – ١٠٠ ) ملیـۆن گیانەوەری تۆوی کەمتر نەبێت بۆئەوەی پیاو بەبێ گرفت توانای منـداڵ هێنـانی هەبێت ) .( مجلة طبيبك ص ١١٤ ، اب\ ١٩٨١ )

کـە واتـە لـەبوارە زانسـتیەکانداو لەتاقیگەکانـدا ئەگـەر بتوانرێـت تۆوەکـە بـژار بکرێـت و لەیـەکتری جیابکرێتـەوە ئـەوا دەتوانرێـت ئـەم تۆوەیـان دەستنیشـان بگرێـت کەدەتـەوێت بیچێنیت، هەرچـەندە ئەمـەش کـارێکی ئاسـان نیـە چـونکە بەجیاکردنـەوەی تۆوەکـان ژمـارەی گیانـەوەرە تۆویـەکان لـە (١سـم٣ ) لەکـەمی دەدات و ئەگــەری پیتانــدنی هێلکەکــە کــەمتر دەبێتەوەوئەگــەری پەیــدابوونی کۆرپەی نێرەموك ونەخۆش زیاد دەبێت بەهۆی کەمبونەوەی ژمارەی گیانـەوەرە

تۆویـەکان لـە ( ١سـم٣ ) ، بـەهۆی زانسـتەکانی بۆماوەزانیشـەوە دەتوانـدرێت هەنـدێك لەوویسـت و ئارەزووەکـانی دایـك و باوکەکـە جێبـەجیٚ بکرێـت بـەڵام هــەرگیز ناتوانــدرێت دەســتکاری بنەمابنەڕەتیــەکانی ڕەگــەزی مــرۆڤ وچــارە نوسـەکەی بکرێـت بۆنمونـە ناتواندرێت مـرۆڤ بکرێـت بەمـەیمون یـان بـەکۆتر هــەروەها ناخۆشـیەکانی تەمــەنی ئەوکۆرپەیـە ناتوانـدرێت بکـرێن بەخۆشـی هەروەها تەمەنی دیاریکراوی ئەم کۆرپەیە ناتواندرێت درێژ بکرێتـەوە هـەروەها ناتواندرێت شوێنی گیان کێشانی ئـەم کۆرپەیـە بگۆڕدرێـت و ناتواندرێت سەر ئەنجامەکەی دەستکاری بکرێت

وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ﴿٣٤﴾ سُورَةُ لُقْمَانَ

وە هــیچ دەروونێــك نازانێـت بــەیانی چــی دەســتدەکەوێت و هــیچ دەروونێـك نازانێت لەکام خاکەدا دەمرێت

فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا
لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ الرُّومِ

جـا ڕووی خـۆت بـەپاك و بێگـەردی بەرامبـەر ئـەم ئاینـە دابەسـتە ، داهێنانـە یەکەمیەکانی پەروەردگارن کەئادەمیزادی لەسەر داهێنان هـیچ گۆڕانکاریـەك بۆ دروستکراوەکانی خوا نیە ، ئەوە ئەوئاینەڕاستەیە بەڵام زۆرینـەی خەڵکی پـیٚ نازانن

کەواتە داهێنانە یەکەمیەکانی خوان لـەم ئاینـەدا کەئادەمیزادیان لەسـەرداهێنرا بۆیـە هـیچ گۆڕانکاریـەك نابێـت لەدروسـتکراوەکانی خـوادا کەواتـە هـەموو کۆرپەیـەك کەلـەدایك دەبێـت لەسـەر بەرنامـەی ئـاینی ئیسـلام لـەدایك دەبێـت ، ئینجا ئەگـەر هـاتوو پـەروەردە کردنەکـەی لەسـەر بەرنامـەی ئاینی ئیسـلام بـوو ئەوا بەردەوام دەبێت لەژیاندا لەسەر ئەوبەرنامەیەی کەلەسەری داهێنـراوە وە هەرکاتێکیش پەروەردەکردنەکەی لەسـەر پرۆگرامێکـی تـر بێـت ئـەوا دەبێـت بە قوتابی قوتابخانەی ئەوپرۆگرامە

که هێلکه هەموو قۆناغەکانی گەشەی تەواوکرد هێلکەدان بەجێدەهێڵێ بەرەو منداڵدان ، چاوەڕێی تۆوی نێرینەکە دەکات ، ئەگەر لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا تۆوەکە گەیشت بەهێلکەکە ئەوا پیتێن ڕودەدات ، وە ئەگەر تۆوەکە نەگەیشت ئەوا هێلکەکە پوچەڵ دەبێت و بەئێش و ئازارێکی زۆرەوە دێتە خوارەوەو ئافرەتەکە دەکەوێتە ماوەی بێدەست نوێژی (فترة الحيض) کە پەروەردگار بەم شێوەیە باسی دەکات

وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِۖ قُلۡ هُوَ أَذٗى فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ
وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَۖ فَإِذَا تَطَهَّرۡنَ فَأۡتُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُۚ
إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ

ئەی محمد دەربارەی خوێنی( بێ دەست نوێژی ) ئافرەتان پرسیارت لێدەکەن بڵێ ئێش و ئازارە ، دەست لەئافرەتەکانتان بکێشنەوە ( بۆکاری جووت بوون ) وە نزیکیان مەکەونەوە هەتا پاکدەبنەوە ، ئینجا ئەگەر پاکبوونەوە بچنە لایان بەوشێوەیەی کەخوا فەرمانی پێکردون ، بەڕاستی خوا تۆبەکارەکانی خۆش دەوێت و ئەوانەشی خۆش دەوێت کەخۆیان پاکدەکەنەوە

نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ ﴿٢٢٣﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ

ئافرەتەکانتان کێڵگەن بۆئێوە کێڵگەکانتان بکێڵن چۆنتان ئارەزوولێبوو

کەواتە لێرەدا مەبەستێك هەیە کەکێڵانە بۆ گەیشتن بەئامانجێك کە تۆو پێوەکردنی کێڵگەکەیە بۆدروستبوونی کۆرپە تۆویش تەنها بەکێڵگەوە دەکرێت وکۆرپەش تەنها لەکێڵگەکەدا دەڕوێت کەمنداڵدانە، کەواتە کێڵان و تۆو پێوەکردنی شوێنێکی تر کەتۆوەکە نەگەیەنێتە کێڵگەکە سەرپێچی کردنە لەفەرمانەکانی خوا

قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : ( ملعون من أتى امرأته في دبرها ) .

مسند الإمام أحمد ٩٥٤٧ الحديث الشريف

پێغەمبەر(سڵاوی خوای لێبێت) فە رمووی : (خوا نەفرینی لەوکەسە کردووە

که لەدواوەوە دەچێتە لای ئافرەتەکەی خۆی)

مەبەست لە دواوە (کونی هاتنە دەرەوەی پیسایی ئادەمیزادە).

قال رسولُ الله صلى الله عليه وسلم ( مَلعُونٌ مَنْ أتى امرأةً في دُبرِهَا ).

سنن إبي داوود ٢١٢٩ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( خوا نەفرینی لەوکەسە کردووە کەلە دواوەوە دەچێتە لای ئافرەتێك ) ( هەر ئافرەتێك بێت )

قال رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم ( من وجدتموه يعمل عمل قوم لوط فاقتلوا الفاعل والمفعول به ) مسند الإمام أحمد ٢٧٢٥ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( کێتـان بینـی کـاری گەلەکەی(لـوط) (نێر باز) ی دەکرد ئەوا بکەرو کارلەسەر کراوەکەش بکوژن )

کەواتە گومان نامێنێ کەکێلان تەنهاوتەنها هەر بۆکێلگەکەیە

ئەمە دیوێکی لێکدانەوەی ئایەتەکە بوو ، دیوەکەی تری ڕوو لەئافرەتان دەکات ودەڵێت ئەم کێڵگەیەی تۆ بۆیە دروستکراوە تەنها بەگاسنی پیاو بکێڵدرێت نـەك بەشـتی تـر ، وە هـەر ئەوەنـدە ڕێگـە بەگاسـنەکەش بـدەن تـەنها کێڵگەکـە بکێڵێت لەکاتێکدا کە ئێوەپاکن ، لە کاتی ماوەی بێنوێژیتان ڕێگە بەگاسنەکان مەدەن کێلانەکە ئەنجام بدەن

لەبەرئـەوەی کەجێبـەجێکردنی ئارەزووەکـانی نێرینـە لـەلای مێینەیـە، وە بـەبێ ڕەزامەندی ئەو نایەتەدی بۆیە پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) دەفەرمووێت :

حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عنه :

عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ إِذَا بَاتَتِ الْمَرْأَةُ هَاجِرَةً فِرَاشَ زَوْجِهَا لَعَنَتْهَا الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ ۞ البديان حديث رقم ٨٣٢

**پێغەمبەری خوا (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( ئەگەر ئافرەتێک شەوێك لەشوێنێك مایەوەو پێخەفی هاوسەرەکەی بەجێ هێشتبوو ئەوا فریشتەکانی خوا تابەربەیان نەفرینی لێدەکەن )**

وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ سُورَةُ الرُّومِ

**وە لە بەڵگەو نیشانەکانی خوا ئەوەیە لەدەروونەکانی خۆتانەوە جووتەکانی بۆ ئێوە دروست کردووە ، بۆ ئەوەی لەلای نیشتەجێبن و سۆزو بەزەیی خستۆتە نێوانتانەوە ، بەڕاستی لەم کارەی خوادا بەڵگەو نیشانەی زۆرهەن بۆگەل و نەتەوەیەك کە بیردەکەنەوە**

**هەر ئەم بەزەیی وسۆزەیە کەهەردووکیان لەپێخەفێکدا کۆدەکاتەوەو ئەو ئەرکانە جێبەجێ دەکەن کەپێیان سپێردراوەو جووت بوون ڕوودەدات**

أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ: ( الأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ. وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ ).

صحيح مسلم ٤٦٦٥ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( گیانەکان سەربازی کارپێدراون جا ئەوانەی کەیەکتریان ناسی ئەوا یەکتر دەگرن وە ئەوانەی کە نامۆبوون جیادەبن لەیەکتری )**

أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم نَهَى عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ يَوْمَ خَيْبَرَ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ. صحيح مسلم بشرح النووي ٣٣٨٩ الحديث الشريف

( بە ڕاستی پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) لەڕۆژی خەیبەر ڕێگە پێنەدانی جووت بوونی ( المتعه ) و نەخواردنی گۆشتی کەری ماڵی ڕاگەیاند)

عَبْدِ اللَّهِ بنِ مُحَمَّدٍ عَنْ أَبِيهِمَا قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ لاِبْنِ عبَّاسٍ رضي اللّهُ عَنْهُمَا : (إِنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم نَهَى عَنْ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ يومَ خَيبرَ). سنن النسائي الصغرى ٤٣٢٢ الحديث الشريف

( بە ڕاستی پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) لە ڕۆژی خەیبەر ڕێگە پێنەدانی جووت بوونی ( المتعه ) ونەخواردنی گۆشتی کەری ماڵی ڕاگەیاند )

الرَّبِيعُ بْنُ سَبْرَةَ الْجُهَنِي، عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللّهِ صلى الله عليه وسلم نَهَى عَنِ الْمُتْعَةِ. وَقَالَ «أَلاَ إِنَّهَا حَرَامٌ مِنْ يَوْمِكُمْ هَـٰذَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ. وَمَنْ كَانَ أَعْطَى شَيْئاً فَلاَ يَأْخُذْهُ». صحيح مسلم ٣٣٨٦ الحديث الشريف

به ڕاستی پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) ڕێگە پێنەدانی جووت بوونی ( المتعه )ی ڕاگەیاند وە ووتی ( جا ئایا ئەو جۆرە جووت بوونە قەدەغەکراو نیە لەسەرتان لە ئیمڕۆوە تاڕۆژی دوایی ؟ جا کێ پێشتر شتێکی داوە باوەری نەگرێتەوەو ( واز لەم کردەوەیە بهێنێ )

لە یاساکانی ئیسلامدا کوڕێك بۆی نیە باوەژنەکەی خۆی مارەبکاتەوە کەواتە ئەگەر پیاوێك ئیمڕۆ ژنێکی بەشێوەی ( المتعه ) مارەکردو دوای تەواوبوونی وادەکەی ئافرەتەکە سەربەست دەبێت ، دوای سەربەست بوونی ئەم ئافرەت ئەگەر کوڕێکی ئەم پیاوە بەشێوەی ( المتعه ) ئەم ئافرەتە مارە بکاتەوە ئەوا دژایەتیەك لەگەڵ ئەم ئایەتەی قورئاندا دروست دەبێت :

وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ
إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ سُورَةُ النِّسَاءِ

وه لـه ئافرەتانـدا ئەوانـه مارەمەكەنـەوە كەباوكـەكانتان مارەيـانكردوون مەگـەر ئەوانەی كەبەسەرياندا تێپەڕیوە بەڕاستی ئەم كارە كارێكی ناشیرین وڕقاوی و ڕێبازێكی خراپە

واتـە ئـەو ئافرەتانـە كـەباوەژنن بۆئێـوە دوای تـەلاق دانیـان یـان دوای مردنـی باوكەكانتان ئێوە مارەیان مەكەنەوە، مەگەر ئەوانەی كە بەسەرياندا تێپەڕیوە لە پـێش هاتنـە خـوارەوەی ئـەم یاسـایە، بەڕاسـتی ئـەم كـارە كـارێكی ناشـیرین و ڕقاوی و ڕێبازێكی خراپە

لـە كاتێـدا لەشـێوازی ( المتعـه ) دا ئـەم ئەگـەرە زۆر نزیكـە كەكوڕەكـە ژنەكـەی دوێنێی باوكی مارەبكاتەوە ، كەواتە ئـەم جۆرەمارەكردنـە بۆكوژانـەوەی گڵێـە و گـڕی ئارەزووەكانـە نـەك بـۆ ئەومەبەسـتەی كەپـەروەردگار مێینـەی بۆنێرینەكـە درووسـتكردووە ، بـۆ پێكـەوەنانی مـاڵ و هێنـانی منـداڵ و بـوون بەمایـەی حەسانەوەو ئارامی، وەكو پەروەردگار دەفەرمووێت

وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا
وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً .......... ﴿٢١﴾ سُورَةُ الرُّومِ

وه لـه بەڵگـەو نیشـانەكانی خـوا ئەوەیـە لەدەروونـەكانی خۆتانـەوە جووتـەكانی بۆئێـوە دروسـتكردووە بۆئـەوەی لـەلای نیشـتەجێبن و سـۆزوبەزەیی خسـتۆتە نێوانتانەوە

خوێنـەری بـەڕێز خـوای گـەورە لـەقورئانی پـیرۆزدا سـنورێكی بـن بـڕی دانـاوە بـەوەی مـرۆڤ بـۆی نیـە لەچـوار ژن زیـاتر بهێنێـت ئـەویش سـنورێكە بـۆ ئـەو مرۆڤانەی كـەئارەزووەكانیان بـەئافرەتێك دانامركێتـەوە ، ئـەوا بۆیـان هەیـە هانـا بـۆ هاوسـەریەتی دووئـافرەت بـەرن ، ئەگـەر دووانـیش بەشـی نـەكردن ، ئـەوا ڕێگـەیان پێـدراوە بیكـەن بەسـێ ، خـۆ ئەگـەر سیانیش بەشی نەكردن ڕێگـەیان پێدراوە بیكەن بەچوار ، هەر ئەم چوارەش بەخۆیانەوە گرفتاربكەن باشترە نـەك هەموو ئافرەتای سەرزەوی ، بۆیە پەروەردگار دەفەرمووێت

وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَىٰ فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ
مَثْنَىٰ وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ
ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَلَّا تَعُولُوا ﴿٣﴾ سُورَةُ النِّسَاءِ

**وه ئهگهر ترسان لهوهی نهتوانن ڕاست ودروست بن لهكاروباری ههتیوهكان ، ئهوا چهندتان پێخۆشه لهژنان بخوازن دوو ، سێ ، چوار وهئهگهر مهترسیتان ههبوو لهوهی نهتوانن دادوهربن لهنێوان ژنهكاندا ، ئهوا یهك ژن یان یهكێك لهو كهنیزكانهی لهژێر دهسهلاتی ئێوهدان ، ئهوهش كهمترین شته بۆئهوهی توشی ستهم نهبن**

**كهواته ئهگهر ترستان لهوه ههبوو كهناتوانن دادوهربن بهرامبهر ئهوههتیوه مێیینانهی كهنیازتان وایه بیانكهن بههاوسهری خۆتان ئهوا واز لهوان بێنن و لهلایهن ئێمهوه بۆتان ههیه ژنێك و دوو سێ و چوار بخوازن ، وه ئهگهر مهترسیتان ههبوو لهوهی كهنهتوانن دادوهربن لهنێوان ئهوهاوسهرانهدا ئهوا یهك هاوسهر یان كهنیزكهیهك لهوانهی لهژێر سێبهری ئێوهدان ئهوه بۆئێوه باشترهو ئهم تاكهژنیهش كهمترین شته بۆئهوهی توشی ستهم نهبن.**

**خوێنهری بهڕێز تۆش باویژدانی خۆت حهكهم بێت لهوهلاّمی ئهم پرسیارانه (ئایا خوا چوار ژنی سهپاندوه بهسهر مرۆڤدا یان مرۆڤی سهربهست كردووه؟ ئایا خوا بۆ مرۆۆ یهك ژنی لهلاباشترنیه وهك لهچوار ژن بۆئهوهی توشی كهمترین ستهم نهبن؟ ئایا مهبهست لهژنێك یان لهكهنیزكهیهك ههر تهنها یهك ژن ناگهیهنێت؟ ئایا ئهوئافرهتهی بۆكوژاندنهوهی گڕی ئارهزووهكانت بۆماوهیهكی دیاریكراو وه بهئهندازهیهكی دیاریكراو له ماڵ و سامانی دونیا بهرهزامهندی ههردووكلا بهكرێی دهگیرێت وهكو دایكی منداڵهكانت وایه؟**

**جا بۆ ئهنجامدانی كاری جووت بوون و دوركهوتنهوه لهمهترسی دهست تێوهردانی جندوكهكان لهمكارهدا پێغهمبهری مهزن دهفهرمووێ:-**

قَالَ رسولُ اللّٰهِ صلى الله عليه وسلم : ( سَتْرُ مَا بَيْنَ الْجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَنِي آدَمَ، إِذَا دَخَلَ الْكَنِيفَ، أَنْ يَقُولَ: بِسْمِ اللّٰهِ ) سنن إبن ماجة ٣١٣

**پێغەمبەری خوا (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی بەربەست لەنێوانی جندوکە و دامێنی ئادەمیزاددا کاتێك دەچێتە پەرژینی جووتبوونەوە ئەوەیە کە بڵێت بسم الله**

**واتە بەگوتنی ( بسم الله ) جندوکەکان ئەو دەوروبەرە بەجێدەهێڵن و دوور دەکەونەوە هەندێك لەجندوکەکان لەکاتی جووت بووندا خۆیان دەکوتنە ناو منداڵدانی ئافرەتەکەوەو کاردەکەنە سەر کۆرپەکە یان لەبەری دەبەن و فرێی دەدەنە دەرەوە**

أَنَّ النبيَّ صلى الله عليه وسلم قال :

(لو أَنَّ أَحدَكُم إِذا أَتى أَهلَهُ قال: بسمِ اللّٰهِ ، اللهمَّ جَنِّبْنا الشيطانَ وَجَنِّبِ الشيطانَ ما رَزَقْتَنا، فقُضِيَ بينهما وَلَدٌ لم يضُرُّهُ ) . صحيح البخاري ١٤١ الحديث الشريف

**پێغەمبەری خوا (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( ئەگەر یەکێك لەئێوە کاتێك دەچێتەلای هاسەرەکەی ووتی : بە ناوی خوا ، ئەی پەروەردگار دورمان خەرەوە لەشەیتان و شەیتانیش دورخەرەوە لەوەی پێت بەخشیوین ، ئینجا ئەگەر خوا لەنێوانیاندا بڕیاری کوڕێکی دا ئەوا شەیتان زیانی پێناگەیەنێت )**

**کاتێك کەتۆوەکە دەگاتە هێلکەکە ئەگەر هەموو هۆکارە بۆماوەی و هەنوکەیەکان یاریدەدەربوون ئەوا پیتێن ڕوودەدات**

**لەئەنجامی پیتاندنی هێلکەکە لەلایەن تۆوەکەوە پێکهاتەیەکی تازە درووست دەبێت پێی دەڵێن (علقە) واتە خۆهەڵواسەر کەلەشێوەی پارچە خوێنێکی مەیو دایە وخۆی بەدیواری منداڵدانەوە هەڵدەواسێت و پەیوەندیەکی لەگەڵدا**

پەیـدادەکات کەلەقۆناغـەکانی داهـاتوودا بەئاشـکراتر دەردەکـەوێت کەدەبێتـە هـۆی وەرگرتنـی خـواردن لەدایکەکـەوەو ڕەدکردنـەوەی پاشـەڕۆکان لـەڕێگای هەمان پەیوەندیەوە کەپێی دەگوترێت (الحبل السری) ناوك کەزۆر جار بەهۆی ڕەدکردنــەوەی پاشــەڕۆکانەوە وا لەدایکەکــە دەکــات توشــی ڕشــانەوەو دڵ تێکهەڵاتن ببێت کەئەمەش لەناو ئافرەتاندا نیشانەی سەرەتای سکپڕبوونە.

ئەم خۆهەڵواسەرە (علقە) بارستایەکەی نزیکـەی ( ٠،٠٠٠٠٠٣گـرام ) واتـە سێ بەش لەیەك ملیۆن بەش لەگرامێك دەبێت و گەشەکردنەکەی زۆر خێرایە

( زیندەوەرزانی ل ١٥٩ )



تۆوی مرۆڤ


هێلکەی مرۆڤ

( زیندەوەرزانی ل ١٢٦)

دوای چـل ڕۆژ لەگەشــە ئــەم خۆهەڵواســەرە دەبێــت بــە پارچــە گۆشــتێك کــە بتوانرێت بجورێت (مضغة) ، کەبەردەوام دەبێت لە گەشەکردن تاماوەی چل ڕۆژ ئینجا دەبێت بە پارچەیەك ئێسك ، ئەم پارچە ئێسکەش گەشەدەکات و ئینجا لەلایـەن پـەروەردگارەوە شـێوەی ئـەو ئـادەمیزادەی دەدرێتـیّ کـەخۆی لـەقوڕ دروستیکرد

وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾

وەبە دڵنیاییەوە ئێمە ئادەمیزادمان دروستکرد لەقوڕێکی پاککراوە




هێلکە دان و گواستنەوەی هێلکە بۆ ناو منداڵدان

لەو قوڕە پاك کراوەیە ئادەم دروستکرا  وە لەدەرەوونی ئادەم حەوا دروستکرا. وە لە ئەنجامی خواردن و خواردنەوە و بەردەوام بوونی ژیان هێلکەو تۆوەکان پەیدابوون وکێڵگەکە کەوتەکار

ثُمَّ جَعَلْنَٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾

ئینجا کردمان بەئاوێك لەبارێکی بەتوانادا

ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ المؤمنون

ئینجا لەو ئاوە پارچە خوێنێکی مەیومان دروستکرد ئینجا لەوپارچە خوێنە مەیوە پارچە گۆشتێکمان دروستکرد ( وەکو ئەو گۆشتەی کەبجورێت ) ئینجا لەو پارچەگۆشتە جوراوە ئێسقانەکانمان دروستکرد ئینجا ئێسقانەکانمان بەگۆشت داپۆشین ئینجا دامانمەزراند بەشێوەی دروستکراوێکی تر، جا پیرۆزی بۆ ئەو خوایەی کە باشترین دروستکەرە لەنێوان دروست کەرەکاندا



**کۆرپە لەناو کیسەی وێڵاش دا**

يَخۡلُقُكُمۡ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ خَلۡقٗا مِّنۢ بَعۡدِ خَلۡقٖ فِي ظُلُمَٰتٖ ثَلَٰثٖۚ ﴿٦﴾ الزمر

**دروستان دەکات لەناو سکی دایکەکانتاندا دروستکردن دوای دروستکردن لەناو سێ تاریکاییدا**

**تاریکایی یەکەم ناوسکی دایکەکەیە ،تاریکایی دووەم ناومنداڵدانی دایکەکەیە، تاریکایی سێهەم ناو کیسەی وێڵاشە کەمنداڵەکەی تێدایە**

وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ وَهۡنًا عَلَىٰ وَهۡنٖ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيۡنِ ﴿١٤﴾ لقمان

**وە مرۆڤمان ڕاسپاردووە بە ئاگاداری کردنی باوانی، دایکی لاوازی لەدوای لاوازی لەسکیدا هەڵیگرت وە لەدووساڵدا شیری پێدەدرێ وبەخێودەکرێ**

وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ إِحۡسَٰنًاۖ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ كُرۡهٗا وَوَضَعَتۡهُ كُرۡهٗاۖ وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهۡرًاۚ ﴿١٥﴾ سُورَةُ الأَحْقَافِ

وە ئێمە ئادەمیزادمان ڕاسپاردووە چاکەکەربێت بۆباوك ودایکی، بە ئێش و ژانەوە دایکی لەسکیدا هەڵیگرت وە بەئێش وژانەوە داینا وەماوەی سك پڕی و شیر پێدان و بەخێوکردنی سی مانگن .( 30 سی مانگ )

ئینجا بۆناسینی کۆرپەکە ناوێکی لێدەندرێت ، ناوەکان کامەیان خۆشن؟ کامەیان ناوی بەهێز و بەختەوەرن ؟ کامەیان پەروەردگار خۆشی دەون ؟

عن ابنِ عُمَرَ قالَ قالَ رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم : (أَحَبُّ الأَسمَاءِ إِلَى الله عَزَّ وجَلَّ عبدُ الله وَعبدُ الرَّحمَنِ ).

ابن قيم الجوزية في شرح سنن أبي داوود ٤٩٤١ الحديث الشريف

پێغەمبەری خوا (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی : ( عبداللە و عبدالرحمن خۆشەویسترینی ناوەکانن لەلای خوای گەورە )

قالَ رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم : ( إِنَّكُم تُدعَونَ يَومَ القِيَامَةِ بِأَسمَائِكُم وأَسمَاءِ آبَائِكُم فأَحسِنُوا أَسمَاءَكُم ). ابن قيم الجوزية في شرح سنن أبي داوود ، ٤٩٤ الحديث الشريف

پێغەمبەری خوا (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( ئێوە ڕۆژی دوایی بەناوی خۆتان وباوکەکانتانەوە بانگدەکرێن جا ناوی چاك بۆخۆتان دابنێن )

کەواتە ناویش یەکێکە لەو تایبەتمەندیانەی مرۆڤ کەدەگوازرێتەوە بۆقۆناغی بوونی ڕۆژی دوایی

قالَ رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم : ( تَسَمَّوا بِأَسمَاءِ الأَنبِيَاءِ، وَأَحَبُّ الأَسمَاءِ إِلَى الله عَبدُ الله وَعبدُ الرَّحمَنِ وَأَصدَقُهَا حَارِثٌ وهَمَّامٌ، وأَقبَحُهَا حَربٌ ومُرَّةٌ ).

ابن قيم الجوزية في شرح سنن أبي داوود ٤٩٤٢ الحديث الشريف

( بـه نـاوی پێغەمبەرەکانـەوە نـاوبنێن وە ناوەکـانی عبداللـه و عبـدالرحمن خۆشەویسترینی ناوەکانن لەلای خوا ، وە ڕاستگۆ ترینیـان حارث و همام ، وە حەرب و موڕڕە ناخۆشترین و بەدترینیانن )

وَٱلۡوَٰلِدَٰتُ يُرۡضِعۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ حَوۡلَيۡنِ كَامِلَيۡنِۖ
لِمَنۡ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ (٢٣٣) سُورَةُ البَقَرَةِ

وە دایکـەکان دووسـاڵی تـەواو شـیر دەدەن بەمنـداڵکانیان بۆئەوانـەی کـە دەیانەوێت شیرپێدانەکە تەواوبکەن

دووساڵ و شەش مانگ بۆ سکپڕی و شیر پێدان ، دووساڵی تەواویش بۆشیر پێـدان و بـەخێوکردن ، جیـاوازی نێوانیـان دەکاتـە شـەش مـانگ کـە کـەمترین مـاوەی سـك پڕیـە لەیاسـاکانی ئیسـلامدا بۆئـەوەی ئەگـەر ئەوئافرەتـەی دوای شوکردن بەشەش مانگ منداڵی بوو تۆمەتی خراپەی بۆهەڵنەبەسترێ بەوەی کە پێش شوکردنەکە کارێکی خراپی کردبێت ( تفسیر ابن كثیر ١٥ الاحقاف )

بەڵام ڕێژەی ئەم چۆرە ئافرەتانـەش لـەنێو کۆمەڵگادا یـەجگار کەمـەو مـاوە سك پـڕی لـە نێـوان ئافرەتانـدا بەشـێوەیەکی گشـتی نۆمـانگ و چـەند ڕۆژێکـە ، هەرچەندە لەیاساکانی ئیسلامدا کەمینەیەکی تریش لـەئافرەتان دەست نیشـان کـراون کـەماوەی سـکپڕیەکەیان درێـژ دەبێتـەوە بۆچـەند سـاڵێك واتـە ماوەکـە لەشـەش مانگیـەوە بـۆ چـەند سـاڵێکە بـەڵام لەزۆرینـەی هـەرەزۆری ئافرەتانـدا نۆمانگ وچەند ڕۆژێکە

عن عبد الله قال: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللّٰه صلى الله عليه وسلم، وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ : ( إِنَّ أَحَدَكُمْ يجمعُ خلقهُ فِي بطنِ أُمِّه أَربعينَ يوماً. ثُمَّ يكُونُ فِي ذَلِكَ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ. ثُمَّ يَكُونُ فِي ذَلِكَ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ. ثُمَّ يرسَلُ الْمَلَكُ فينفخُ فيهِ الرُّوحَ ) صحيح مسلم ٦٦٦٩ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) کە ئەو ڕاستگۆیەکی باوەڕپێکراوە فەرمووی هەر یەکێك لەئێوە لەماوە چل ڕۆژدا دروستکردنەکەی کۆدەکرێتەوە لەسکی دایکیدا ئینجا لەم کۆکراوەیە (علقە) پێکدێت وەکوئەو لەماوەی چل ڕۆژدا ئینجا لەو (علقە) یە ( مضغة ) پێکدێت وەکوئەو لەماوەی چل ڕۆژدا ئینجا فریشتەیەك دەنێردرێت گیانی بەبەردا دەکات

کەواتە ماوەی گەشە کردنی هێلکە پیتێندراوە کە = ٤٠ ڕۆژ
بە هەمان شێوە ماوەی گەشەکردنی ( علقە) کە = ٤٠ ڕۆژ
بە هەمان شێوە ماوەی گەشەکردنی ( مضغة ) کە = ٤٠ ڕۆژ
کۆی ماوەی ئەم سێ قۆناغە = ١٢٠ ڕۆژ

(١٢٠) ڕۆژ بەکاتی مانگەکانی کۆچی دەکاتە چوار مانگ و چەند ڕۆژێك کە لێرەوە گیان بەبەر کۆرپەکەدا دەکرێت و ئافرەتەکە هەست بەجوولەی کۆرپەکەی دەکات هەر لەسەر ئەوبنەمایەشە درێژترین ماوەی ماتەمینی چوار مانگ ودە ڕۆژە بۆئافرەتێك کەهاوسەرەکەی مردبێت بۆ ئەوەی لەم ماوەیەدا ڕوون ببێتەوە کەئافرەتەکە سکی هەیە یان نا

عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ قَالَتْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلَاثٍ إِلَّا عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ۞ حديث رقم ٨٦٢ : البيان

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) دەفەرموێت : ڕەوانیە بۆئافرەتێك باوەڕ بەخواو ڕۆژی دوایی بێنێ و لە سێ ڕۆژ زیاتر ماتەمینی دانێت لەسەر مردوویەك مەگەر لەسەرمێردەکەی چوار مانگ و دە ڕۆژان

وە کو لەپێشەوە ڕوونمانکردەوە لەوماوەیەدا ئافرەتەکە تێدەگات کە لەپیاوە مردووەکەی سکی هەیە یان نا ، چونکە ئەگەر لەڕێگەی توێژینەوەشەوە نەبێت ئەوا بەهۆی جوولەی کۆرپەکەوە دەزانرێت کەئافرەتەکە دووگیانە یان نا




چەند زنجیرە یەکی کۆرپە لە ی بڕ بڕە دارەکان لە سێ قۆناغی دوا بە دوا دا

ئینجا لەو ئاوە پارچە خوێنێکی مەیومان دروستکرد ئینجا لەوپارچە خوێنە مەیوە پارچە گۆشتێکمان دروستکرد ( وەکو ئەو گۆشتەی کە بجورێت ) ئینجا لەو پارچە گۆشتە جوراوە ئێسقانەکانمان دروستکرد ئینجا ئێسقانەکانمان بە گۆشت داپۆشین ئینجا دامان مەزراند بەشێوەی دروستکراوێکی تر

خوێنەری بەڕێز بەووردی سەرنجی ئەم وێنەیە بدەو تەماشاکە بزانە لەکوی کۆرپەکە شەرەفی ئەوەی پێدراوە کەوەکو ئادەمیزاد دەرکەوێت ، سەرەتای بەدەرکەوتنی هەموو گیانەوەرەکان لەقۆناغی یەکەمدا لەیەکتری دەچن و لە قۆناغی دووەمدا ئاشکراتر دەردەکەون وە لەقۆناغی سێهەمدا دەتوانیت لەیەکتریان جیابکەیتەوە




**گەشەی خانە**

کۆرپەکە لە گەشەدایە بەقەبارەیەکی بچوك کراوەی لاشەی ئادەمیزاد بۆئەوەی لەکاتی لەدایك بووندا دایکەکە توشی نەهامەتی و گیان لەدەستدان نەبێت بۆیە گەشەی هەموو ئەندام و کۆئەندامەکانی کۆرپەکە لەناو سکی دایکیدا بەپێی ئەو زانیاریانەی کەپەروەردگار لەزانستە بۆماوەیەکاندا بەم ئەندام و کۆئەندامانەی داوە تاسنورێکی دیاریکراوە گەشەکردنی کۆرپەکە لەناو مندالدانەدا خێراترە وەك دوای لەدایك بوون ، ئەوەتا لەماوەی نۆ مانگ وچەند ڕۆژێکدا ئەم کۆرپەیە لەتۆو وهێلکەیەکەوە دەبێت بەنزیکەی دوو بلیۆن خانە ( ۲ × ۱۰ )۱۲ و کاتێك کە لە سەرەتادا بارستاییەکەی لە سێ بەش لە ملیۆنێك

بەش لە گرامێك ( ٣ \ ١٠٠٠٠٠٠ ) گم تێنەدەپەڕی ، لە كاتی لەدایك بووندا دەبێت بەنزیكەی (٣٠٠٠ ) گرام .( زیندەوەرزانی ل ١٥٩ )

دوای ئەوەی هەموو قۆناغەكانی دروستبوونی كۆرپەو گەشە كردنەكەی تەواو دەبن، كۆرپەكە خۆی ئامادە دەكات بۆهاتنەدەرەوە بۆ ئەم مەبەستە كۆرپەكە خۆی هەڵدەگێڕێتەوەو سەربەرەو خوار هەوڵی هاتنە خوارەوە دەدات ، گەورەیی بۆ ئەودروستكەرەی كە ئەوزانستەی داوە بەكۆرپەكە چونكە ئەگەر سەر بەرەوخوار نەیەتەخوارەوە خۆیشی و دایكەكەشی توشی هیلاكی و نەهامەتی دەبن.

لە كاتی دیاری كراوی خۆیدا بەبێ دواكەوتن كۆرپەكە كیسەی وێڵاشەكە دەدڕێنێ و ئەوشلەیەی كەتێیدایەتی دێتە خوارەوە كەڕێگە خۆشكەرێكە بۆئاسان هاتنەخوارەوەی كۆرپەكە دوابەدوا خۆیشی بەرەوخوارەوە دەخزێت و دێتەدەرەوەو ئەو پەتی پەیوەندیەی نێوان دایك وكۆرپەكەی كەپێی دەگوترێت ناوك دەبڕدرێت و كۆرپەكە سەربەست دەبێت و بەپێی ئەوزانیاریانەی كەپێی دراون ئەندامەكانی لەشی دەكەونە كاركردن بۆ ژیان لەسەرزەوی ، شتێكی سەرنج ڕاكێشە كە ئەوكۆرپەیە چەند مانگ و چەند ڕۆژێكە لەناوسكی دایكیدا بێدەنگەو هەر كە لەدایكبوو دەستدەكات بەگریان وهاوار

أنَّ النبيَّ صلى الله عليه وسلم قال: ( ما مِن مَولودٍ يولدُ إلاَّ والشيطانُ يمسُّهُ حين يولدُ ، فَيستهلُّ صارخاً مِن مَسِّ الشيطان إياه ، إلاَّ مريم وابنها ) .

فتح الباري بشرح صحيح البخاري ٣٧٨ ٤ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی هیچ لەدایك بوویەك لەدایك نابێت مەگەر شەیتان هەر دەستی دەداتێ كاتێك كە لەدایكدەبێت ، جا دەست بە هاوار دەكات لە دەستلێدانی شەیتان بۆی ، تەنها مریەم وكوڕەكەی نەبێت )

واتا تەنهاپێغەمبەری مەزنمان عیسی ودایكی نەبێت (سڵاوی خوایان لێبێت )

دوابە دوا كیسەی وێڵاشەكەش دێتە دەرەوە

دایکەکە لەئەنجامی جیابوونەوەی کۆرپەکەدا توشی ئێش وئازارێکی زۆر و بێهێزی دەبێت، بۆیە پەروەردگار لەڕێگەی لەدایکبوونی پێغەمبەری مەزنمان عیسای کوڕی مریەمەوە بەئافرتان ڕادەگەیەنێت کەئافرەتەکان لەدوای منداڵ بوون یا لەبەری داری خورما بخۆن

وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ﴿٢٥﴾ سُورَةُ مَرۡيَمَ

عیسا بەدایکی(سلاوی خوایان لێبێت ) ووت : وە قەدی دارخورماکە بۆلای خۆت ڕاوەشێنە خورمای چندراوەت بەسەردا دێتەخوارێ

لێرەدا خوا بۆمان ڕوون دەکاتەوە کەدیارە ئافرەتان لەئێش وئازارێکی زۆردان لەکاتی منداڵبووندا بۆیە عیسای پیرۆز بەدایکی دەڵێت دارخورماکە بۆلای خۆت ڕاوەشێنە بۆئەوەی قلەخورماکان بەسەرتدا بەرببنەوە چونکە پاڵ پێوە نان وڕاوەشاندنی دارخورماکە بەلاکەی تردا زۆربەی قلە خورماکان بەلاکەی تردا دەخات کەدەبێتە مایەی دوورکەوتنەوەیان لەوکاتەدا کەمریەم لەوپەڕی ئێش وئازاردایە

وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٧٨﴾ سُورَةُ النَّحۡلِ

وە خوا ئێوەی لەناوسکی دایکەکانتان هێناوەتەدەرەوە هیچ شتێك نازانن وە بیستن وچاوەکان ودڵەکانی بۆئێوە دابین کردووە ، ئومێدوایە ئێوە سوپاس وستایشی بکەن.

کۆرپەکە لەدایکبوو لەماوەی چل ڕۆژدا بەتەواوی لەگەڵ ژیانی سەرزەوی ئاشنادەبێت وچاو دەگێڕێ وگوێ بیستی دەنگە بەرزەکان دەبێت وناڕەحەتە پێیان بۆیە لەگەڵ ڕوودانی دەنگێکی بەرزدا ڕادەچڵەکێ و دەستدەکات بەگریان لەماوەی ئەم چل ڕۆژەدا باری جەستەی دایکەکە دێتەوە باری ئاسایی ومنداڵدان خۆی ئامادەدەکاتەوە وهێلکەدانیش کەلەماوەی سکپڕیدا

**لەناردنـەخوارەوەی هێلکـە وەسـتابوو دەسـت بەناردنـەخوارەوەی هێلکـەکان دەکاتەوەو سەرەتای سکپڕبوونێکی تر دەستپێدەکات**

عن ابنِ عباسٍ قالَ: تنتظرُ النفساءُ أربعين يوماً أو نحوَهَا.

سنن الدرامي ٩٥٩ الحديث الشريف

**لە(ابن عباس )ەوە ( سلاوی خوا لە هەردوکیان ) فەرمووی :( ئافرەتە زەیستانەکان چـل ڕۆژ یـان دەوروبـەری چـل ڕۆژ چـاوەڕوان دەکـەن ( لـە جێبـەجیٚ کردنـی ئەرکەکانی سەرشانیان بۆکاری جووت بوون تاپاکدەبنەوە ).**

**وەکو باسمانکرد ماوەی شیردان بەکۆرپەکە دوو ساڵە ، شیری هـەموو ئافرەتێك بۆهەموو کۆرپەیەك دەبێت بەڵام شیری دایکەکەی تایبەتە بەکۆرپەکەی خۆیەوە، چونکە پـەیتی شیرەکە لەگـەڵ تەمـەنی کۆرپەکـەدا دەگۆڕێت شیردان بناغـەی دووەمـی بنیـات نـانی جەسـتە ودەروونـی کۆرپەکەیـە ، شـیر پێـدانی مـەمکی ئافرەتێك بۆکۆرپەیـەکی تـر کەلـەئافرەتێکی تربێـت دەبێتـە هـۆی هانـدانی نزیك بوونەوەی پێکهاتـەی جەستەو نزیکبوونـەوەی ئـەم کۆرپەیـە لەگـەڵ هـەموو ئـەو منداڵانەی کەشیری مەمکی ئەم ئافرەتەیان خواردبێت .**

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم :(يَحرمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يحرمُ مِن النَّسَبِ)

سنن إبن ماجة ١٩٩٠ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) فەرمووی : ئەوەی لەپەیوەندیەکانی خزمایەتیدا ڕێگەی پێنەدراوە لەپەیوەندیەکانی شیر خواردنیشدا ڕێگەی پێنادرێت هەر وەکو چۆن لەپەیوەنـدی خێزانیـدا بۆکـاری جـووت بـوون هەمووخوشك وبراکـان لەیـەکتری قدەغـەکراون بەهـەمان شـێوە هەرکۆرپەیـەکی تـر لەشـیری ئەودایکـە بخوات لەهەموو منداڵەکانی ئەم ئافرەتە قەدەغە دەکرێت بۆکاری جووت بوون کاریگـەری بۆمـاوەزانی ( الوراثـە ) لەسـەر دروسـتبوونی تـۆو وهێلکـەو دوابـەدواش لەسـەر دروسـتبوونی کۆرپـە هـیچ گومانێـك ناهێڵنـەوە لـەوەی**

کەئێمەی ئادەمیزاد کۆکراوەی لاشەکەمان بەم شێوەیە دەگەڕێتەوە بۆیەکەم نێرینە و یەکەم مێینە کەئادەم و حەوان
یەکەی گواستنەوەی ڕەوشتە بۆماوەیەکان پێیدەگوترێت بۆهێلْ ( جین ) کە لەسەر کرۆمۆسۆمەکان جێگیرن ژمارەی کرۆمۆسۆمەکان لەخانەکانی لەشی گیانەوەران وڕووەك وگەمیتەکاندا بەم شێوەیەی خوارەوەیە. (پندەوەرزانی ٢٤٩)

| زیندە وە رە کا ن | ژمارەی کرۆمۆسۆمەکا ن لە خانەی لەشدا | ژمارەی کرۆمۆسۆمەکا ن لە گەمیت دا |
|---|---|---|
| مرۆڤ | ٤٦ | ٢٣ |
| کەروێشك | ٤٤ | ٢٢ |
| سەگ | ٧٨ | ٣٩ |
| گەنم | ١٤ | ٧ |
| گەنمە شامی | ٢٠ | ١٠ |
| مێشی میوە | ٨ | ٤ |

واتە لە ئەنجامی یەکگرتنی دوو گەمیتدا ئەوا تەواوکارییەك پێکدێت بەکۆبوونەوەی ژمارەی کرۆمۆسۆمی هەردووکلا لەپێکهاتەیەکی تازەدا کە ڕەوشت و تایبەتمەندییەکانی هەر دووك لای تێدایە لەژێرکاریگەری زاڵبوونی ڕەوشتە زاڵەکان بەسەر ڕەوشتە بەزیوەکاندا کەواتە هیچ بوارێك نیە کەتیایدا گەنم بکرێت بەگەنمە شامی یان مرۆۋ بکرێت بەکەروێشك ، بەلاٚم دەکرێت لەهەمان ڕەگەز جۆری چاکتروخراپتر پەیدابێت

(پندەوەرزانی ٢٨٧ )

| ڕه وشتی زاڵ | ڕه وشتی بەزیو |
| --- | --- |
| ڕەنگی ڕەش یا ن قاوەیی | ڕەنگی سور یا ن زە رد |
| چاوی ڕەش یا ن قاوەیی | چاوی سەوز یا ن شین |
| دەرکەوتنی خاڵ | دە رنەکەوتنی |
| ئارەق کردنەوەی زۆر | ئارەق کردنەوەی سروشتی |
| بەرز بونەوەی لەوژمی خوێن | لەوژمی سروشتی |

دوای دۆزینـــەوەی گــەردی ناوکــە ترشـــی ( DNA )دەرکــەوت ئــەم ترشــە بنچینەیەکە بۆدروستبوونی بۆهێڵەکان ( جینات )ی سەر کرۆمۆسۆمەکان

( زیندەوەرزانی / بۆماوەزانی ل٢٢٨)

هەر بۆیە لەئەنجامی توێژینەوە لەسەر ئەم ترشە دەتوانرێت تایبەتمەندی و پێکهاتەکانی ئەم کەسە بناسرێتەوە

حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُ قَالَ :

سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيهِ وَسَلَّم يَقُولُ قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنْ ذَهَبَ يَخْلُقُ كَخَلْقِي فَلْيَخْلُقُوا ذَرَّةً أَوْ لِيَخْلُقُوا حَبَّةً أَوْ لِيَخْلُقُوا شَعِيرَةً ۞ حديث رقم ١٢٤٠ البيان

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـوای لێ بێـت) ووتــی گـوێم لـە پێغەمبـەری خـوا بـوو (سلاوی خوای لێبێت) دەیفەرموو: (خـوای گـەورە فـەرمووی کـێ لەوکەسـە تـاوان کـەرترە کەدەچـێت دروسـتکراوێك لەشـێوەی دروسـتکراوەکانی مـن دروسـت دەکـات؟ ئەگــەر پێیانــدەکرێ باگەردیلەیــەك دروسـتبکەن یــان بادەنکــەدانێك دروستبکەن یان بادەنکە چۆیەك دروستبکەن )!؟

لـە ڕێـی زانسـتەکانی بۆماوەزانیـەوە دەتوانـدرێت لـە تاقیگەکانـدا مـرۆڤ بگاتـە بۆهێڵەکان (جینات) و بۆهێڵە نەخۆشەکان چارەسەربکات وبەهێزیان بکاتەوە، هەوەها لەڕێگەی لێکپەڕاندنی نێرینەو مێینەی جیاجیاوە دەتواندرێت شێوەی

باشتر لەهەمان جۆر دروستبکرێت بەڵام هەرگیز ناتواندرێت گوێزێك بکرێت بە سێوێك یان پرتەقاڵێك

ئەو پێکهاتە تازەیەی کەهەڵگری ڕەوشتی هەردووکلایە ڕەوشتە زاڵەکان بە ئاشکرا تیایدا دەردەکەون ئەمەش مانای ئەوە نیە کەڕەوشتە بەزیوەکان دەفەوتێن و نامێنن بەڵکو بەشاراوەیی لەجەستەی ئەم پێکهاتەیەدا دەمێننەوەو دوای کامڵ بوونیانیان ئەگەر تۆوەکەیان یان هێلکەکەیان لەگەڵ تۆو یان هێلکەیەکی ڕەوشت بەزیوی وەك خۆیان یەکیانگرت ئەوا لەکۆرپە تازەکەدا ڕەوشتە بەزیوەکان دەردەکەونەوە .

گوڵێکی دەمەشێری سپی یەك ڕەگ لێکبدرێت لەگەڵ گوڵێکی دەمەشێری سوری یەك ڕەگ ئەوا تۆوە پەیدابوەکان کەخوشك وبرای یەکترین و لەیەك دایك و باوکن هەموویان ڕەنگەکەیان پەمەیی دەبێت ئینجا ئەگەر بێت و ئەم خوشك و برایانە لەنێوان خۆیاندا جووت بکرێن و تۆوەکانیان لێك بدرێن ئەوا ئەو وەچانەی لەوان پەیدا دەبن بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت




(زیندەوەرزانی ل ٢٥٠)

٥٠٪ وەکو دایك و باوکەکانیان دەردەچن واتە ڕەنگ پەمەیی دەبن

٢٥٪ وەکو نەنکیان دەردەچنەوە واتە ڕەنگ سپی دەبن

٢٥٪ وەکو باپیریان دەردەچنەوە واتە ڕەنگ سور دەبن




کەواتە لە نێوان نەنکێك وباپیرێك ٥٠٪ ی نەوەکانیان بەتەواوی بەیەکتر دەچن وجیاوازن لەباپیرە ونەنکیان ودەچنەوە سەر دایك و باوکەکانیان هەروەها ٢٥٪ی نەوەکانیان بەیەکتری دەچن و دەچنەوە سەر باپیرەیان هەروەها ٢٥٪ ی نەوەکانیان بەیەکتری دەچن ودەچنەوە سەر نەنکەکەیان هەر لەسەر ئەم بنەمازانستیەشە کەپەروەردگار ئەونێرەو مێینانەی لەیەکتر قەدەغەکردوون وەکو دەفەرمووێت

حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَـٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ
وَعَمَّـٰتُكُمْ وَخَـٰلَـٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ

لێتـان قەدەغـەکراوە دایکـەکانتان و کـچەکانتان و خوشـکەکانتان و پورەکانتـان (خوشـکی بـاوك )وپورەکانتـان(خوشـکی دایـك ) وکـچەکانی بـرا وکـچەکانی خوشك........

وَأُمَّهَٰتُكُمُ ٱلَّٰتِيٓ أَرۡضَعۡنَكُمۡ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَٰعَةِ وَأُمَّهَٰتُ نِسَآئِكُمۡ

وە ئـەو دایەنانـەی کـە شـیریان پێـداون وە خوشـکەکانتان لەشـیرخواردندا وە دایکی خێزانەکانتان

وَرَبَٰٓئِبُكُمُ ٱلَّٰتِي فِي حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّٰتِي دَخَلۡتُم بِهِنَّ

وەئەو کچانەی کە لەماڵەکانی ئێوەدان هی ئەوئافرەتانەن کەچوونە پاڵیان.....
واتە ئەو بێوە ژنانەن کەئێوە مارەتان کردونەتەوەوچونەتەپاڵیان وکاری جووت بوونتـان لەگـەڵکردون ئـەوا کـچەکانی ئەوبێوەژنانـە کەلەگـەڵ دایکەکـەیان لـە ماڵەکانی ئێوەدان لەئێوە قەدەغەکراون

فَإِن لَّمۡ تَكُونُواْ دَخَلۡتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ

ئینجا ئەگەر وانەبووبێ کەچوبنەلایان ئەوا تاوانتان لەسەرنیە
واتـە ئینجـا ئەگـەر نەچـوبنە پـاڵ ئەوئافرەتانـە واتـە نـەبوبن بـەخێزانتان ئـەوا تاوانتان لە سەرنیە ......( واتە ئەگەر ئافرەتەکە لە ئەستۆی ئێوەدا نـەما ، مـرد یـان دەسـتت لێـی هـەڵگرت پـێش ئـەوەی جووبیتـە لای ئـەوا تاوانتـان لەسـەرنیە کەکچی ئەوئافرەتانە بکەن بەهاوسەری خۆتان )

وَحَلَٰٓئِلُ أَبۡنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنۡ أَصۡلَٰبِكُمۡ وَأَن تَجۡمَعُواْ بَيۡنَ ٱلۡأُخۡتَيۡنِ
إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٢٣﴾ سُورَةُ النِّسَاءِ

وە هـەروەها لێتـان قەدەغـەکراوە خێزانـی کوڕەکانتـان کەلەپـشتی خۆتـانن ، وە کـە دووخوشـك لـە یەککاتـدا بکـەن بەهاوسـەری خۆتـان ، مەگـەر ئەوانـەی کـە تێپەڕیون بەڕاستی خوا لێبوردەو خاوەن بەزەییە

وَلَا تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدۡ سَلَفَۚ
إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَمَقۡتٗا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ سُورَةُ النِّسَاءِ

**وه له ئافره‌تاندا ئه‌وانه ماره مه‌كه‌نه‌وه كه‌باوكه‌كانتان ماره‌یان كردوون مه‌گه‌ر ئه‌وانه‌ی كه‌به‌سه‌ریاندا تێپه‌ڕیوه، به‌ڕاستی ئه‌م كاره كارێكی ناشیرین و ڕقاوی وڕێبازێكی خراپه**

**ئه‌گه‌ر پیاوێك خوێنه‌كه‌ی له كۆمه‌ڵه‌ی(A)بوو ژنێكی هێنا له‌كۆمه‌ڵه‌ی (B) بوو ئه‌وا ئه‌گه‌ری په‌یدا بوونی گروپه‌كانی خوێن له منداڵه‌كانیاندا به‌م شێوه‌یه‌ی خواره‌وه ده‌بێت :- ٢٥٪ كروپی ( A ) ٢٥٪ گروپی (B) ٢٥٪ گروپی (A B) ، ٢٥٪ گروپی (O) ئه‌م گروپی (A B) ، (O)یه له كوێوه هاتن ئه‌گه‌ر به شاراوه‌یی له ناوخوێنی باوك ودایكه‌كه‌دا نه‌بوبێت ؟**

( زینده‌وه‌رزانی ل ٢٥٧ )



لێرەدا نمونەیەکی تری کاری بۆماوەیی دەخەینەڕوو کە لەئەنجامی جووت بوونی ئافرەتێکی سپی پێست وپیاوێکی پێست ڕەشدا دەردەکەوێت



چوار پیتی گەورە مانای ڕەنگە زاڵەکە دەگەیەنێت کەڕەشە ، چوارپیتی بچوك مانا ڕەنگە بەزیوەکە دەگەیەنێت کە سپیە ، دووپیتی گەورە ودوو پیتی بچوك مانای مام ناوەندی ویەکسانی ڕەنگە زاڵەکە وڕەنگە بەزیوەکە دەگیەنێت هەریەکەیان بەڕێژەی ٥٠٪ ، سێ پیتی گەورە لەگەڵ پیتێکی بچوك مانای ٧٥٪ ی ڕەنگە زاڵەکە و ٢٥٪ ی ڕەنگە بەزیوەکە دەگەیەنێت کە ڕەشێکی کاڵ ( ئەسمەر ) دەردەچێت ، سێ پیتی بچوك ویەك پیتی گەورە مانای ٧٥٪ی

ڕەنگە بەزیوەکەیەو ٢٥٪ ی ڕەنگە زاڵەکەدەگەیەنێت کەڕەنگێکی کاڵ ( بۆر ) دەردەچێت زیاتر بەلای سپیدایە

وە مارەکردن وجووت بوون لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە لەسەرەوە باسمانکردن کارێکی ناشیرین و ڕقاوی ئاژەڵی ودژ بەمرۆڤایەتیە وکاریگەریەکەشی لەبوارە بۆماوەیەکاندا دەبێتە هۆی شڵەژانی باری کۆمەلایەتی لەناو کۆمەڵگادا هەر وەکو لەنمونەی گوڵی دەمەشێرەکەدا باسمانکرد، ئەگەر کوڕێك خوشکەکەی خۆی بکات بەهاوسەری خۆی ئەوا ٥٠٪ ی منداڵەکانیان دەچنەوە سەرخۆیان وە ٢٥ ٪ ی منداڵەکانیان دەچنەوە سەرنەنکیان وە ٢٥٪ ی منداڵکانیان دەچنەوە سەر باپیرەیان، وواتە ڕێژەیەکی زۆری ئەونەوانەی کەپەیدادەبن لەئەنجامی ژن ومێردایەتی خوشك وبرایەکدا لەیەکتری دەچن ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە تاوانکەرێك لەناویاندا نەدۆزرێتەوە و بێتاوانێك توشی سزاکەی ئەوببێت

ئەگەر کوڕێك دایکی خۆی بکات بەهاوسەری خۆی ئەوا ئەومندالانە کەلەنێوانیان پەیدادەبن ڕێژەیەکیان دەچنەوە سەر دایکەکە وڕێژەیەکیان دەچنەوە سەر کوڕەکە بەهەمان شێوە هەموو ئەوانەی کەناوبران و لەتۆ قەدەغەکراون ئەگەری پەیدابووبی نەوەکان کە لەخۆتان بچن ئەگەرێکی یەجگار نزیکە، هەروەها کارێکی گرانەو باری دەروونی مرۆڤ ڕێگەی پێنادات

وەکاتێك گایەکی سوری یەك ڕەگ لەگەڵ مانگایەکی سپی یەك ڕەگ جووت دەبن ، ئەوا ئەو گوێلك وجوانە گایانەی کەلەوان پەیدادەبن هیچیان ڕەنگیان سپی و هیچیشیان سورنین بەڵکو هەموویان تۆز ڕەنگ دەردەچن ڕەنگە سورەکەی باوکیان و ڕەنگە سپیەکەی دایکیان بەشاراوەیی دەمێنێتەوە، لەکاتی جووت بوونی نێرەو مێیەیەك لەو تۆزڕەنگانە ڕەنگی دایەگەورە و بابە گەورە لەناویاندا دەردەکەوێتەوە.

ئایا ئەم هەموو ووردەکاریە بەڕێکەوت و بێبەرنامە هاتۆتە کایەوە؟

( زیندەوەر زانی ل ٢٥٣ )




خوێنەری بەڕێز بەووردی سەرنج بدە گایەکی سوری یەك ڕەگ لەگەڵ مانگایەکی سپی یەك ڕەگ لەیەکبدرێن تاکەکانی وەچەی یەکەم کەخوشك و

برای یەکترین هەموویان تۆزڕەنگ دەردەچن بەنێرومێوە ، ئینجا ئەگەر ئەم خوشك و برا تۆز ڕەنگانە لەیەکتری بپەڕێندرێن ئەوا تاکەکانی وەچەی دووەم کە نەوەکانن بەم شێوەیەی خوارەوە دەبن :-

٢٥٪ یان چوونەوە سەر ( گایە سورەکە ) باپیرەیان

٥٠٪ یان چوونەوە سەر دایك و باوکە تۆز ڕەنگەکانیان

٢٥٪ یان چوونەوە سەر ( مانگا سپیەکە ) نەنکیان

ئەگەر بەووردی سەرنجی ڕەنگی مووەکانی تاکەکانی وەچەی یەکەم وتۆز ڕەنگەکانی وەچەی دووەم بدەین تۆز ڕەنگی نیە بەڵکو تێکەڵەیەکە لەمووی سپی وسوور لەبەر ووردی ئێمە بەتۆز ڕەنگی دەیبینین کەواتە هەریەکێك لەخوشك وبراکان ڕەوشتێکی لەدایك وباوکیەوە هێناوە ، بۆیە ئەگەر ڕێگە بدرێت ئەم خوشك و برایانە ببن بەژن ومێرد هەر یەکێك لەوەچەکانیان ڕەوشتێکیان لێوە دەبات کەسەرئەنجامەکەی ئەوەیە هاوشێوەی باپیرو نەنك و باوك و دایکیان تیایاندا دەردەکەوێتەوە ، هەر بۆیەشە ژن و مێردایەتی خوشك و برا قەدەغە کراوە بۆئەوەی کۆمەڵگا نەشلەژێت و لەبەریەك نەترازێت

ئینجا کۆرپە کەلەدایك دەبێت هەڵگری پەیامەکانی مرۆڤایەتیە بەهەموو ڕێچکەو ووردە کاریەکانیەوە ، لەخێزانەکەیەوە زمانی نەتەوەکەی خۆی فێردە بێت کوردی بێت یان عەربی یان فارسی یان تورکی ، ئەگەر کۆرپەیەکی کورد لە ناوخێزانێکی عەرەبدا پەروەردە بکرێت ئەوا کۆرپەکە فێری زمانی خێزانە عەرەبەکە دەبێت نەك زمانی گەل و نەتەوەکەی خۆی

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ ﴿١٣﴾ سُورَةُ الحُجُرَاتِ

ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە ئێمە ئێوەمان لەنێرینەو مێینەیەك دروست کرد ، وەکردمانن بەنەتەوەکان و هۆزەکان بۆئەوەی یەکتری بناسن بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا ئەوەتانە کەزیاترخوا دەپەرستێت

کەواتە مافێکە خوا داویەتی بەمرۆڤ شانازی بەگەل ونەتەوەو هۆز و تیرەکەی خۆیەوە بکات و ڕێز لەگەل و نەتەوەکانی تر بگرێت و لەگەڵیان تێکەڵاو ببێت و بیان ناسێت ، ئەگەر دەشیەوێت لای پەروەردگار زۆر بەڕێز بێت بازیاتر لە خەڵکی تر خوا پەرستی بکات

فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ الرُّوم

کەواتە ڕووی خۆت بەڕاستی بۆ دین بچەسپێنە ، ئەوداهێنانە بنەڕەتیەی کە خوا ئادەمیزادەکانی پێ داهێنان ناهێڵێت هیچ ئاڵ و گۆڕێك لەدروستکراوەکەی خوادا بکرێت، ئەم ئاینە ڕاستە بەلام زۆرینەی خەڵکی پێینازانن

قال رسول الله صلى الله عليه وسلم:(كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الفِطْرَةِ حَتَّى يُعْرِبَ عَنْهُ لِسَانُهُ، فَإِذَا أَعْرَبَ عَنْهُ لِسَانُهُ إِمَّا شَاكِرًا وإِمَّا كَفُورًا) . مسند الإمام أحمد ٨ ٤ ٤ ٤ ١ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی : هەموولە دایك بویەك لەدایك دەبێت لەسەرداهێنراوە بنەڕەتەکە، هەتا زمانەکەی (کەپێی دەدوێت) کەسایەتیەکەی دەردەبڕێت، ئینجا ئەگەر زمانەکەی کەسایەتیەکەی دەربڕی ئەوا یان سوپاسمەند دەبێت یان بێباوەڕ دەبێت بەپەروەردگاری

أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ : ( يُرْفَعُ الْقَلَمُ عَنِ الصَّغِيرِ وَعَنِ الْمَجْنُونِ وَعَنِ النَّائِمِ ) . سنن إبن ماجة ٧ ٩ ٠ ٢ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی : (پێنوس بەرزدەکرێتەوە لەسەر منداڵ و شێت و لەسەر کەسی خەوتوو).

واتــه منـدالٌ و شـێت و كەسـێك كـه لەخـەودابێت كردەوەكانيـان نانوسـرێن و لێپرسينەوەيان لەسەرنيه

كۆرپەكه بەردەوام دەبێت له گەشەكردندا، خێزانەكەی بەرپرسه لەدياريكردنی ئەوئاينەی كه لەكۆرپەكه دەگەيەنرێت تاتەمەنی ژيری، ئەوسا ئەوكەسه خۆی بەرپرسيار دەبێت لەبەكارهێنانی ژيريەكەی بۆدۆزينەوەی ڕێگەی ڕاست.

هەندێك لەوكۆرپانـه هەرلەسـەرەتای ژيانيانـەوە دەمـرن و زۆريشـيان لەتەمـەنی گەنجيدا دەمرن و ئەوانـەش كەلەلايەن دروستكەرەكەيانەوە ئەوەيان بۆدياری كراوە كەژيانی هاوسەريەتی ببينن ئەوا خێـزان پێكدەهێنن، وە ئەگەر دروست كەرەكەيان ويستی لەسەربوو منداڵيان ببێت ئەوا دەبنه خاوەنی وەچەو ئەگەر ويستيشی لەسەرنەبوو ئەواهەموو هەوڵ وتێكۆشانێك لەبۆری تاقيگه كانيشدا ئـەنجامی نابێـت. ئينجا بـەداری تەمەنـدا هەڵدەگـەڕێن تـاوەكو لـه تەمـەنی چـل ساڵيدا بەتەواوی كامڵدەبن

حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَـٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ سُورَةُ الأَحْقَافِ

هەتا كاتێك كەگەيشتە ئەوەی خۆی بگرێت و گەيشتە چل سـاڵی ووتـی خوايـه بيخه دەروونمەوە كەسوپاسی نازو نيعمەتەكانی تۆ بكەم كه من ودايك و باوكی منت پێبەنازو نيعمەتداركردووە وەبەوەی كەكردەوەی چاكه بكەم ڕەزامەنـدی تـۆی تێـدابێت ، وە لەبـەرو تۆوەكـەم چـاكبكه ، مـن تۆبـەم كـرد بۆتـۆ وەمـن لەموسوڵمانەكانم

كەواتە چل ساڵی لەتەمـەنی مرۆڤدا كـاتی نيشـان دانـی كـارتێكی زەردە، ئەگـەر ژيرانه مامەڵەی لەگەڵدا نەكرێت ئەوا كارتی سور چاوەڕوانی دەكات.

ئینجا ئەوانەی کەتەمەنیان لەچل ساڵ زیاتر بۆنوسراوە لەلایەن دروست کەرەکەیانەوە دەمێننەوە.

وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمْ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَىْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْـًٔا إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٧٠﴾ سُورَةُ النَّحْلِ

وە خوا ئێوەی دروستکردووەو دەسەڵاتی دەروونەکانتان لێوەردەگرێتەوەو دەتان مرێنیٚ ، وە ئەوانەی لەئێوە دەگەڕێندرێنەوە بۆتەمەنێکی داڕوخاو بۆ ئەوەی لەزانست هیچیتر فێرنەبێت ، بەڕاستی خوا زاناو بەتوانایە

وَمَن نُّعَمِّرْهُ نُنَكِّسْهُ فِى ٱلْخَلْقِ أَفَلَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٨﴾ سُورَةُ يسٓ

وە ئەوەی تەمەنی بدەینیٚ لەشێوە دروستکراوەکەیدا دایدەتەپێنین، ئایا ئەوانە ژیروعاقڵ نابن !؟

ئینجا لەوساتەوە کەگیان بەبەر کۆرپەدا دەکرێت لەناومنداڵداندا، پەروەردگار چەند کارمەندێکی تایبەت لەو فریشتەو جندوکانە دادەنێت بەسەر ئەو ئادەمیزادەوە

وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَـٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَـٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ سُورَةُ الانفِطَارِ

وە بەڕاستی پارێزگاریکەر بەسەرئێوەوەهەن(١٠)زۆر بەڕێزن ونوسەرن(١١) ئەوەی کەئێوە دەیکەن ئەوان پێیدەزان(١٢)

هێندێکیان هەتامردن و هەندێکیشیان دوای مردن ڕۆڵی خۆیان دەبینن، لەو کارمەندانە پارێزگاریکەر واتە پارێزگاری لەئادەمیزاد دەکەن لەهەموو نەخۆشی و کارەسات و نەهامەتیەك کەلەچارەنووسی ئەم مرۆڤە نەنوسرابێت

نموونەی یەجگار زۆری ڕوون وئاشکرا هەن کەمرۆڤی ژیرو وریا درکیان پێدەکەن  زۆرجار دوو ئۆتۆمۆبیل خۆیان لێکدەدەن یەکێکیان پارچە پارچە بووەو ئەوەی تریشیان کەمێك تێکچووە ، کە ئۆتۆمۆبیلی یەکەم دەبینی دەڵێی هەرچی لەناوی دابوبێت گیانی لەدەستداوە ، بەڵام کاتێك زیاتر ئەنجامی ڕوداوەکەت بۆئاشکرادەبێت ودەردەکەوێت کەبریندارەکان هەموویان باشن و

کەس نەمردووە ، بەلاتەوە سەیرنەبێت وویستی تۆ پێوانەیەکی تەواوی داناوە کەکەس نەدەبوو دەرچووبا لەم ڕووداوە، بەڵام وویستی خوا وابووە کە خاوەنی ئۆتۆمۆبیلی یەکەم ئەو زەرەرە گەورەیەی بەرکەوێت وخاوەنی ئۆتۆمۆبیلی دووەم ئەوزەرە کەمەی بەرکەوێت ، هەروەها وویستی خوا وابووە کەمرۆڤەکان کاتی مردنیان نەهاتووە بۆیە نابێت بمرن ، بۆیە ئەوکارمەندانەی لەلایەن پەروەردگارەوە بۆپارێزگاری ئەم مرۆڤانە دانـدراون لەکاتی ڕوودانی ڕووداوەکەدا خۆیان دەدەنەبەر خاوەنەکانیان وناهێڵن ئەوەندە ئازاریان پێبگات بگاتە ڕادەی مردن ، ئەوەی کەلەلایەن پەروەردگارەوە سەرشکانی بۆ دانـدراوە دەپارێزرێت هەرئەوەنـدە سەری بشکێت و زیاترنا ، ئەوەشیان کە ئەنـدازەی دەست شکانی بۆدانـدراوە دەپارێزرێت هەرئەوەنـدەی دەستی بشکێت و زیاترنا ، ئەوەش کە لەنەخشە بنەڕەتی یەکەیەوە مردنی بۆداندراوە لەوکاتە دیاریکراوەدا، ئەوا ئەم کارمەندانە جێی دەهێڵن و کارمەندێکی تر بەناوی ( ملك الموت ) گیانی دەکێشێت

﴿ ئایەتەکانی ژمارە ( ٦١ ، ٦٢ ) ی سوڕەتی الانعام پشتیوانیەکی بەهێز لەم بۆچونە دەکەن ﴾

زۆرجار لەدەستگایەکی میریدا دەتەوێت کارێکی خۆت ئەنجام بدەیت و کارەکەت دەکەوێتە لای کەسێك کە نەدیوتەو نەدەتناسی بەڵام وویستی پەروەردگار وایە کارەکەت بۆ ئەنجام بدرێت بۆیە لەپێشەوە ئەوکارمەندانەی کەبەسەر تۆوە دانـدراون خۆیان دەگەیەننە ئەوکارمەندانەی کەبەسەر کاربەدەستەکەی میریەوە داندراون وپێیان ڕادەگەیەنن کەوویستی پەروەردگار وایە کاری ئەم مرۆڤە جێبەجێ بکرێت، سەیردەکەیت ئەوکەسە بەرپرسە بەڕێزەوە پێشوازیت لێدەکات وکارەکەت بۆئەنجامدەدات وبەڕێزەوە بەڕێت دەکات خۆت بەلاتەوەسەیرە ئەم پیاوە چۆن وبۆچی وەها ڕێزی گرتی ؟ ئەوە لە

چـاکەو توانـای خۆتــەوە نیــە ، ئـەوە وویســتی پــەروەردگارە لەڕێگــەی ئــەم کارمەندانەوە جێبەجێی دەکات

خۆ ئەگەر وویستی پـەروەردگاریش وەهـابوو کەکارەکـەت بـۆ جێبـەجیٚ نـەکرێت دیسان بەلاتەوە سەیرە شتەکانت هەموو تەواون هیچ کەم وکوڕیەکیان تێدا نیە نەدی بۆچی ئەم لێپرسراوە وەها دڵرەق بوو بەرامبەرت ؟

دەسـتەیەکی تـر لەوکارمەندانـە ( کرامـا کـاتبین ) زۆربـەڕێزن نووسـەرن، هـەموو کردەوەیـەکی چاکەوخەراپە وبیرکردنـەوەو بەخـەیاڵ داهـاتن وبڕیـارو جێبـەجیٚ کردن وهەموو گەورەو بچوکێك لەهەڵسوکەوتی ئەم مرۆڤە دەنووسن

لـە دواڕۆژدا کەمرۆڤـەکان زیندوودەکرێنــەوەو نامـەکانیان دەدرێنـیٚ کەتیایــدا نووسراوە لەژیانی دوونیادا چیانکردووە هەرکەسێك نامەکەی بەدەستی ڕاستی وەربگرێـت نیشـانەی چـوونە ناوبەهەشـتە، وە هەرکەسـێك نامەکـەی بەدەسـتی چەپی وەربگرێت نیشانەی چوونەناودۆزەخە

وَوُضِعَ ٱلۡكِتَـٰبُ فَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا فِيهِ
وَيَقُولُونَ يَـٰوَيۡلَتَنَا مَالِ هَـٰذَا ٱلۡكِتَـٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً
إِلَّآ أَحۡصَىٰهَا وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًا وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾ الكهف

وە کتابەکە داندراو تاوانبارەکـان بەترسـاوی دەبینـی لـەوەی کەتێیـدان وەدەڵێن ئـەی هـاوار هــەی ئەوکتابــە چــیە ؟ هــیچ بچــوك وگەورەیــەکی بەجێنەهێشــتووە مەگــەر ســەرژمێری هــەرکردووە وەوایــان بینــی ئەوکردەوانــەی کــە لــەدونیادا کربوویانن هەموویان ئامادەبوون ، وەپەروەردگار ستەم لەهیچ کەسێك ناکات

یەکێکی تر لەوفەرمانبەرانەی کەبەسەر مرۆڤەوە دانراون نـاوی (قرینـە) یـە واتـە هاووێنە ، کە درووستکراوێکی گیانی بێلاشـەیە لەشێوەی ئەم ئادەمیزادەدایـە کە بەسەریەوە داندراوە

قەرینـە واتـە هاووێنـە کەبـەپێی وویسـتی خـوا بـۆ زۆرمەبەسـت ڕۆڵـی خـۆی دەبینێـت لەئاگادارکردنــەوەو نیشـاندان وناسـاندنی کەسـایەتی وشـوێنەوارو

ڕووداني كارەسات و   هەموو ئەو مەبەستانەی وویستی پەروەردگارە كەئەم ئادەمیزادەی پێئاگادار بكاتەوە   لەكاتێكدا كەئادەمیزاد لەخەودایە ئەم هاووێنەیە دێتە دەرەوەو ڕوودەكاتە ئەوشوێنەی كەپەروەردگار دەیەوێت زانیاریەك دەربارەی ئەوشوێنە بدات بەوئادەمیزادە   بۆنموونە وویستی پەروەردگارە كەتۆ شارەزای سەلمانپاك وتاقی كیسرا ببیت ، ئەم هاووێنەیە هەموو ئەوزانستیانەت بۆدەهێنێت لەسەر سەلمانپاك وتاقی كیسرا بۆیە كاتێك كە مرۆڤەكە لەخەو ڕاستدەبێتەوەو بەسەرسامیەوە بیر لەڕووداوی خەوەكەی دەكاتەوە ، بیر لەتاقی كیسراو ڕووداوەكان دەكاتەوە   پاش ماوەیەك كەڕێی دەكەوێتە سەلمانپاك ویان لەگۆڤارێكدا شتێك دەربارەی سەلمانپاك دەخوێنێتەوە یان لەكەناڵێكی ئاسمانیەوە شتێك دەربارەی سەلمانپاك و تاقی كیسرا دەبیستێت ئەوسا دەزانێت كەماوەیەك پێشتر ئەوەی لەخەونیدا بینیوە ، ئینجا ئەگەر بۆخۆی مرۆڤێكی ڕاستگۆبێت ئەوا هاووێنەكەشی ڕاستگۆیەو زانیاریەكان بەڕاستی دەهێنێت وە ئەگەر خۆی مرۆڤێكی درۆزن بێت ئەوا هاووێنەكەشی درۆزنەو زانیاریەكان بەچەوتی دێنێت

وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ سُورَةُ قٓ

وە هاووێنەكەی ووتی هەموو ئەوەیە لەلای منەو ئامادەیە

وواتە ئەوە هەموو ئەوكردەوانەیە كەئەوكردویەتی ولەلای من ئامادەیە ، ئینجا كە ئادەمیزادەكە بێ هیوا بوو بەلاساریەوە دەیەوێت تاوانەكە لەسەر خۆی لابەرێت و دەڵێت   خوایە هاووێنەكەم گومڕای كردم

لەوێدا هاووێنەكەی دێتەدوان ودەڵێت

قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطۡغَيۡتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٖ ﴿٢٧﴾ سُورَةُ قٓ

هاووێنەكەی ووتی پەروەردگاری ئێمە من گومڕام نەكرد، بەڵام خۆی لە تاریكایی و گومڕایی یەكی دوور دابوو

قَالَ لَا تَخۡتَصِمُواْ لَدَيَّ وَقَدۡ قَدَّمۡتُ إِلَيۡكُم بِٱلۡوَعِيدِ ﴿٢٨﴾ سُورَةُ قٓ

خوا فەرمووی لەلای من دوژمنایەتی یەکتر مەکەن وەپێشتر بەوادەو پەیمان ئەوەم پێگەیاندون   واتە لەلای من بەگژ یەکتریدا مەیەن هیچ بوارێك نیە بۆ ووتووێژو دم بەدمانێ چونکە پێشتر بەوادەوپەیمان هەمووشتێکمان خستۆتە بەردەمی ئێوە

قَالَ رَسُولُ اللّه صلى الله عليه وسلم (مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ وَقَدْ وُكِّلَ بِهِ قَرِينُهُ مِنَ الْجِنِّ ). صحيح مسلم ٧٠٥٣ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت)فەرمووی ( یەکێك نیە لەئێوە مەگەر هەر هاووێنەیەکی خۆی لەجندوکە پێ سپێردراوە )

واتە هەرشتێك کەتۆ دەیکەیت بێشك لەلای پەروەردگار بزرنابێت

وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴿١٦﴾ سُورَةُ قٓ

وەئێمە ئادەمیزادمان دروستکردو ئاگادارین بەوختوکانەی کەدەروونەکەی دەیدەن و ئێمە لەپەتی شادەماریەوە نزیکترین لەوەوە   واتە پەروەردگار و هێز ودەسەلاتەکەی ئەوەندە نزیکن لەئادەمیزادەوە کەلەپەتی شادەمارەکەیەوە لێیانەوە نزیکترە .( کە دوو ڕەگە دەماری پتەون لە تەنیشتەکانی ملەوە / الصحاح ص ٤٢٨ - ٧١٦) .

وَجَآءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ﴿٢١﴾ سُورَةُ قٓ

وەهەموو دەروونێك لەگەڵیدا لێخوڕێك و شاهیدێك هات

واتە دوای زیندووبوونەوە هەمووەدەروونێك لێخوڕێك وشاهیدێکی لەگەڵ دایە کەس ناتوانێت بەرەو دادگا دوابکەوێت چونکە ئەوەی ملکەچ نەبێت بە ئارەزووی خۆی بڕوات ئەوا بەناچاری لێدەخوڕدرێت   وەهەرکەسێکیش دان بە تاوانەکانی خۆیدا نەنێت ئەوا شاهیدێکی لەگەڵدایە هەموو نهێنیەکانی ئاشکرا دەکات

مرۆڤ چەند ڕاستگۆبێت ئەوەندەش بەڕاستی هەواڵەکانی بۆدێن

قَالَ رَسُولُ اللَّه صلى الله عليه وسلم

(رُؤيَا الْمُسلِمِ يَرَاهَا أَوْ تُرَى لَهُ) . صحيح مسلم ٥٨٥٨ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( خەونی کەسێکی موسڵمان یان خۆی دەیبینێت یان نیشانی دەدرێت )**

**کەواتە خەونەکە یان خۆت دەیبینی یان نیشانت دەدرێت خۆت خەوتوی وەلەکاتی خەوتویشدا هیچ لێپرسینەوەیەکت لەسەرنیە ، کەواتە هاو وێنەکەی تۆیە ئەم ئەرکەی لەئەستۆ گرتووە ، یان دەچێت ودەگەڕێت بەپێی ویستی خوا زانیاریەکانت بۆدێنێت ، یان بەپێی ویستی خوا یەکێکی تر زانیاریەکان بۆهاووێنەکەی تۆدێنێت**

النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ: (إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُسْلِمِ تَكْذِبُ .

وَأَصْدَقُكُمْ رُؤْيَا أَصْدَقُكُمْ حَدِيثًا ). صحيح مسلم ٥٨٥١ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی ( کاتێک کەکۆتایی ڕۆژگارەکە نزیک دەبێتەوە پێناچێت خەونی موسڵمان درۆبکات ، وەخەونی ڕاسترینتان ئەوانەن کەڕاستگۆترینتانن )**

**خەونەکان پەیامێکن ، هەیانە لەلایەن پەروەردگارەوەیە بۆمەبەستێک مژدەو ئاگادارکرنەوەو هەواڵی ئایندەو ڕابردوون هەشیانە لەلایەن شەیتانەوەیە بۆ وروژاندنی دەروون و یاخی کردنی مرۆڤ**

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم . ( إِنَّ الرُّؤْيَا ثَلَاثٌ: مِنْهَا أَهَاوِيلُ مِنَ الشَّيْطَانِ لِيَحْزُنَ بِهَا ابْنَ آدَمَ .وَمِنْهَا مَا يَهُمُّ بِهِ الرَّجُلُ فِي يَقَظَتِهِ، فَيَرَاهُ فِي مَنَامِهِ، وَمِنْهَا جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ ) سنن إبن ماجة ٣٩٨٨ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاَوی خوای لێبێت) فەرمووی (خەون سێ جۆرە : تێیاندایە تۆقاندنە لەشەیتانەوە بۆترساندنی ئادەمیزاد ، وە تیایاندا هەیە ئەوەی کە ئادەمیزاد لەکاتی بەخەبەریدا پێیەوەگیرۆدەیە لەکاتی نوستنەکەیدا دەیبینێتەوە، وەتیایانداهەیە بەشێکە لەچل وشەش بەش لەپێغەمبەرایەتی).

أن رسولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم قالَ:

(الرؤيا الحسنة من الرجل الصالح جزء من ستة وأربعين جزءاً من النبوّة). مسند الإمام أحمد ١١٩٧٠ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاَوی خوای لێبێت) فەرمووی (خەونی باش لەکەسی چاکەکارەوە بەشێکە لەچل وشەش بەش لەپێغەمبەرایەتی)

کەواتە جۆرێك لەوخەونانەی کەخاوەنەکانیان چاکەکارن ، مژدە وئاگادارین بۆ رووبەڕوبونەوەی تەنگانەو کارەساتەکان یان زانیارین بۆخزمەت بەمرۆڤایەتی لێرەدا ڕووداوێکی ڕاستەقینە دەخەینە ڕوو کەخەون ڕۆڵێکی گرنگی هەبووە لە پێش بینی ڕووداوەکان و خۆئامادەکردن بۆ ڕووبەڕو بونەوەی نەهامەتیەکان پێغەمبەری مەزنمان یوسفی کوڕی یعقوب سلاَوی خوایان لێبێت بەمندالَی خەونێکی دیت :

إِذۡ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيۡتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوۡكَبٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ رَأَيۡتُهُمۡ لِي سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾ سُورَةُ يُوسُفَ

کاتێك کەیوسف بەباوکی گووت: ئەی باوکە من لەخەوما یانزدە ئەستێرەو ڕۆژو مانگم بینی ، هەموویانم بینی بۆمن لەکڕنوش دابوون

باوکی زانی کەیوسف لەپاشەرۆژدا ئەرکێك چاوەڕێی دەکات و کوڕەکەی لەلایەن پەروەردگارەوە پلەو پایەیەکی بەرزی دەستدەکەوێت و یانزدە براکەو باوك ودایکی پابەندی فەرمانڕەواییەکەی دەبن کەئەمەش لێرەدا زانیاریەکە خوا داویەتی بەیعقوب دەربارەی پاشەڕۆژی کوڕەکەی و زانیاریەکە بۆهەموو

مرۆڤایەتی کەڕۆژ لەخەودا باوکە ومانگ لەخەودا دایکەو ئەستێرە لەخەودا برایە.

باوکی داوای لەیوسف کرد کەخەونەکەی لای براکانی باس نەکات نەوەك پیلانێکی بۆدابنێن ولەناوی بەرن ، بەڵام ویستی پەروەردگار وەهابوو کەبراکانی بەم هەواڵە بزانن و پیلانێکی بۆڕێکبخەن، بۆئەوەی سەرەتای گەشتەکەی دەست پێبکات بەرەو ئەوشوێنەی کەپەروەردگار مەبەستیەتی یوسف ڕۆڵی خۆی تیادا ببینێت ، ئایا دەبێت ئەم شوێنە کوێ بێت؟

کچێك کەناوی زولیخا بوو لەخەونیدا کوڕێکی گەنجی جوانی بینی شەیدای بوو لێیپرسی تۆکێیت؟ ووتی من عەزیزی مصرم ، کەزولیخا خەبەری بۆوە داوای لەباوکی کرد کەبەشوی بدات بەعزیزی مصر ، باوکیشی بەدەست و دیاریەوە ناردی بۆ عزیزی مصر، کە کەسایەتیەکی ناوداری مصر بوو ، کاتێك زولیخا عزیزی بینی داوای لێبوردنی لێکردو بۆی گێڕایەوە کەلەخەویدا کەسێکی بینیوەو خۆشی ویستووە بەڵام ئەونیە ، بۆیە عزیز داوای لێکرد کەلای ئەو بمێنێتەوەو لەبەر چاوی خەڵکی هاوسەری یەکتری بن ولەنێوان خۆشیاندا خوشك و برای یەکتربن ، بۆئەوەی ناو وناوبانگی عزیز لەکەدارنەبێت

لەوکاتەدا براکانی یوسف ئامادەییەکی تەواویان وەرگرتبوو بۆکوشتنی یوسف، بەڵام لەبەر ئەوەی کەوویستی خوا وابوو کەیوسف نەکوژرێت، بۆیە یەکێك لەبراکانی دەڵێت مەیکوژن ، بەڵکو بیخەنە ناوبیرێکی ئاوەوە کەبە(الجب) ناسراوە، لەوێشەوە کاروانچیەکان دەریدەهێننەوەو دەیبەن و لەکۆڵ ئێمە دەبێتەوە

ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا يَخۡلُ لَكُمۡ وَجۡهُ أَبِيكُمۡ
وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ ٩ سُورَةُ يُوسُفَ

یوسف بکوژن یان لەزەوی بدەن وسەری بڕن ، بەر ڕووی باوکتان چۆڵدەکات وە لە دوای ئەو ئێوە دەبن بەگەلێکی چاکەکار .

قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ لَا تَقْتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلْقُوهُ فِى غَيَٰبَتِ ٱلْجُبِّ يَلْتَقِطْهُ بَعْضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿١٠﴾ سُورَةُ يُوسُفَ

یەکێك لەقسەکەرەکان ووتی ئەگەرئێوە ( ئیشەکە هەر دەکەن ) یوسف مەکوژن بەڵکو هەڵیدەنە ناو بیری (الجب ) هەندێك لەکاروانەکان دەیگرنەوە

واتە ئەگەر بیخەنە ناو بیرەکەوە هەندێك لەوکاروانانەی کە بەناوچەکەدا تێدەپەڕن و بۆ ئاوخواردنەوە لەسەر بیرەکە لادەدەن ، یوسف دەردەهێننەوەو لەگەڵ خۆیان دەیبەن و لەئێمە دووردەکەوێتەوە . کەواتە بەپێی وویستی خوا دڵی براکانی نەرمکراو یوسف نەکوژرا، بۆ ئەوەی لەبیرەکە دەربهێندرێتەوەو بەدوای تەواوکردنی کارەکانیدا بڕوات

وَجَآءَتْ سَيَّارَةٌ فَأَرْسَلُواْ وَارِدَهُمْ فَأَدْلَىٰ دَلْوَهُۥ قَالَ يَٰبُشْرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٌ وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةً ﴿١٩﴾ سُورَةُ يُوسُفَ

وە کاروانێك هات ، وە ئاوهێنەرەکەیان نارد، کاتێك کەدۆلکەکەی داهێشت ووتی موژدە ئەوە کوڕێکە ، وەکو کەلوپەلێکی بەهادار شاردیانەوە

بۆئەوەی کەس پێینەزانێت نەوەك خاوەنی بۆپەیدابێت و لێیان بستێننەوە بۆئەوەی بیبەن لەبازاڕەکاندا بەنرخێکی چاك بیفرۆشن

وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾ سُورَةُ يُوسُفَ

وە بە نرخێکی کەم کڕیان ، چەند درهەمێکی ژمێردراو، وە لە نێوکڕیارەکانیدا کەسانی خۆپارێز هەبوون

وَقَالَ ٱلَّذِى ٱشْتَرَىٰهُ مِن مِّصْرَ لِٱمْرَأَتِهِۦٓ أَكْرِمِى مَثْوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا ﴿٢١﴾ سُورَةُ يُوسُفَ

وە ئەوەی کەکڕی لەمصر بەهاوسەرەکەی خۆی ووت ڕێزی لێبگرە ، بەڵکو کەڵکی بۆمان هەبێت یان بیکەین بەکوڕی خۆمان

واتە وویستی خوا وابوو کەکاروانێك یوسف دەربهێنێتەوە کەبیبات لە بازاڕەکانی مصردا بیفرۆشێت و لەوێش عزیزی مصر بیکڕێت بۆهاوسەرەکەی

لەبەرئەوەی خۆیان منداڵیان نەبوو وەکو لەپێشەوە باسمانکرد ئەوان تەنها لەبەرچاوی خەڵکی ژن ومێردی یەکتری بوون

وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيْنَـٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٢٢﴾ سُورَةُ يُوسُفَ

وەکاتێك کەیوسف گەیشتە تەمەنی خۆناسین ، دەسەلاَت و زانستمان پێبەخشی وە ئێمە ئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.

یوسف لەناوماڵی عزیزی مصر لەژێر سۆزو خۆشەویستی زولیخادا گەورە بوو خۆی ناسی ، لەوکاتەدا زولیخا بیری کەوتەوە ئەوگەنجەی کەکاتی خۆی لە خەونیدا دیتویەتی یوسف بووە کەئێستا وەکو خزمەتکارێك لەماڵەکەیدایە بۆیە کەوتە عەشقی یوسفەوە

وَرَٰوَدَتْهُ ٱلَّتِى هُوَ فِى بَيْتِهَا عَن نَّفْسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلْأَبْوَٰبَ وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهُۥ رَبِّىٓ أَحْسَنَ مَثْوَاىَ ۖ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ يُوسُفَ

وە ئەو ئافرەتەی کەیوسف لەماڵەکەیدابوو داوای لەیوسف کرد بۆکارێکی خراپ ، وەدەرگاکانی داخستن وەووتی وەرە زووکەدەی بۆئەوەشتەی کەبۆتۆ ئامادەیە ، ووتی پەنابەخوا ، ئەو( عزیز ) گەورەی منە باشترین شوێنی مانەوەی داوە بەمن ، بە دڵنیاییەوە ستەمکارەکان ئازادو سەرفراز نابن

واتە زولیخا دەرگاکانی داخستن وخۆی بۆئامادەکردو بانگی لێوەکرد بۆ کارێکی خراپ ، یوسف لەوەلاَمدا ووتی پەنابەخوا لەمکارە چونکە من لەماڵی ( عزیز ) دا دەژیەم و باشترین شوێنی مانەوەی داوەبەمن چۆن دەبێت من خیانەتی لەگەڵدا بکەم ، بەدڵنیاییشەوە ستەمکارەکان لەدونیاودواڕۆژدا ئازادو سەرفراز نابن

وَلَقَدْ هَمَّتْ بِهِۦ ۖ وَهَمَّ بِهَا لَوْلَآ أَن رَّءَا بُرْهَـٰنَ رَبِّهِۦ ۚ كَذَٰلِكَ لِنَصْرِفَ عَنْهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلْفَحْشَآءَ ۚ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٢٤﴾ يُوسُفَ

وه بەدڵنیاییەوە شەیدای یوسف بوو، وە یوسفیش شەیدای ئەو ببوو ئەگەر پێسەلماندنەکەی خوای نەدیبایە ، ئەوەش بۆئەوەی خراپەو کردەوەی ناشیرینی لێدووربخەینەوە ، بەڕاستی یوسف لەبەندە دڵسۆزەکانمانە
کەواتە خوا بۆئەوەی یوسف توشی ئەم خراپەکاریە نەکات بەڵگەو سەلماندنێکی نیشانی یوسفدا کەبووە هۆیئەوەی یوسف خۆی بەدەستەوە نەدات ، ئەگەر یوسف خۆی بەدەستەوە دابا ئەوا ئەومەبەستەی کەلەپێناویدا هێنرابوو کۆتایی پێدەهات ، بەڵام دیارە مەبەستەکە لەوەش زیاترە وگەورەترە وە نەگەیشتووە بەدواقۆناغ
دوای ئەوەی کە هەردووکیان لەژوورەوە لەلایەن (عزیز) بینران ، زولیخا بۆ پاکانە لەخۆی تاوانەکەی خستە ئەستۆی یوسف ، وداوای لەعزیز کرد کە سزایەکی سەخت بەسەر یوسفدا بسەپێنێت هەواڵەکە لەشاردا بڵاوبۆوەو ئافرەتەکانی شار ووتیان ئافرەتەکەی عزیز شێت وشەیدای خزمەت کارەکەی خۆی بووەو دەوری دەدات و بۆخۆی دەوێت ﴿ ڕەحمەت لە پێشینان کە گوتویانە ( ئەگەر قسە کەوتە زارێك کەوتە شارێك ) ﴾

وَقَالَ نِسْوَةٌ فِي ٱلْمَدِينَةِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا
عَن نَّفْسِهِۦ قَدْ شَغَفَهَا حُبًّا ﴿٣٠﴾ سُورَةُ يُوسُفَ

وە ژنان لەشاردا ووتیان ئافرەتەکەی عزیز دەورەی خزمەتکارەکەی خۆی دەدات و بۆخۆی دەوێت ، بەدڵنیاییەوە خۆشەویستی یوسف ئاگری لەپەردەی دڵی بەرداوە

فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا
وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٍ مِّنْهُنَّ سِكِّينًا وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّ
فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ
مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٌ كَرِيمٌ ﴿٣١﴾ سُورَةُ يُوسُفَ

کاتێك کەزولیخا گوێ بیستی ئاینوئۆینی ژنەکان بوو بەدوایدا ناردن ، و نان خوانێکی بۆئامادەکردن و بەهەریەکێك لەئافرەتەکان چەقۆیەکی دانێ وەووتی یوسف دەرکەوە ناویان ، کاتێ کەیوسفیان بینی لەبەرچاویان گەورە وپایەداربوو، وەدەستەکانی خۆیان بڕین، وە ووتیان بێخەوشی بۆخوا ، ئەوە ئادەمیزادنیە بەڕاستی مەگەر ئەوە فریشتەیەکی بەڕێزە

دەستەکانی خۆیان بڕین لەبەر ئەوەی ئەوان لەکاتی خواردنی میوەکاندا یوسفیان بینی، لەبەر جوانی یوسف چاودێری کردنی چەقۆکانی دەستیان لەبیرچۆوەو سەر ئەنجام لەجیاتی میوەکان دەستەکانی خۆیان بڕین

لە کاتێکدا کەیوسف لەبەر دەم ژنەکاندا ڕاوەستابوو زولیخا ڕووی کردە ژنەکان وە ووتی

قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِى لُمْتُنَّنِى فِيهِ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَ
وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونًا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾ يُوسُف

ووتی ئەوە ئەوەبووکە ئێوە لۆمەی منتان تێدادەکرد، وە بەدڵنیاییەوە داوام لێکرد دەربارەی خۆی بۆخۆم ، وە ئەگەر ئەوەی کەپێیدەڵێم جێبەجێی نەکات دەخرێتە زیندانەوەو دەچێتە ڕیزی بچوك کراوەکان

لێرەدا یوسف ڕوویکردە پەروەردگارو ووتی

قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَىَّ مِمَّا يَدْعُونَنِىٓ إِلَيْهِ ﴿٣٣﴾ سُورَةُ يُوسُف

ووتی خوایە زیندان بۆمن خۆشترە لەوەی کەداوام لێدەکەن بۆکردنی

فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٤﴾ سُورَةُ يُوسُف

خوا وەڵامی دایەوەو ئاینوئۆینی ژنانی لەسەرلابرد ، بەڕاستی خوایە کە بیستەرو زانایە

مەبەستەکەی پەروەردگار نەگەیشتووە بەکۆتایی ، وە ئەگەر یوسف لەناو خێزانەکەی عزیز بمێنێتەوە لەوانەیە دوای ئەم ڕووداوانە توشی کارەساتی

ناخۆشتر ببێت ، بۆیه لەسەر داوای یوسف و بۆپاراستنی پلەوپایەو ناوبانگی عزیز بڕیاردرا بۆماوەیەك یوسف بخرێنه زیندانەوه

ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا رَأَوُاْ ٱلۡأٓيَٰتِ لَيَسۡجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿٣٥﴾ سُورَةُ يُوسُف

ئینجا لەدوای ئەوەی بەڵگەو نیشانەکانیان بینین وایان بۆدەرکەوت هەتا ماوەیەك بیخەنە زیندانەوه بەڵگەونیشانەکان هەموویان پاکانەی یوسف دەردەبڕن بەڵام وویستی پەروەردگار وابوو کەکاروانی بەردەوام بوونی تەواو کردنی کارەکەی یوسف بەزینداندا تێدەپەڕێت

ئینجا دەبێت لەزینداندا چی ڕوبدات ؟

وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجۡنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعۡصِرُ خَمۡرٗاۖ وَقَالَ ٱلۡأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحۡمِلُ فَوۡقَ رَأۡسِي خُبۡزٗا تَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِنۡهُۖ ﴿٣٦﴾ سُورَةُ يُوسُف

وه لەگەڵ یوسفدا دوو گەنج چوونه زیندانەوه یەکێکیان ووتی لەخەونمدا خۆم بینی ترێم بۆشەراب دەگوشی، وەئەوی تریان ووتی من لەخەونمدا خۆم بینی نان لەسەرسەرم هەڵدەگرم و باڵندەش لێیدەخوات

پەروەردگار لێکدانەوەی خەونەکانی فێری یوسف کردبوو بۆیه یوسف دوای ئەوەی کە گوێ بیستی خەونەکانیان بوو بەڕاستی و دروستی وواتای خەونەکانی بۆلێکدانەوه پێی ووتن :

يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ ﴿٤١﴾ يُوسُف

ئەی هاوڕێیانی زیندانم یان یەکێك لەئێوه دەبێت بەشەراب گێڕی گەورەکەی خۆی ، یان ئەوەی ترتان لەداردەدرێت و( ئەوەنده بەدارەوه دەمێنێتەوه ) باڵنده لەکەلەی سەری دەخوات

یوسف دەیزانی کامەیان ڕزگاری دەبێت بەڵام بۆئەوەی ئەوەیان کە لە داردەدرێت هەر لەئێستاوه توشی خەم و خەفەت و ناڕەحەتی نەبێت بۆیە بەوەیانی گووت کەڕزگاری دەبێت: لای گەورەکەت باسی من بکه

شەیتان ئەم داوایەی یوسفی لەبیر شەراب گێڕی ڕزگاربوو بردەوه ، دوای مانەوەی یوسف لەزینداندا بۆچەندین ساڵ ، پاشای مصر خەونێکی دیت

وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ ﴿٤٣﴾ سُورَةُ يُوسُف

پاشا ووتی من لەخەودا حەوت مانگای قەڵەو دەبینم حەوت مانگای لەڕ دەیانخۆن وەحەوت گوڵە گەنمی سەوزو حەوتی وشکیش

کەس نەبوو لەلێکدەرەوەی خەونەکاندا خەونەکەی پاشا لێکبداتەوە، لەوکاتەدا ئەولاوەی کە لەزیندان ڕزگاری ببوو بیری کەوتەوە کەیوسف هەر لەزینداندایەو باشترین کەسە بۆلێکدانەوەی خەونەکەی پاشا، بۆیە داوای لەپاشا کرد کەبنێرن بەدوای یوسفدا

يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفْتِنَا فِى سَبْعِ بَقَرَٰتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ
وَسَبْعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٍ ﴿٤٦﴾ سُورَةُ يُوسُفَ

یوسف ئەی ڕاستگۆ لێکدانەوەمان بۆبکە لە( خەونێکدا ) کە حەوت مانگای قەڵەو حەوت مانگای لەڕ دەیانخۆن وەحەوت گوڵەگەنمی سەوز وحەوتی وشکیش.

قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِى سُنۢبُلِهِۦٓ
إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾ سُورَةُ يُوسُفَ

ووتی حەوت ساڵ بەبەردەوامی دەچێنن ئینجا ئەوەی کەدروتانەوە لەگوڵە گەنمەکەیدا لێیبگەڕێن و بیهێڵنەوە تەنها کەمێك نەبێت کەدەیخۆن

ثُمَّ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ
إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تُحْصِنُونَ ﴿٤٨﴾ يُوسُفَ

ئینجا لەدوای ئەم حەوت ساڵە حەوت ساڵی سەخت دێن هەموو ئەوە دەخۆن کە پێشتر بۆتان دانابوون ( عەمبارتان کردبوو) تەنها کەمێك نەبێت لەوەی کە دایدەکەن و هەڵیدەگرن ( بۆچاندنەوە )

ثُمَّ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ ﴿٤٩﴾ يُوسُفَ

ئینجا لەدوای ئەوە ساڵێك دێت خەڵکی تێیدا دەبوژێنەوەو ترێ دەگوشن

پاشا کەئەوەی بیست داوای دیدەنی یوسفی کرد

وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرْجِعْ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسْـَٔلْهُ
مَا بَالُ ٱلنِّسْوَةِ ٱلَّٰتِى قَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ إِنَّ رَبِّى بِكَيْدِهِنَّ عَلِيمٌ ﴿٥٠﴾ يُوسُفَ

وە پاشا ووتی بۆمی بێنن   ئینجا کەنێردراوی پاشا هات بۆلای یوسف پێی گوت بگەڕێوە بۆلای گەورەکەت، وە لێی بپرسە چیبوو ئەوەی لەمێشکی ئەو ئافرەتانـــەدابوو کەدەســـتی خۆیـــان بـــڕی؟ بەڕاســـتی پـــەروەردگاری مـــن بەئاینوئۆینی ئەوان ئاگادارە

قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ قُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْـَٰٔنَ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٥١﴾ يوسف

پاشا بەئافرەتـەکانی گـووت مەبەسـتی ئێـوە چـیبوو کـەداواتان لەیوسـف کـرد دەربارەی خۆی ، ژنەکان ووتیان بێخەوشی بۆخوا هیچ شتێکی خراپمان لەسەر ئەو نەزانیوە، ئافرەتەکەی عزیز ووتی ئێستا ڕاستیەکان دەرکەوتن من داوام لە یۆسف کرد دەبارەی خۆی بۆخۆم ، وە بەڕاستی ئەو لەڕاستگۆیەکانە

ئینجا کە ئەم ڕاستیانە ئاشکرا بوون یوسف ووتی

ذَٰلِكَ لِيَعْلَمَ أَنِّى لَمْ أَخُنْهُ بِٱلْغَيْبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى كَيْدَ ٱلْخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾ يوسف

ئـەوە بۆئـەوەی کـە (عزیـز ) بزانێـت لـە بێئاگـایی ئەویشـدا مـن خیانـەتم لێنەکردووەو بەڕاستی خوا ئاینوئۆینی خیانەتکاران سەرناخات

وَقَالَ ٱلْمَلِكُ ٱئْتُونِى بِهِۦٓ أَسْتَخْلِصْهُ لِنَفْسِى فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلْيَوْمَ لَدَيْنَا مَكِينٌ أَمِينٌ ﴿٥٤﴾ سورة يوسف

پاشا ووتی بۆمی بێنن پاکی دەکەمەوەو دەیکەم بەتایبەت بەخۆم ، جاکاتێك کە لەگەڵی دوا ووتی تۆئیمڕۆ لەلای ئێمە پلەوپایەیەکی پارێزراوت هەیە

قَالَ ٱجْعَلْنِى عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلْأَرْضِ إِنِّى حَفِيظٌ عَلِيمٌ ﴿٥٥﴾ سورة يوسف

یوسف ووتی بەسەر عەمبارەکانی زەویەوە دامنێ ، من پارێزگاری کەرو زاناو شارەزام ( بەم کارە )

بـەڵێ حـەوت سـاڵ گـەنمی چـاندو لەعەمبارەکانـدا کـۆیکردەوە بـۆ ڕوبـەڕوو بوونەوەی حەوت ساڵی گرانی کەهاتن وتێپەڕین ، بەهۆی ئاگاداری کردنێکەوە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆبەندەیەکی دڵسۆزی

کەواتە مانگا نیشانەی ساڵە لەخەوندا ، وە مانگای قەڵەو نیشانەی ساڵی هات و هەرزانی دەگەیەنێت ، وەمانگای لاواز ولەڕ مانای ساڵی نەهات وگرانی دەگەیەنێت   وەگوڵە گەنمی سەوز مانای بوونی کشتوکاڵ وگوڵە گەنمی ووشك مانای نەبوونی کشتوکاڵ دەگەیەنن بەپێی لێکدانەوەی خەونەکە
خەڵکی لەبرسان ڕوویان لە یوسف کردوو سەرئەنجام بوو بەگەورەی مصر ئینجا کەیوسف ئەم پلە وپایە بەرزەی دەستکەوت ودوابەدواش بوو بەگەورەی مصر سەرئەنجام دایك وباوك وبراکانی هەموویان هاتن بۆ مصر

وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى ٱلْعَرْشِ وَخَرُّوا۟ لَهُۥ سُجَّدًا وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا
تَأْوِيلُ رُءْيَٰىَ مِن قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّى حَقًّا ﴿١٠٠﴾ سُورَةُ يُوسُفَ

وە دایك وباوکی لەسەروی تەختی پاشایەتیەوە دانا وەهەموو بۆی بەکڕنوشدا چوون وەووتی ئەی بابە ئەوە لێکدانەوەی خەونەکەم بوو کەپێشتر دیتم و بەدڵنیاییەوە پەروەردگار کردی بەڕاستی
ئینجا پەروەردگار بۆ پێغەمبەری  ئیسلام دەفەرمووێت :

ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْغَيْبِ نُوحِيهِ إِلَيْكَ ﴿١٠٢﴾ سُورَةُ يُوسُفَ

ئەوەی کەباسمانکرد لەهەواڵەکانی دنیای نادیارە بۆتۆی دەنێرین
خوێنەری بەڕێز ویژدانی خۆت بکە بەناوبژیوان ئەم هەموو ووردەکاریە لەخەونێکەوە بۆڕاستی ڕووداوێك ئایا ڕێکەوت وبێبەرنامەیە  ؟
ئینجا ئەو ئادەمیزادە کەتەمەنەکەی تەواوبوو وە هەموو ئەرکەکانی کە لەلایەن دروستکەرەکەیەوە پێیسپێردرابوون تەواوی کردن ، کاتی گەڕانەوە دێت بۆلای پەروەردگارەکەی ، کەیەکەم قۆناغی ئەم گەڕانەوەیەش بەمردن دەست پێدەکات.

ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ سُورَةُ المُؤْمِنُونَ

ئینجا لەدوای ئەوە بێشك ئێوە مردوون

# مـــــــــردن

وەکو لەپێشەوە باسمان کرد ( ڕوح ) فەرمانێکی خوایە

وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي
وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾ الإسراء

ئەی محمد دەربارەی ( ڕوح ) پرسیارت لێدەکەن بڵێ ( ڕوح ) بەشێکە لەفەرمان ودەسەڵاتی خوا وەئێوە لەزانست پێتان نەدراوە تەنها کەمێك نەبێت

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ:

(الأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ. فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ. وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ). صحيح مسلم بشرح النووي ٦٦٥٧ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( گیانەکان سەربازی کارپێدراون جا ئەوانەی کەیەکتریان ناسی ئەوا یەکتردەگرن وە ئەوانەی کە نامۆ بوون جیادەبن لەیەکتری )

کەواتە ( ڕوح ) فەرمانێکی پەروەردگارە ، ئەم فەرمانە لەلایەن سەربازانێکی ئامادەکراو جێبەجێ دەکرێت بۆمەبەستی بەکارکەوتنی لاشەودەروونەکان کاتێك ڕوح کرا بەبەر لاشەی ئادەمدا هەموو هێزو تواناکان کەوتنەگەڕ ، کەواتە کاتێك فەرمانەکەی خوا وەربگیرێتەوە ئەوا هەموو هێزو تواناکان لەکار دەکەونەوە کەبینین تواناکانی خۆی لەدەستدەداو جوڵە نامێنێت بۆ ڕۆیشتن لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی تر ، هەروەها دڵ و هەناسەدان دەوەستێن وخوێن وئۆکسجین ناگەنە خانەکانی لەش ، هەروەها زمان توانای قسەکردنی

نامێنێت و بەم شێوەیە زۆرینەی ئەندامانی جەستەکە لەکاردەکەون و دەکەونە قۆناغێکەوە پێیدەگوترێت مردن

ئێمە ڕوونمان کردەوە کەدیوی ناوەی هەموو جەستەیەك دەروونەکەیەتی بەپێی ڕێژەی توخمەکان لەپێکهاتەکەیدا ، کاتێك کەمردن دێت و جەستەکە لەکار دەکەوێت ، ئەدی دەروونەکەی چیلێدێت و بۆکوێدەچێت ؟ خۆ بەودەم و دەستە پێکهاتەکانی دیوی دەرەوەی لەبەریەکتری هەڵناوەشێنەوە هەتا دیوی ناوەوەی بزرببێت

ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ سُورَةُ المُؤْمِنُونَ

ئینجا لەدوای ئەوە بێشك ئێوە مردون

واتە لەدوای ئەوەی هەموو قۆناغەکانی ناومنداڵدان و ژیانی سەر زەویتان تەواوبوو ئێوە دەچنە ڕیزی مردووەکانەوە

أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ﴿٧٨﴾ سُورَةُ النِّسَاءِ

لە هەرشوێنێك بن مردن پێتان دەزانێت وەهەرچەندە لەباڵەخانە بەرزە دروستکراوەکانیشدابن

مانای ئایەتەکە بنبڕە ( قطعی )یە کەمردن لەکاتی خۆیدا هەردێت وە هیچ شتێك ناتوانێت پێشی پێبگرێت

اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا
فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَىٰ عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَىٰ إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى
إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ سُورَةُ الزُّمَرِ

( يتوفى ) فەرمانێکی ڕانەبردووە ( فعل مضارع ) فرمانە ڕابردووەکەی بریتیە لە ( توفى ) مانای ئەوە دەگەیەنێت کەمافەکانی خۆی بەتەواوی وەرگرتۆتەوە ئینجا بکەرەکە کێیە کەمافەکانی خۆی بەتەواوی وەردەگرێتەوە ؟ وە کارلێکراوەکەش کێیە کەمافەکانی لێوەردەگیرێنەوە ؟ ( المنجد / وفى / ص ٩١١)

لــه ئایەتەکــەدا بکەرەکــە خوایــە و فەرمانەکــەش وەرگرتنــەوەی مافەکانــە وکارلێکراوەکەش دەروونەکانن کەمافەکانیان لێدەستێندرێتەوە

واتە لێکدانەوەی ئایەتە قورئانیەکە بەم شێوەیەی خوارە دەگەیەنێت

خوا مافەکانی خۆی لەدەروونەکان وەردەگرێتەوە لەکاتی مردنیان، لەکاتێك دا لە نوستنەکەیاندا ئەم مافانە نامرن ، خوا دەیگرێتەوە ئەوەی کەمردن بەسەریدا زاڵبووە ، وە یەکێکی تر دەنێرێت تاکاتێکی دیاریکراو ، بەڕاستی لەمکارەدا بەڵگەو نیشانە هەن بۆ گەل و نەتەوەیەك کەبیردەکەنەوە

(حین موتها ) واتـە کـاتی مردنـی ( الانفس ) دەروونـەکان ، کەواتـە ئـەوەی کەدەمرێت دەروونەکانن کەڕەنگدانەوەی دیوی ناوەوەی جەستەکانن ، (والتی) دەگەڕێتەوە بۆمافەکانی خوا کەداویەتی بەدەروونەکان ( لم تمت فی منامها )کە لـەکاتی خـەوتویی دەروونەکانـدا نـامرن واتـە بەزینـدویی دەمێننـەوە ، واتـە مافـەکانی خـوا هـەموو ئـەو دەسـەڵاتانە دەگرێتـەوە کەدەروونـەکان هەیانـە هەریەکەیان بەپێی ڕێژەی توخمەکان لەپێکهاتەکەی خۆیاندا

پێشتر باسمانکرد جەستەی ئادەم هەتا (ڕوح ) ی بەبەردا نەکرا دەسەڵاتەکانی دەروونەکەی نەکەوتنەکار، وە( ڕوح )یش بەشێکە لەفەرمانی خوا،وەهەرکاتێك داواکاریـەکانی فرمانێـك لەلایـەن فـەرمان بەسـەردا کراوەکـەدا جێبـەجێ کـرا لــەکاتی دەستنیشــان کــراوی خۆیــدا ئــەوا فەرمانەکــە دەگەڕێتــەوە بــۆلای خاوەنەکـەی ، کەواتـە لەگـەڵ گەڕانـەوەی فەرمانەکـە دەبێـت جـارێکی تـر دەروونەکـە دەسـەڵات و ئەومافانـەی کەپێیـدرابوون لەدەسـتیان بـدات .کەواتـە ئـــەوەی کـــە دەمرێـــت دەروونەکەیـــە بـــەهۆی کۆتـــایی هـــاتن و گەڕانـــەوەی فەرمانەکـەی خـوا کـە (ڕوح)ە کەیـە ، لـە کاتێکـدا کەدەسـەڵاتەکانی دەروونەکـە نامرن لەخەوتویی دەروونەکەدا چونکە فەرمانەکە بەردەوامەو تەواونەبووە

ئینجـا خـوا دەفـەرموێت ( فیمسك التـی ) وە خـوا ئـەوە دەگرێتـەوە کـەمردن بەسەریدا زاڵ بووە کەدەروونەکەیەتی

کەواتــە پــەروەردگار لــەکاتی مردنــی دەروونەکانــدا ئــەو دەروونــە دەگرێتــەوە کــەمردن بەســەریدا زاڵبــووە ، کەواتــە دەبێــت هــەموو دەروونــەکان لــەلای پەروەردگار بپارێزرێن تاکاتێکی دیاریکراو کەرۆژی زیندوبوونەوەیە، هەر وەکو لەپێشەوە باسمانکرد کاتێك ئاو دەمرێندرێت تەنها شێوەی دەرەوەی ئاوەکە بزردەبێــت و دیــوی نــاوەوەی ئاوەکــە کەدەروونەکەیــەتی لەلایــەن دروســتکەرەکەیەوە دەپارێزرێــت تائەوکاتــەی وویســتی لەســەرە دروســتی بکاتــەوە، ئینجــا دەروونــی ئاوەکــە دەگێڕێتــەوە نــاو یــەکگرتنی هیــدروجین وئۆکســجینەکە لەگــەڵ بــوونی هۆیــەکی یاریــدەدەر کەوویســتی دروســتکەرەکەیەتی، ئایــا ئــەو ئــاوەی کــەجاری دووەم دروســتدەکرێتەوە هەرهەمان ئاوی جاری یەکەم نییە؟ کەتینویەتی دەشکێنێ وئاگر دەکوژێنێتەوە ؟ کەواتــە هــەموو دەروونێــك تایبەتمەندیــەکی خــۆی هەیــە بــەپێی ڕێــژەی ئەوتوخمانەی کەبەشداری دەکەن لەپێکهاتەی جەستەکەیدا و لەکاتی مردنیدا دیــوی دەرەوەی لەبەریــەك هەڵدەوەشێت، وەدەبێتــەوە ئــەو خاکــەی کەلێیــەوە دروستکراوەو دەروونەکەشی لەلایەن پــەروەردگارەوە دەگیرێتەوەو لەشوێنێکدا دەپارێزرێت تاکاتی دروستکردنەوەی

( ویرســل الاخــری) وە لەگــەڵ ســەرەتای پێکهــاتنی هــەر پێکهاتەیــەکی تــردا دەروونێکــی تــر دەنێردرێت کەتایبەتە بەم پێکهاتە تازەیەوە تاکاتێکی دیاری کراو کە تەواوبوونی فەرمانی( ڕوح ) ە کەیە . کەواتە لێرەدا بیردۆزەی (تناسخ الارواح ) ڕەددەکرێتــەوە چــونکە وەکوباسمــانکرد ( ڕوح ) فــەرمانێکی خوایــە ئەوەی کەپەیوەندی بەکەسایەتی وڕەوشتی کەسێکەوە هەبێت دەروونەکەیەتی نــەك ( ڕوح ) ە کــەی ، واتــە ئەگــەر دوای سەدســاڵ لەجــەنگی جیهــانی دووەم کەسێك پەیــدابوو کەڕەوشــت وهەڵسوکەوت ومامــەڵکردنی لەگــەڵ کێشــەکاندا وەکو مامەڵەکردنی هیتلەر وابوو مانای ئەوە ناگەیەنێ کە( ڕوح )ە کەی هیتلەرە

بۆجارێکی تر بەکارهێنرابێتەوە ، بەڵکو نزیکی ڕێژەی توخمەکانە لەپێکهاتەی جەستەی ئەم دوو مرۆڤانەدا کەلەنزیکی دەروونەکانیاندا ڕەنگدەداتەوە زیادبوون یان کەم بوونی ڕێژەی هەرتوخمێك لەپێکهاتەی جەستەی هەرمرۆڤێکدا کاردەکاتە سەر گۆڕانی دەروونەکەی بۆنمونە خواردنی گەرای ماسی کەپێکهاتەیەکی دەوڵەمەندە لەڤیتامین ( ئی ) دەبێتە هۆی دڕکردنی مرۆڤ لەکاری جووت بووندا ، هەروەها ئاوی دومەڵان چاوێکی نەخۆشبوو چاك دەکاتەوە واتە ئەو پێکهاتانەی کە لەئاوی دومەڵاندا هەن قەرپۆی ئەوتوخمانە دەکەنەوە کەبوونەتە هۆی نەخۆش بوونی چاوەکە یان ئاوی دومەڵانەکە لەگەڵ پێکهاتەکانی چاوەکەدا کارلێکدەکەن و ئەو پێکهاتانە دروستدەکەنەوە کە چاوەکەیان پێچاکدەبێتەوە

قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صلى الله عليه وسلم

﴿الْكَمْأَةُ مِنَ الْمَنِّ الَّذِي أَنْزَلَ اللَّهُ، عَزَّ وَجَلَّ، عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ. وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ﴾ . صحيح مسلم بشرح النووي ٢ . ٣ ٥ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) فەرمووی:( دومەڵان لەو گەزۆوەیە کە خوای گەورە ناردیەخوارەوە بۆسەر نەوەکانی ئیسرائیل و ئاوەکەی چاك بوونەوەیە بۆچاو ).

کەواتە لەگەڵ گۆڕانی ڕێژەی توخمەکان لەپێکهاتەی جەستەی ئادەمیزاددا دەروونی ئەم ئادەمیزادەش دەگۆڕێت .

پێغەمبەری مەزنمان عیسا (سلاوی خوای لێبێت) فەرمووی : چرای جەستە چاوە ئەگەر هاتوو چاوی تۆ سادەبوو ئەوا جەستەت هەمووی ڕەوشەنە وە ئەگەر هاتوو چاوی تۆ شەڕانگێز بوو ئەوا جەستەکەت هەمووی تاریك دەبێت

( كتاب المقدس متى \ الاصحاح ٦ ص١١ )

کەواتــە چــاوەکان چــراوِ ڕەوشــەنی جەســتەی ئــادەمیزادن، بــەبێ هــیچ هەڵســوکەوتێك دەتوانرێــت لەڕێگــەی چــاوەکانەوە بەشــێك لەدەســەڵاتەکانی دەروونەکەی دیاری بکرێت، کە ئایا ڕووناکە کەمانای چاکەکاری دەگەیەنێت یان تاریکە کەمانای خراپەکاری دەگەیەنێت

زیادبونی خوێی چێشت لەجەستەی ئادەمیزاددا دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن کەدەبێتە هۆی مات بوونی هەندێك لەکۆئەندامەکان و هەڵچونی هەندێکی تریان ، بۆنمونە لەکاتی بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن لێدانی دڵ خێراتر دەبێت وهەست بەتەنگی هەناسەدان دەکرێت و بەشێوەیەکی گشتی مرۆڤەکە وەکو مرۆڤێکی ئارەزوو مردوو دەبیندرێت لەکاتێکدا دوای دابەزاندنی پەســتانی خوێنەکــە لێــدانی دڵ وهەناســەدان و ئارەزووەکــانی مرۆڤەکــە دەگەڕێنەوە سەر باری جارانی

ئەو فەرمانبەرانەی کە لەپێشەوە باسمانکردن کەبەسەر مرۆڤەوە داندراون لەکاتی گەڕانەوەی فەرمانەکەی خواداو لەکاتی هاتنی مردنی ئەو دەروونە، کارەکانیان کۆتایی پێدێت و پاشەکشێ دەکەن ومەیدانەکە بۆ فەرمان بەرێکی تایبەتمەند چۆڵدەکەن بۆ گەڕاندنەوەی فەرمانەکەی خوا ، ئەم فەرمان بەرە ناوی ( ملك الموت ) ە

وَمَا تَدْرِي نَفْسٌۢ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ﴿٣٤﴾ سُورَةُ لُقۡمَانَ

وە هیچ دەروونێك نازانێت لەکام خاکەدا دەمرێت

کەواتە دەست نیشانکردنی شوێنێك بۆمردنی کەسێك لەدەسەڵاتی ئادەمیزاددا نیە بەڵکو لەلایەن بەروەردگارەوە شوێنی مردن و گۆڕەکەی بۆ دیاریدەکرێت ، زۆر کەسی نەخۆش بۆچاکبوونەوە دەچێت بۆلای دکتۆرێك لەڕێگا یان لەلای دکتۆرەکە کۆچی دوایی دەکات ئەگەر نەخۆشەکە یان کەسوکارەکەی زانیبایان مردن لەوشوێنەیە هەرگیز ڕوویان لەوشوێنە نەدەکرد

کێ دەیزانی لەکوێ بەخاك دەسپێردرێت ؟ چەندین ڕۆڵەی بەئەمەکی ئەم گەلە کەبوونە قوربانی، گۆڕەکانیان کەوتۆتە ناو تاشە بەردو ئەشکەوت و وولاتانی هەندەران ، کێ دەیزانی نوگرە سەلمان چ خاکێکە کەدەبێتە گۆڕە کۆمەڵ بۆ پیر و گەنج ومندالانی ئەم میللەتە

كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٥٧﴾ العنكبوت

هەموو دەروونێك تامی مردن دەچێژێ و ئینجا بۆلای ئێمە دەگەڕێنەوە

لێـرەدا یاسـایەکی بنـبڕ هەیـە کەپـەروەردگار ڕایدەگەیـەنێت ئـەویش ئەوەیـە کەمردنی دەروونەکان بەئارەزووی خۆیان نیە ، بەڵکو بەئارەزووی خوایە واتە هـەموو دەروونێـك دەبێـت تـامی مـردن بچـێژێت ، کـە بێدەسـەلاتی ئـادەمیزاد دەگەیـەنێت بەرامبـەر بـەو وویسـتەی پـەروەردگار، ئینجـا دوای ئـەم مردنـە دەروونەکان بۆلای پەروەردگاریان دەگەڕێنەوە

وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَـٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ الأنبياء

وە ( ئـەی محمـد ) لـە پـێش تـۆوە نـەمریمان نەداوە بەهیچ کەسێك جاچۆن تۆ بمریت و ئەوان بەنەمری بمێنن

واتـە بڕیـارێکی بنـبڕە کـەس لـەئادەمیزادەکان بەنـەمری نامێنێتـەوە تاکۆتـایی بونـەوەر وە لەهـەمان کاتـدا گونجاوە لەدروستکراوە کـانی تـردا نەمری هـەبێت وەکو نەمردنی شەیتان و فریشتەکان

وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ........

﴿٦٨﴾ سُورَةُ الزُّمَرِ

وە فـوو بـە(صـور)دا کـرا وجاهەرچـی لەئاسمانـەکان وزەویـدان لـەهۆش خۆیـان چوون ومردن ، تەنها ئەوانەنەبێت کەخوا وویستی لەسەربوو کەنەمرن وبمێنن.

لێرەدا پەروەردگار باسی مردنی هەموو درووستکراوەکانی خۆی دەکات کە لە ئاسمانـەکان وزەویـدان ، تـەنها ئەوانـە نـەبێت کـەخوا خـۆی دەیـەوێت کـە

بەزیندوویی بمێننەوەو نەمرن .کەواتە جگە لەزەوی دەبێت دروستکراوەکانی پەروەردگار لەئاسمانەکانیش هەبن

( ابن سینائ و ابن طفیل و السهروردی )له ( حی ابن یقظان )پەنجەیان بۆ ئەوە درێژ کردووە کە هەریەکێك لەو ئەستێرانە تایبەتمەندی یەکی تایبەتیان هەیە بەبوونی ئەو دروستکراوانەی کە لەسەریان دەژیەن ، وە هەریەکێك لەو ئەستێرانە دانیشتوانێکی تێدانیشتەجێ کراوە کەدەگونجێن لەگەڵ سروشتی دەوروبەرەکەیاندا

بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە { حی ابن یقظان \ ملحق جریده المدی }

كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٣٥﴾ الأنبياء

هەموو دەروونێك تامی مردن دەچێژێ وە ئێمە تاقیتان دەکەینەوە بەتاقی کردنەوەی چاکەوخراپەکانتان وە بۆلای ئێمە دەگەڕێنەوە

كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴿١٨٥﴾ آل عمران

هەموو دەروونێك تامی مردن دەچێژێ و بەڵکو بەڕاستیش لەڕۆژی دواییدا پاداشتەکانتان بەتەواوەتی وەردەگرنەوە

ئینجا پەروەردگار ڕوودەکاتە دەروونەکان و ڕێگایان نیشاندەدات

يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ﴿٢٨﴾ الفجر

ئەی دەروونی دڵنیاکراو(٢٧) بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگاری خۆت (بەشێوەیەك) کە تۆ ڕازی بیت و خواش لێت ڕازی بێت.

واتە ئەی ئەودەروونەی کەئێمە دڵنیامان کردویەوە بەوەی کەچاکە بکەیت و لە خراپە دورکەویتەوە وهاوبەشی بۆپەروەردگارەکەت دانەنێیت وسەرپێچی فەرمانەکانی نەکەیت بگەڕێرەوە بۆلای پەروەردگاری خۆت گەڕانەوەیەك کە خۆت ڕازی بیت و خواش لێت ڕازی بێت

كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ سورة المدثر

هەموو دەروونێك بارمتەیە بەوەی کەدەستی کەوتووە

کەواتە هەموو دەروونێك وەکو بارمتە وایە بۆئەوکارەی کەدەیکات ئەگەر کارەکە لەلایەن پەروەردگارەوە وەرنەگیراو دژ بەوویستەکانی پەروەردگاربوو ئەوا دەروونەکە بارمتەیەو سزایەکەی لێوەردەگیرێت)

کەواتە هەموو شتێك بەپێی یاسایەودەروونەکەت کەفیلە بەوەی کەدەیکەیت

عنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ ( الْمَيِّتُ يُعَذَّبُ فِي قَبْرِهِ بِمَا نِيحَ عَلَيْهِ )

صحيح مسلم بشرح النووي ٢٠٩٣ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) فەرمووی :(مردوو ئازار دەدرێت لە گۆڕەکەیدا بەهۆی ئەوشینەی لەسەری دەکرێت).

گریان... دەربڕینی ناڕازی بوونێکی بێدەسەلاتی ولاوازی دەروونە واتە دەروونەکە دەسەلاتی نیە بەسەر ڕوداوەکەدا بۆیە دەگریەت وە ناڕازی بونەکەش لادانە لەوویست و فەرمانی خوا کەمردنە

أبــــــي هُرَيْرَةَ قَالَ: «أُرْسِلَ مَلَكُ الْمَوْتِ إِلَى مُوسَى عَلَيْهِ السَّلاَمُ فَلَمَّا جَاءَهُ صَكَّهُ فَفَقَأَ عَيْنَهُ فَرَجَعَ إِلَى رَبِّهِ فَقَالَ أَرْسَلْتَنِي إِلَى عَبْدٍ لاَ يُرِيدُ الْمَوْتَ فَرَدَّ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلَيْهِ عَيْنَهُ وَقَالَ: ارْجِعْ إِلَيْهِ فَقُلْ لَهُ يَضَعُ يَدَهُ عَلَى مَتْنِ ثَوْرٍ فَلَهُ بِكُلِّ مَا غَطَّتْ يَدُهُ بِكُلِّ شَعْرَةٍ سَنَةٌ قَالَ: أَيْ رَبِّ ثُمَّ مَهْ قَالَ الْمَوْتُ قَالَ فَالآنَ فَسَأَلَ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يُدْنِيَهُ مِنَ الأَرْضِ الْمُقَدَّسَةِ رَمْيَةً بِحَجَرٍ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: فَلَوْ كُنْتُ ثَمَّ لأَرَيْتُكُمْ قَبْرَهُ إِلَى جَانِبِ الطَّرِيقِ تَحْتَ الْكَثِيبِ الأَحْمَرِ».

سنن النسائي الصغرى ٢٠٧٩ الحديث الشريف

(( فریشتەی مردن نێردرا بۆ موسا(سلاوی خوای لێبێت) کاتێك کە هات بۆلای ، (موسا) لێیداو چاوی دەرهێنا، ئینجا ئەویش گەڕایەوە بۆلای پەروەردگاری وە ووتی منت نارد بۆلای بەندەیەك مردنی ناوێت ، ئینجا خوا چاوەکەی بۆ گێڕایەوەو فەرمووی بگەڕێوە بۆلای وە بەوبلێ دەستی لەسەر پشتی گایەك دانێت ، هەموو ئەوەی کەدەستی دایپۆشیوە بۆئەوبێت بۆ هەرموویەك سالێك تەمەن ( موسا ) ووتی ئەی پەروەردگار دوای ئەوە چیتر ، فەرمووی مردن (موسا ) ووتی:جا هەر ئێستا ، وە داوای لەخوای گەورە کرد کەنزیکی خاتەوە لەخاکی پیرۆز بەئەندازەی هەلدانی بەردێك

پێغەمبەر(سلاوی خوای لێبێت) فەرمووی ئەگەر لەوێ دەبووم جا گۆڕەکەیم نیشاندەدان لەتەنیشتی ڕێگاکە لەژێر تەپۆلکە لمێکی سوردا ))

قَالَ رَسُولُ صلى الله عليه وسلم : ( اثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ) . صحيح مسلم ١٨٩ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( دوو کردەوە لەمرۆڤەکان بێباوەڕیان تێدایە ، لەکەدارکردن لەڕەچەلەك وە شین و بابۆڕ لەسەر مردوو)

أبا سعيدٍ الخُدريّ رضيَ اللّهُ عنه قال : كانَ النبيّ صلى الله عليه وسلم يقولُ: (إذا وُضعت الجنازةُ فاحتمَلها الرِّجالُ على أعناقهم. فإنْ كانت صالحةً قالت : قدِّموني ، وإن كانت غيرَ صالحةٍ قالت لأهلها : يا وَيلَها، أين يذهَبونَ بها؟ يسمَعُ صوتَها كلُّ شيءٍ إلاّ الإنسانُ ، ولو سمِع الإنسانُ لصعِق) .

فتح الباري بشرح صحيح البخاري ١٢٩٠ الحديث الشريف

كاتى خۆى پێغەمبەر (سلاوى خواى لێبێت) دەيفەرموو :( كەمردووەكە خرايە ناو پێخەف وتەختى مردنەوە وە پياوان لەسەر شانەكانيان هەلّيانگرت ئەگەر چاكەكار بوبێ دەلێت بەرەوگۆڕ بۆپێشەوەم بەرن، ئەگەر چاكەكاريش نەبوبێت بەكەس وكارەكەى دەلێت ئەى هاوار بۆى ، بۆ كوێى دەبەن ؟ هەمووشتێك گوێى لەدەنگيەتى تەنها ئادەميزاد نەبێت ، وە ئەگەر ئادەميزاد گوێى لێبێت لەهۆش خۆى دەچێت )

ئينجا پێغەمبەرى خوا باسى چۆنيەتى پچڕانى ئەو پەيوەنديەمان بۆدەكات كە لە نێوان ئەومردووەو ژيانداهەبووە

قَالَ رَسُولُ صلى الله عليه وسلم : ( يَتبعُ الميتَ ثَلاثٌ، فيرجعُ اثْنَان، ويبقَى وَاحدٌ يتبعه أهلُهُ ومالُهُ وعملُه، فيرجعُ أهلُهُ ومالُهُ ويبقَى عملُه ).

جامع الترمذي ٢٤١٩ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوى خواى لێبێت) فەرمووى : ( سێ شت بەدواى مردوو دەكەون دووانيان دەگەڕێنەوەو يەكيان دەمێنێ كەس وكار و ماڵ وسامان و كردەوەكانى بەدواى دەكەون ، كەس وكار وماڵ وسامانەكەى دەگەڕێنەوەو كردەوەكانى دەمێننەوە لەگەڵيدا )

كەواتە ماڵەكەى هەرئەوەندە لەگەڵيدايە تاپارەى كفن وقەبر وخەرجى بەڕێوەبردنى ماتەمينيەكەى دەدات وەمنداڵ وكەس وكارەكەى هەرئەوەندە لەگەڵيدان تالەگۆڕى دەنێن ودواى تەواوبوونى ماتەمينيەكەى پەلەى ئەوەيانە خێرا ماڵەكەى بەشكەن

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم : ( إِنَّ الْمَيِّتَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ، إِنَّهُ لَيَسْمَعُ خَفْقَ نِعَالِهِمْ إِذَا انْصَرَفُوا ) . صحيح مسلم ٧١٦٢ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوى خواى لێبێت) فەرمووى :(مردووكاتێك كەخرايە گۆڕەكەيەوە بەڕاستى ئەو گوێى لەدەنگى نەعلەكانيانە كاتێك ئەوێ بەجێدەهێڵن).

ئینجـا باسـی بـاری بـوونی ئـەم مردووەمـان بۆدەكـات ئایـا بەیـەجگاری كوژێنراوەتەوە (shut down) یان لەگەڵ هەندێك پەیوەندی تـردا ماوەكە ئەو پەیوەندیانە هاتن دەكەوێتەوە گەڕ (stand by). لەسستەمی كۆمپیوتـەردا ئـەم باری مردنە زۆر ئاشكرایە دەتوانیت كۆمپیوتەرەكەت بە یەجگاری بكوژێنیتەوە تاخۆت نەیخەیتەوە كار نەكەوێتەوە كار ،یان كۆمپیوتەرەكەت بە شێوەیەكی وەها بكوژێنیتـەوە كاتێك كەنامەیـەك یـان پەیوەندی‌یـەكی تەلـەفۆنیت بۆهـات بەخەبـەردێت و كارەكـەی جێبـەجێ دەكـات، وبـەبێ ئاگـاداری تـۆ جـارێكیتر دەخەوێتەوە

ئینجا بۆتێگەیاندنی مرۆڤە زیندووەكان بەوەی كەكۆمپیوتەری مرۆڤە مردوەكان بەیـەجگاری نەكوژاوەتـەوە ئـەوا پێغەمبـەری خـوا پێمـان ڕادەگەیـەنێت كەهـەر پارچـەیەك لەپێكهاتـەی جەسـتەی مردووەكـە بـەمردوویی لەگۆڕەكەیـدا وەكـو پارچەكانی جەستەكەی وایە بەزیندوویی ، نابێت دەسكاری بكرێت و گۆڕەكە بشێوێندرێت

عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ : (كَسْرُ عَظْمِ الْمَيِّتِ كَكَسْرِهِ حَيًّا).

مسند الإمام أحمد ٢٤٢٧٨ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( شكاندنی ئێسكی كەسێكی مردوو وەكو شكاندنی ئێسكەكەی وایە كەزیندووە )

واتە چۆن مامەڵە لەگەڵ چەستەولاشەو بەشێكی زیندویەكدا دەكرێت دەبێت بە هەمان شێوە مامەڵە لەگەڵ جەستەو لاشەو بەشێكی مردویەكدا بكرێت

اطلَعَ النبيُّ صلى الله عليه وسلم على أهلِ القَليبِ فقال : ( وجَدْتُم ما وعَدَ ربُّكُمْ حَقًا ) فقيل له : تدعو أمواتًا ؟ فقال ما أنتم بأسْمَعَ منهم، ولكنْ لايجيبون ) .

فتح الباري بشرح صحيح البخاري ١٣٤٣ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) دیدەنی خەڵکی گۆڕستانی (القلیب) ی کرد وە ووتی ئەوەتان دیتەوانێ کەپەروەردگارەکەتان بەڕاستی وادەی پێدابوون؟ بەپێغەمبەریان ووت: بانگی مردووەکان دەکەی ؟ فەرمووی ئێوە لەوان چاکتر نابیستن، بەڵام ئەوان وەڵام نادەنەوە

مادام گوێیان لێیە کەواتە دەبێت هەبن ، وە مادام ناتوانن وەڵام بدەنەوە کەواتە هەبوونەکەیان تایبەتە بەگۆڕەوە ، کەکۆتای بەتاقیکردنەوەکەیان هاتووەو خراونەتە گۆڕەوەو ڕێگەیان پێدراوە کەگوێ بیستی دەنگەکانی دەرەوە بن بەڵام ڕێگەیان پێنەدراوە بتوانن وەڵام بدەنەوەو شتێك لەئەنجامی تاقیکردنەوەکانیان زیاد یان کەم بکەن

ئینجا بەگوێرەی پلەو پایەو کردەوەکانی مرۆڤەکان ، بارەکانی قۆناغی مردن دیاری دەکرێن

وَلَا تَقُولُوا لِمَن يُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتٌ بَلْ أَحْيَاءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ البقرة

وە بەوانە مەڵێن مردوو کەلەڕێگەی خوادا دەکوژرێن بەڵکو زیندون وبەڵام ئێوە هەستیان پێناکەن

کەواتە دەبێت چاووگوێ وهەستیارەکانمان سنورێکی دیاریکراویان هەبێت بۆ درککردن بەدروستکراوەکانی پەروەردگار ، زۆر شەپۆلی دەنگ هەیە ئادەمیزاد نایبیستێت ، بەڵام سەگ گوێ بیستی دەبێت ، هەر بۆیەشە بۆپاسەوانی دادەنرێت ، چاوی باز زۆر تیژترە لەچاوی ئادەمیزاد بۆیە بۆڕاوکردن بەکار دەهێندرێت ، لە قوڵای ئاسمانەوە نێچیرەکان لەسەرزەوی دەست نیشاندەکات کەواتە گونجاوە ئادەمیزاد ئەومردوانە وانەبینێت کەزیندون کە ئەم زیندویەتیەیان تایبەتیە بەوانەوە ، پاداشتێکە لەلایەن پەروەردگارەوە بەهۆی ئەو خۆبەخت کاریەی کەلەژیانی دونیادا کردویانە بۆپەروەردگارەکەیان

وَلَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَمْوَاتًا بَلْ أَحْيَاءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ آل عمران

**وه وادامەنێن ئەوانەی کەلەڕێگەی خوادا دەکوژرێن مردوون بەڵکو زیندون و لەلایەن پەروەردگاریانەوە بژێویان پێدەدرێت**
**ئاگاداری کردنەوەیەکە بۆئێمە کەبەڕاستی ئەوانەی لەڕێگەی خوادا تێکۆشاون و لەبەرچاوی ئێمە مردوون ، ئەوانە نەمردون وزیندون**

عن عُثْمَانَ بنِ عَفّانَ قال: (كَانَ النَّبيّ صلى الله عليه وسلم إِذَا فَرَغَ مِنْ دَفْنِ المَيّتِ وَقَفَ عَلَيْهِ فقالَ: اسْتَغْفِرُوا لأَخِيكُم وَاسْأَلُوا لَهُ بالتّثْبِيت فَإِنّهُ الآنَ يُسْأَلُ).

سنن إبي داوود ٣١٥١ الحديث الشريف

**(پێغەمبەر(سلاوی خوای لێبێت) کاتێك کە لەگۆڕنانی مردوو دەبۆوە لەسەری ڕادەوەستاو دەیگوت بۆی بپاڕێنەوەو خۆڕاگری بۆداواکەن چونکە ئەو ئێستا پرسیاری لێدەکرێت )**
**دیارە مردووەکە ڕووبەڕوی کارێکی سەخت دەبێتەوە بۆدیاریکردنی قۆناغی دوای مردن ، چونکە جۆری وەلامەکانە باری بوونی مردووەکە دەستنیشان دەکات لەگۆڕدا**

عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ قالَ: قالَ رَسُولُ صلى الله عليه وسلم
(إِذَا قُبِرَ الْمَيّتُ (أَوْ قالَ أَحَدُكُمْ) أَتَاهُ مَلَكَانِ أَسْوَدَانِ أَزْرَقَانِ يُقَالُ لِأَحَدِهِما الْمُنْكَرُ وَالآخَرُ النّكِيرُ. فَيَقُولاَنِ: مَا كُنْتَ تَقُولُ في هَذَا الرّجُلِ؟ فَيَقُولُ ما كانَ يَقُولُ هُوَ عَبْدُ الله وَرَسُولُه أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاّ الله وَأَنّ مُحَمّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُه

تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي ١٠٦٥ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاّوی خوای لێبێت) فەرمووی  کەمردوو لەگۆڕنرا (یان ووتی ئەگەر یەکێکتان لەگۆڕنرا) دوو فریشتەی ڕەشی چاوشین دێن بۆلای  بەیەکێکیان دەوترێت (المنکر) وە بەوەی تریشیان دەوترێت ( النکیر )، وەدەڵێن: دەربارەی ئەوپیاوە چیت دەگووت ؟ ئینجا دەیڵێت ئەوەی کە لەڕابردودا دەیگووت: ئەو پیاوە (محمد) بەندەی خوایەو نێردراوی ئەوە  من داندەنێم بەوەی کەهیچ پەروەردگارێك نیە تەنها الله نەبێت وبەڕاستی محمد بەندە ونێردراوی ئەوە.

قالَ رسُولُ صلى الله عليه وسلم: ( إِذَا مَاتَ الْمَيتُ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقعدهُ. بالغداة والعشيِّ فَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجنَّة، فَمِنْ أَهْلِ الْجنَّة  وإِنْ كانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، فَمِنْ أَهْلِ  النَّارِ، ثُمَّ يقَالُ: هذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ الله يَومَ الْقِيامَة)

جامع الترمذي ١٠٦٦ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاّوی خوای لێبێت) فەرمووی :(کە مردوو مرد شوێنەکەی خۆی نیشان دەدرێت  هەموو نیوەڕۆو ئێوارانێك، جا ئەگەر لەخەڵکی بەهەشت بوو ئەوا لە خەڵکی بەهەشتە  وە ئەگەر هاتوو لەخەڵکی ئاگر بووئەوا لەخەڵکی ئاگرە.جا پێی دەوترێت ئەوە شوێنەکەتە هەتا ڕۆژی دوایی خوا زیندووت دەکاتەوە).

- عن النبيِّ صلى الله عليه وسلم  قالَ: ( لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ الله ).

جامع الترمذي ٩٧٢ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاّوی خوای لێبێت) فەرمووی  ( لا الە الا اللە  لەمردووە کانتان بگەیەنن)  واتە لەکاتی سەرەمەرگی مردووەکانتان (لا اله الا الله) یان بەسەردا بخوێننەوەو فێریان بکەن بۆئەوەی دوا وێردی ژیانی سەردونیایان  داننان بێت

**بەتاك و تەنهایی پەروەردگارو بەئاسانی لەتاقیكردنەوەكانی گۆڕ ڕزگاریان ببێت**

قال رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم : (مَنْ كَانَ آخِرُ كَلاَمِهِ لاَ إِلَهَ الله إلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ).

عون المعبود بشرح سنن أبي داوود ٣١١٥ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی (هەركەسێك دوا وێردی لەژیانی دونیادا (لا اله الا الله) بێت مەگەر هەر چۆتە بەهەشتەوە).**

عن الْبَرَاءِ، عن النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم في قَوْلِهِ:

﴿يُثَبِّتُ الله الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ في الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ﴾ قال: (في الْقَبْرِ إِذَا قِيلَ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ وَمَا دِينُكَ وَمَنْ نَبِيُّكَ ؟ ).

جامع الترمذي ٣٢٢٩ الحديث الشريف

**لەپێغەمبەرەوە(سڵاوی خوای لێبێت) دەربارەی فەرموودەی پەروەردگار (خوا ئەوانە جێگیر دەكات كەباوەڕیان هێناوە بەووتەی جێگیركراو لەژیانی دونیاو لە دواڕۆژدا ) ووتی مەبەست لەوەیە ( لەگۆڕدا كاتێ كە پێیگوترا : كێ پەروەردگاری تۆیەو ئاینەكەی تۆچیە و پێغەمبەری تۆكێیە ؟ ).**

مِنْهَا خَلَقْنَـٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾ سُورَةُ طه

**لە خاك دروستمانكردون و بۆناو ئەوێ دەتانگێڕینەوەو لەوێدا جارێكی تر دەرتان دەهێنینەوە**

إِنَّ رَسُولَ الله صلى الله عليه وسلم قَالَ: (كُلُّ ابْنِ آدَمَ يَأْكُلُهُ التُّرَابُ إِلاَّ عَجْبَ الذَّنَبِ. مِنْهُ خُلِقَ وَفِيهِ يُرَكَّبُ). صحيح مسلم ٧٣٥٩ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( هەموو( لاشەی ) ئادەمیزاد گڵ دەیخوات تەنها كلێنچە نەبێت لەو دروستكراوەو لەویشەوە یەكدەخرێتەوە )**

ئایـا ئـەم هێزانەچـین کەدەبنـە هـۆی لەبەریـەك هەڵوەشـاندنەوەی جەسـتەی زیندەوەرەکان ؟

وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴿٧﴾ سُورَةُ الفَتْح

وە بۆ خوایە سەربازەکانی ئاسمانەکان وزەوی

عَنْ سَلْمَانَ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم عَنِ الْجَرَادِ ؟ فَقَالَ: (أَكْثَرُ جنود اللَّهِ. لاَ آكُلُهُ وَلاَ أُحَرِّمُه). سنن إبن ماجة ٣٢٩٣ الحديث الشريف

پێغەمبـەر (سـڵاوی خـوای لێبێـت) پرسـیاری لێکـرا دەربـارەی کوللـە فـەرمووی:

(زۆرینەی سەربازەکانی خوان من نەدەیخۆم ونەخواردنیشی قەدەغە دەکەم )

کەواتـە کوللـە هێزێکـی ئاسمانی و زەمینـی بـەتوانای پـەروەردگارە هـەرکاتێك وویسـتی لەسـەربوو کەتۆڵـە لەکەسـێك یـان گـەل و نەتەوەیـەك بکاتـەوە کەسەرپێچـی فەرمانـەکانی خوایـان کردبێـت ئـەوا ئـەم گـەل و نەتەوەیـە ئەگـەر خـاوەنی بـاخ و بێسـتان و دانەوێڵـە بـن ئـەم سـوپایەیان بۆدێـت و لەماوەیـەکی زۆرکەمدا بەهاریان لێدەکات بەپایز.

وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ﴿٣١﴾ سُورَةُ المُدَّثِّر

وە کەس نازانێت سەربازانی پەروەردگاری تۆ( چەندن ) تەنها خۆی نەبێت

واتە کەس نازانێت ژمارەو جۆرو ئەندازەی سەربازانی پەروەردگار چەندە تـەنها خـۆی نـەبێت ، سـەربازەکانی هێـزی بـا وسـەربازەکانی هێـزی تۆفـان هێـزە تایبەتیـەکانی بـەکتریاو مـارو دووپشـکەو هێـزی هاوبەنـدی نێـوان توخمـەکان هەموویان سەربازی پەروەردگارن بەهێزشێکی سوپای بەکتریا لەماوەی چەند هەفتەیەکدا جەستەی ئادەمیزاد لەبەریـەك هەڵدەوەشێندرێت سوپای کـرم و مێروو هەموو ژێرییەك درکیان پێدەکات وبەچاو دەیانبینێت

( کرمـەکانی زەوی و گیانـدارە پێوەدەرەکـان ڕۆڵێکـی گـەورە دەبیـنن لـە هەڵوەشاندنەوەی بەردەکان و ئامادە کردنی هۆکارەکانی گواستنەوە بەهۆی باو بارانـەوە چـونکە کرمـەکان بڕێکـی زۆر لـە قوڕوخـۆڵ بـەکاردێنن بۆئـەوەی

خواردنەکـەی خۆیـانی لێـوە دەربهێـنن .ئینجـا جـارێکی تـر ئـەو قـوڕە فـڕێ دەدەنـەوە ، وە وادادەنرێـت کـەژمارەی ئەوکرمانـەی کـە لەفـەدانێك زەویـدا هـەن ( ١٥٠٠٠٠ ) کـرم دەبـن ، وە لـەماوەی یـەك سـاڵدا لـەنێوان ( ١٠ - ١٥ ) تـەن لەوورده پێکهاتەی قوڕ وخۆڵ شیدەکەنەوە ) ( الجغرافیا العامه ص ١١٩ )

ئینجـا هـەموو ئـەو هێزانـەی کەپـەروەردگار مەبەسـتیەتی هێـرش دەکەنـە سـەر لاشـەکەو لەبەریـەکی هەڵدەوەشـێنن و دەیگەڕێننـەوە بـۆ ئەوتوخمانـەی کـە سـەرەتا لەخاکـەوە وەرگـیران وتـۆوی بـاوك وهێلکـەی دایکەکـەیان لێ پێکهـات ئەوەی کەدەمێنێت و لەیەك هەڵناوەشێتەوە تەنها کلێنچەکەیەتی

لـەڕژێمی کۆمپیوتـەردا چـەند شـێوازێك هەیـە بـۆ کۆکردنـەوە و هـەڵگرتن و گواستنەوەی بەرهەمێك یان زانستێك یـان چیرۆك وژیاننامـەی کەسێك بەهۆی ( فلۆپی دسك ) و ( سی دی ) و ( فلاش میمۆری ) یـەوە کەبەرهەمەکانیان لـە کۆمپیوتەرەکـەوە دەخرێتـە سـەرو دەتوانـدرێت هـەڵبگیرێن و لـەکاتی پێویسـت جارێکی تر بیانگەڕێنیتەوەو چەندین وێنەی وەکـو خـۆی بـەبێ زیادوکـەم لەبەر بگیرێتەوە

لەیەك ( سی دی ) دا دەتوانرێت هەموو قورئان یـان هـەموو ئینجیل یـان هـەموو تـەورات تۆمـار بکرێـت وبـەدەنگی چـەند خوێنـەرێك و چـەندین شـیکردنەوەو لێکدانەوەو بۆچونی جیاجیاو وەرگێڕانـی مەبەسـتەکان بۆ چەندین زمـانی جیـا جیـاو پیشـاندانی قورئانەکـە بـەپێی بەشـەکانی ( اجـزاء ) ، یـان نیشـاندانی هۆیـەکانی هاتنـە خـوارەوەی ئایەتـەکان، و زانسـتی فێربـوونی خوێندنـەوەی قورئـان (علـم التجویـد ) ودەزگایـەك بۆ گـەڕان بـەدوای مەبەسـتێکدا ( search ) بۆئـەوەی بـەزوترین کـات ئـەو مەبەسـتە بخاتـە بـەر دەسـتت ، هـەموو ئەمانـەو چـەندین ڕوونکردنـەوەی تـریش لەیـەك ( سـی دی ) دا کۆکراونەتـەوە کـە ئەگـەر بێتـو ئـەو ( سـی دی )ە نـەرم بکرێتـەوەو بکرێـت بەتۆپـەڵ زۆر زۆر لـە کلێنچـەی مرۆڤێك بچوکتر دەبێتەوە

کلێنچەی ئادەمیزاد ( سی دی ) یەکە پەیوەندی بەهەموو قۆناغەکانی بوونی ئەو کەسەوە هەیە لەچۆنیەتی پێکهاتەی ئەوهێلکەو تۆوەی کەلێی پێکهاتووە تا زانیاریەکانی ماوەی ناومنداڵدان و لەدایك بوون و پێکهاتەی جەستەو باڵاو قەڵەوی ولاوازی ورەنگی چاوو پێست وجۆرو رەنگی قژو ئاوازی دەنگ و ژیری و هەموو هەڵسوکەوتێك لەجووڵەوکارو بۆچون ودرۆودزی و داوێن پیسی و خیانەت و خۆفرۆشی وخواپەرستی وچاکەکردن وخراپەکردن وهەرچیەك کە بەبیری ئەم مرۆڤەدا هاتبێت بەچاکە یان بەخراپە بەنهێنی یان بەئاشکرا ڕۆژانە لەلایەن ئەوکارمەندانەی کەلەپێشەوە باسمانکردن کەپەروەردگار بە ( کراما کاتبین ) ناویان دەبات دەنوسرێنەوەو لەناو کۆمپیوتەری ئەو ئادەمیزادەدا کۆدەکرێنەوە لە ( سی دی ) یەکدا کە ناوی کلێنچەیەو لەگۆڕدا هەڵدەگیرێن تاکاتی زیندوکردنەوە

قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ حَرَّمَ عَلَى الأَرْضِ أَنْ تَأْكُلَ أَجْسَادَ الأَنْبِيَاءِ عَلَيْهِمُ السَّلاَمُ». السيوطي في شرح سنن النسائي ١٣٤٤

پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( بەڕاستی خوای گەورە لە زەوی قەدەغە کردووە کەلاشەی پێغەمبەران بخوات ، سەلامی خوایان لێبێت )
واتە لاشەی هەموو پێغەمبەرەکان بەبێ مۆمیاکردن وەکوخۆیان دەمێنن وخاك توانای بەسەر لێکهەڵوەشانەوەیاندا نیە کەواتە لاشەی پێغەمبەرەکان پێك هاتەیەکی تایبەتن لەچاو ئەوانەی کەپێغەمبەرنین، هەربۆیەشە دەروونی پێغەمبەرەکان زۆر پاکتر و زاناو زیرەکترو خۆڕاگر تر و لێبوردە ترو دووربین تر بوون لەخەڵکی تر

إِنَّ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ: (إِنَّ الْقَبْرَ أَوَّلُ مَنْزِلٍ مِنْ مَنَازِلِ الآخِرَةِ فَإِنْ نَجَا مِنْهُ فَمَا بَعْدَهُ أَيْسَرُ مِنْهُ، وَإِنْ لَمْ يَنْجُ مِنْهُ فَمَابَعْدَهُ أَشَدُّ مِنْهُ).
جامع الترمذي ٢٣٤٥ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلأوی خوای لێبێت) فەرمووی ( بەڕاستی گۆڕ یەكەم هەوارگەیە لە هەوارگەكانی ڕۆژی دوایی، ئینجا ئەگەر ڕزگاری بوو ئەوا ئەوەی كەبەدوایدا دێت لەو ئاسانترە وەئەگەر لەم هەوارە ڕزگاری نەبوو ئەوا ئەوەی كەبەدوایدا دێت لەوتوندوتیژترە )

قَالَ رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم : (إِنَّمَا الْقَبرُ رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ، أَوْ حُفْرَةٌ مِنْ حُفَرِ النَّارِ) . جامع الترمذي ٩ ٥ ٢ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلأوی خوای لێبێت) فەرمووی ( بەڕاستی گۆڕ یان ژوورێكە لە ژوورەكانی بەهەشت یان چاڵێكە لەچاڵەكانی ئاگر )

قَالَ رَسُولُ صلى الله عليه وسلم : ( مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَوْ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ إِلا وَقَاهُ الله فِتْنَةَ الْقَبْرِ ) . جامع الترمذى ١٠٦٨ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلأوی خوای لێبێت) فەرمووی ( هیچ موسوڵمانێك نیە كەڕۆژی هەینی یان شەوی هەینی بمرێت مەگەر پەروەردگار هەر دەیپارێزێت لەتاقیكردنەوەی ناوگۆڕ )

كەواتە پیرۆزیەك هەیە لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ شەوورۆژی هەینی

زَارَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم قَبرَ أُمِّهِ فَبَكَى وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ . فَقَالَ: ( اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي فِي أَنْ أَسْتَغْفِرَ لَهَا فَلَمْ يَأْذَنْ لِي . وَاسْتَأْذَنْتُ رَبِّي فِي أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا فَأَذِنَ لِي، فَزُورُوا الْقُبورَ. فَإِنَّهَا تُذَكِّرُكُمُ الْمَوْتَ ) .

سنن إبن ماجة ١٦١٨ الحديث الشريف

پێغەمبەر(سلأوی خوای لێبێت) سەردانی گۆڕی دایكی كرد وە گریاو ئەوەی لەدەوریشی بوون بەگریانی هێنان وەووتی :( داوای مۆڵەتم لەپەروەردگارم كرد

بۆ ئەوەی بۆی بپاڕێمەوە وە ڕێگەی پێنەدام داوای مۆڵەتم لەپەروەردگارم کرد بۆئەوەی کەسەردانی گۆڕەکەی بکەم وەڕێگەی پێدام ، ئینجا ئێوە سەردانی گۆڕەکان بکەن بەڕاستی گۆڕەکان مردنتان دێنێتەوە یاد)

عَنْ جَابِرٍ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ أَنْ يُكْتَبَ عَلَى الْقَبْرِ شَيْءٌ.

سنن إبن ماجة ١٦٠٨ الحديث الشريف

پێغەمبەر(سڵاوی خوای لێبێت)نەنگی لەوەکردووە کەشتێك لەسەرگۆڕ بنوسرێت. کەچی لەووڵاتی ئێمەدا گۆڕو کێلە بەردەکان بوون بەدیوانی ئەدیبان ولاپەڕەی هەڵوێستی چەوت بۆشێواندنی مێژوو ، لەسەر گۆڕی خۆفرۆشێك دەنوسرێت شەهیدی ڕێگای ڕزگاری ، وە بۆڕازی کردنی خوا وچاك فرۆشتنی کێلەکانیش ( الفاتحە ) و ( کل نفس ذائقة الموت )یش دەنوسرێت

عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم قَالَ: ( لَوْلاَ أَنْ لاَ تَدَافَنُوا لَدَعَوْتُ اللَّهَ أَنْ يُسْمِعَكُمْ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ ) .

صحيح مسلم بشرح النووي ٧١٦٣ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کەیەکتری نەنێژن ئەوا داوام لەخوا دەکرد گوێ بیستان بکات لەئازارەکانی قەبر )

أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ : ( إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاَثٍ : صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ ).

صحيح مسلم بشرح النووي ٤١٧٩ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی ( ئەگەر ئادەمیزاد مرد ئەوا کردەوەکانی لێیدەپچڕێن تەنها لەسێ شتدا نەبێت خێرێکی بەردەوام ، یان زانستێك کەڵکی لێوەربگیرێ ، یان کوڕێکی چاکەکار بۆی بپاڕێتەوە )

واتە کەمرۆڤ مرد ئەوا کردەوەکانی لەژیانی دونیادا کۆتاییان پێدێت تەنها لەسێ بواردا نەبێت کە لەپاش خۆی لەژیانی دونیادا بەجێی هێشتون و دوای مردنیشی کەڵکیان لێوەردەگرێت خێرو چاکەیەکی بەردەوام وەکو دروستکردنی قوتابخانە و نەخۆشخانە و ....وە هەتا ئەم دامەزراونە بمێنن خێرو چاکە بۆخاوەنە مردووەکەیان دەنوسرێت یان بەجێهێشتنی زانستێك لەدوای خۆی کەکەڵك لەوزانستە وەربگیرێت وەکو زانستە پزیشکیەکان و زمانەوانی و دەروون ناسی و ئاین و مێژوو کە ئەو زانستیانە هەتابخوێندرێن خێرو چاکە بۆ مردووەکە دەنوسرێت یان بوونی کوڕێك یان کچێکی چاکەکار چاکە بۆ باوکەکەیان بکەن و بۆی لەخوا بپاڕێنەوە

أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم قَالَ: (مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ).

سنن إبي داوود ، ٢٣٣٢ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاَوی خوای لێبێت) فەرمووی :( کەسێ مرد وە ڕۆژوی لەسەر بوو ، ئەوا جێنشینەکەی دوای خۆی لەجیاتی ئەو بەڕۆژوو دەبێت )

کەواتە پێویستە ئەڕۆژوانە بۆمردووەکە جێبەجێ بکرێن ، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت لەدەفتەری قەرزەکانی پەروەردگاردا کەسێك دەتوانێت قەرزێك لەجیاتی یەکێکی تر بداتەوەو بەگەورەیی و لێبوردەیی پەروەردگار لەڕۆژی لێپرسینەوەدا ئەم قەرزانە ڕەش بکرێنەوە ئەگەر خوا وویستی لەسەربێت

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتِ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم عَنْ أَبِيهَا مَاتَ وَلَمْ يَحُجَّ

قَالَ: ( حُجِّي عَنْ أَبِيكِ ) . السندي في شرح سنن النسائي ٢٦٢٤ الحديث الشريف

ئافرەتێك پرسیاری لەپێغەمبەر (سلاَوی خوای لێبێت) کرد دەربارەی باوکی کەمردووەو حەجی نەکردووە فەرمووی ( لە جیاتی باوکت حەج بکە )

کەواتە ئەوکەسەی کەپابەندە بەئاینی ئیسلامەوە ئەگەر بۆی نەکرا حەج بکات وە مرد ئەوا پێویستە کەس وکارەکەی حەجی بۆبکەن

کەواتە دەبێت هەمووشتێك بگات بەمردووەكە ئینجا ئەوشتانە دوعا و پاڕانەوە وحەج بۆكردن و ڕۆژوو بۆگرتن و قورئان خوێندنبن یان خێركردن بێت بۆی بەنهێنی و بەئاشكرا

عبد الله بن أَبِي قَتَادَةَ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ (أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم أُتِيَ بِرَجُلٍ لِيُصَلِّيَ عَلَيْهِ. فَقَالَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم: صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ. فَإِنَّ عَلَيْهِ دَيْنًا)

تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي ١٠٦٣ الحديث الشريف

(پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) هاتە سەر پیاوێكی مردوو بۆئەوەی نوێژی لەسەر بكات وەفەرمووی نوێژ لەسەر هاوڕێكەتان بكەن ، بەڕاستی ئەو قەرزێكی لەسەرە)

كەواتە ئەگەر یەكێك مردو لەژیانیدا هەموو نوێژەكانی بەتەواوی جێبەجێ نەكردبوو پێویستە هاوڕێ موسوڵمانەكانی نوێژی بۆبكەن بۆئەوەی بە قەرزداری نەچێتە بەردەمی پەروەردگار

عن عُقْبَةَ بنِ عَامِرٍ: (أَنَّ رَسُولَ الله صلى الله عليه وسلم خَرَجَ يَوْماً فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ صَلاَتَهُ عَلَى الْمَيِّتِ ثُمَّ انْصَرَفَ).

عون المعبود بشرح سنن أبي داوود ٣٢٢٢ الحديث الشريف

(پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) ڕۆژێكیان چووە دەرەوەو نوێژی كرد لەسەر خەڵكی ئوحود نوێژەكەی نوێژكردن بوو لەسەر مردوو ئینجا ڕۆیشت)

واتە چوو بۆسەر گۆڕی مردووەكانی ئوحود وە نوێژی لەسەر كردن نوێژێك لەسەر گۆڕی مردووەكان وەكو وەفاو یادو بیرەوەریەك بۆ ئەوهاوڕێیانەی كە لەگەڵیدابوون و لەشەڕەكەدا شەهیدبوون

كەواتە چۆن دەگوترێت هیچ شتێك ناگات بەمردوو ؟ لە كاتێكدا كەمردووەكان هەن بۆقۆناغێكی تایبەت

ئەوانەی کەلەسەروە باسمانکردن هەموویان پشتیوانی بەهێزن بەوەی کەمردن کۆتایی باسەکەنیە ، بەڵکو مردنیش قۆناغێکە وەکو قۆناغەکانی تری بوون کە تایبەتمەندی خۆی هەیەو پێویستی بەهەناسەدان وجووڵە نیە وەڕێگەی پێنەدراوە کەبدوێ و ڕێگەی پێدراوە کە گوێ بیستی دەنگەکانی دەرەوەی گۆڕبن   وە ئەو فەرمان بەرانەش کەلەبوونی قۆناغی مردن لەگەڵیدان هەواڵەکانی دەرەوەی گۆڕی پێڕادەگەیەنن وهەواڵەکانی خۆی بەکەس و کارەکەی ڕادەگەیەنن لەڕێگەی خەونەوە   زۆرجار لەکاتی ڕوودانی خۆشیەك یان کارەساتێك لەناو خێزانێکدا مردووەکانی ئەم خێزانە لەڕێگەی خەونەوە دێن بۆسەردانی خێزانەکانیان ، یان هەرنەبێت بەهۆی مردویەکی ترەوە هەست وبیروڕاو بۆچوونی خۆیان بۆ کەس وکارەکەیان دەنێرن

کەواتە مردووەکان بێئاگانین بەلأم کزی و بێدەسەلأتی ئێمە ناتوانێت بیان بینێت و گوێمان لەدەنگیان بێت ، وەکو لەپێشتر لەسستەمی کۆمپیوتەرەکەدا باسمانکرد مرۆڤی مردوو لەلایەن پەروەردگارەکەیەوە یەکجاری نەکوژێنراوەتەوە ( shut down) بەڵکو کوژاندنەوەیەکی تایبەتە لەگەڵ هەموو پەیوەندی یەکدا بەخەبەر دێت ( stand by ) و کارە تایبەتیەکانی جێبەجێ دەکات وەکو وەرگرتنی تەلەفۆن ونامە و....جارێکی ترخەوی لێدەکەوێتەوە



کوژاندنەوە ( shut down ) واتە کار ڕاگرتنی کۆمپیوتەرەکە هەتا لەلایەن خاوەنــە کەیــەوە پێنەکرێتــەوە ناکەوێتــەوەکار ئینجـا دروسـت کەرەکەشــی دەتوانێت ووشەی نهێنی(password) بەکاربهێنێت بەشێوەیەك لەخۆی زیاتر کەسی تر نەتوانێت کۆمپیوتەرەکە بخاتەوەکار

مانــەوە لەگــەڵ :(stand by) واتــە کوژاندنــەوەی کۆمپیوتەرەکــە بــەوەی کــە کوژێندراوەتەوە لەلایەن خاوەنەکەیەوە، بەلاٌم لەگەڵ کوژاندنەوەکەیـدا فـەرمانی پێکـراوە کەلــەکاتی پەیوەنـدی پێـوەکردنی ئـەو پەیوەندیانــەی کەخاوەنەکـەی ڕێگـەی پێـداون و دەستنیشـانی کـردون ئـەوا کۆمپیوتەرەکە دەکەوێتـەوە کـارو ئـەو پەیوەندیانــەی کـەپێوەی کـراون وەریـان دەگرێـت وعـەمباریان دەکـات و جارێکی تر بەشێوازی ( stand by ) دەکوژێتەوە

بۆ نمونە: تۆ کۆمپیوتەرەکەت بەمانەوە لەگەڵ تەلەفۆنەکەتدا بە ( stand by ) کوژاندەوە ، هەرکاتێك تۆ خەوتوویت یان لەماڵەوە نەبیت تەلەفۆنێکت بۆهـات ئـەوا کۆمپیوتەرەکـە بـەئیش دەکەوێتــەوەو وەلاٌمـی تەلەفۆنەکـەت بەوشـێوەیە دەداتەوە کەخۆت ڕاتسپاردووە ئینجا جارێکی تـر دەکوژێتـەوەو دەمێنێتـەوە تـا نامەیەك یان تەلەفۆنێکی تری بۆدێت

کەواتــە بەلاتــەوە سـەیر نـەبێت سـوڕەتێکی ( الفاتحـە ) ، یـان پاڕانەوەیـەك بـۆ مردوویەك بنێریت ، کۆمپیوتەرەکەی بەشێوەی ( stand by ) وەری دەگرێت و خەزنی دەکات ، وە ئەگەر شتێك لـەماڵ و سامان بکـەیت بـەخێر بۆمردووەکـەت ئەوە لـەڕێی تـۆڕە پەیوەندیـەکانی نێـوان کۆمپیوتەرەکانـەوە ( network ) هـەر کـەتۆ لێـرە خێرەکـەت کـرد بـۆ ئـەومردووە یەکسـەر دەچـێتە سـەر ژمـارەی حسابەکەی ئـەو لـەناو کۆمپیوتەرەکـەی بـانکی پـەروەردگاردا و لەڕەسـیدەکەی زیاددەکات

تـا ئێـرە مردنـە یەکەمیەکـەی تاکەکانـە لەبەشـەکانی داهـاتوودا باسـی مـردن و نـــەمانی هـــەموو بوونـــەوەر دەکـــەین بۆئامـــادەبوون بۆقۆنـــاغێکی تـــر کـــە زیندوبوونەوەیە

## بەردەوامی ژیان بەرە و کاتی کۆتایی

دوای ناردنە خوارەوەی ئادەم وحەوا ژیانی ئادەمیزاد لە یەکەم خێزانەوە دەستی پێکرد

حەوا بەهەموو سك پڕبوونێك کوڕێك وکچێکی دەبوو ، بۆ بەردەوام بوونی ژیان وزاوزێ کردن تاکەڕێگە ئەوەبوو کەئەو کوڕو کچانە کاری ژن ومێردایەتی ئەنجامبدەن بەپێی یاسایەك کەهەموو جووتەیەك لەیەکتری قەدەغە کران و کچی ئەمساڵ ڕەواکرا ببێت بەهاوسەری کوڕی ساڵی داهاتوو، وە کچی ساڵی داهاتووش ڕەواکرا کەببێت بەهاوسەری کوڕی ئەم ساڵ

کێشەیەك لەنێوان دوو کوڕی ئادەم قابیل و هابیل دا پەیدابوو لەسەر هاوسەریەتی خوشکەکانیان ، خوشکەکەی قابیل ناوی ( وضيئة ) بوو کە جوانترو بەرچاوتربوو لە ( دميمة ) ی خوشکی هابیل ، بۆیە قابیل ڕازی نەبوو کە دەستی لێهەڵبگرێت بۆهابیلی برای و داوای ئەوەی دەکرد کەخوشکەکەی خۆی دەوێت بۆهاوسەریەتی ، ئادەم کەوتە ناوانیانەوە داوای لێکردن هەریەکێك لەوان قوربانیەك بکات بۆخوا ، قوربانی کامەیان لەلایەن خواوە وەرگیرا ئەویان خاوەنی مافەکەیە ( تفسير ابن كثير اية ٢٧ المائدة )

قوربانیەکەی هابیلی برا بچوك وەرگیرا ، کە ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی قابیل ئەوەندەیتر دڕببێت وهەڕەشەی کوشتن لەهابیل بکات

وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ٱبْنَىْ ءَادَمَ بِٱلْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ ٱلْـَٔاخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ ۖ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ المائدة

وە هەواڵی کوڕەکانی ئادەم بەسەریاندا بخوێنەوە بەڕاستی کەقوربانیانکرد جا لەیەکێکیان وەرگیراو لەوەی تریان وەرنەگیرا ، ئەوەی کەلێی وەرنەگیرا بەوەی

تریانی گووت هەر دەتکوژم ئەوەی تریان ووتی:( تاوانی من نیه کەقوربانیەکەی تۆ وەرنەگیراوە ) بەڕاستی خوا قوربانی لەخواپەرستەکان وەردەگرێت

لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ سُورَةُ المَائِدَة

جا ئەگەر دەستت بۆ من درێژکرد بۆئەوەی کەبمکوژی ئەوا من دەست بۆتۆ درێژ ناکەم بۆئەوەی کەبتکوژم ، من لەخوا دەترسم کەپەروەردگاری جیهانیانە.

إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ سُورَةُ المَائِدَة

من دەمەوێت بگەڕێیتەوە بەتاوانەکەی من و تاوانەکەی خۆتەوە جادەبیت بە یاوەرانی ئاگر، وەئەوە پاداشتی ستەمکارانە

فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ قَتۡلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾ المَائِدَة

جا قابیل خۆی بەختکرد بۆ کوشتنی براکەی وەکوشتی، بەو کارەی چووە ریزی زەرەرمەندەکانەوە

فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابٗا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ﴿٣١﴾ سُورَةُ المَائِدَة

ئینجا خوا قەلە ڕەشەیەکی نارد لەزەویدا دەگەڕا بۆئەوەی نیشانی بدات چۆن عەیب وعاری براکەی بشارێتەوە ، قابیل ووتی وای بۆ من ، بێ توانابووم لەوەی وەکو ئەو قەلەڕەشە بم عەیب وعاری براکەم بشارمەوە ، جا چووە ڕیزی پەشیمان بووەکانەوە

ئینجا پەروەردگار دەرگای ڕۆشنبیری و زانیاریەکانی بۆئادەمیزاد کردەوە ، بۆ ئەوەی وورده وورده لەگەڵ بوونی لەناو ژیانی سەرزەویدا خۆی بگونجێنێت و چاو بەکارەکانی خۆیدا بگێڕێتەوەو پەیڕەوی ئادابە بنەڕەتیەکان بکات

مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ
أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ
أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم
بَعْدَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾ سُورَةُ المَائِدَةِ

**لەوپێناوەدابوو کە لەسەر نەوەکانی ئیسرائیلمان نووسی کەهەرکەسێك خاوەن دەروونێك بکوژێت بێ ئەوەی خاوەن دەروونێکی کوشتبێت یان خراپەکاریەکی لەزەویدا کردبێت ، وەکوئەوە وایە هەموو خەڵکی تێکڕا کوشتبێت ، وە ئەوەش کە خاوەن دەروونێکی زیندوکردەوە وەکو ئەوە وایە کەهەموو خەڵکی تێکڕا زیندوکردبێتەوە ، وە بەدڵنیاییەوە پێغەمبەرانی ئێمە هاتن بۆلای ئەوان بەبەڵگەی ڕوونەوە ، ئینجا بەڕاستی لەدوای ئەوە زۆر لەوان لەسەر زەوی زیادە ڕەویانکرد**

**واتە ئەوەی کەسێکی بێتاوان بکوژێت وەکو هەموو خەڵکی بەتێکڕایی کوشتبێت وەهایە ، وە ئەوەی کەسێکی بێتاوانی لەکوشتن ڕزگار کردبێت و بوبێتە هۆی ئەوەی بەزیندویی بمێنێتەوە وەکو هەموو خەڵکی لەکوشتن ڕزگار کردبێت و بووبێتە هۆی مانەوەیان بەزیندویی وەهایە**

**واتە یەکەم یاسا بۆمرۆڤایەتی دەربارەی کوشتن و تۆڵە سەندنەوە لەدوای کوشتنی هابیل لەلایەن قابیلەوە بۆنەوەکانی یعقوبی کوڕی اسحاقی کوڕی ئیبراهیم پێغەمبەر هات (سلاّوی خوایان لە سەر بێت ) و هەتا ئێستاش لە یاساکانی ئیسلامدا بەردەوامە**

**ئینجا پەروەردگارو پێغەمبەرەکانی و بەرنامەکانی لەنەوەکانی ئادەمەوە هەتا ئێستا کە بەم شێوەیە لەخزمەتی مرۆڤایەتیدان وداوا دەکەن کەمرۆڤی بێتاوان نابێت سزای ڕەشە کوژی بدرێت وە هەرکەسێك سەرپێچی بەندەکانی ئەم**

بڕیارەبکات ئەوا تووشی چارەنووسێکی ڕەش دەبێت ، بۆیە پەروەردگار لە سزای ئەوانەدا دەفەرمووێت
إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ المائدة
بەڵکو پاداشتی ئەوانەی دژ بەخواو پێغەمبەرەکانی دەجەنگن و هەوڵی خراپەکاری دەدەن لەسەرزەوی ئەوەیە کەبکوژرێن یان لەداربدرێن یان دەست و قاچەکانیان بەڕاست وچەپی ببڕدرێن یان دوربخرێنەوە لەسەر زەوی، ئەوە بۆ ئەوان سوکایەتیە وەلەڕۆژی دوایشدا سزاو ئازارێکی گەورە هەیە بۆئەوان
واتە ئەوانەی دژایەتی خواو پێغەمبەرکانی و بەرنامەکانی دەکەن دژ بە یاساکانی مافی مرۆڤ ، جا هەرکەسێك دژایەتی ئەم ئەم بڕیارە بکات یان دەبێت بکوژرێت یان لەداربدرێت یان دەستی ڕاست وقاچی چەپی یان دەستی چەپ و قاچی ڕاستی ببڕدرێت یان دوور بخرێتەوە لەسەر زەوی لە شوێنەکەی خۆیەوە بۆ شوێنێکی ناخۆشتر بەپێی ئەوتاوانەی کەکردویەتی
ئەم بڕیارە لەلایەن پەروەردگارەوە قەڵغانێکە بۆپاراستنی هەموو مافەکانی مرۆڤ لەبەرامبەر ستەمکارو سەرپێچی کەرەکاندا
ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا پەروەردگار دەرگای لێبووردن و بەزەیی خۆی ئاوەلا کردۆتەوە بۆئەوانەی کەپەشیمانی دەنوێنن بۆیە دەفەرمووێت
إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣٤﴾ المائدة
تەنها ئەوانەی کە پەشیمان بوونەوە پێش ئەوەی کە ئێوە دەسەلاتتان بەسەریاندا بشکێت ئینجا بزانن بەڕاستی خوا لێبووردەو بەبەزەییە
واتە ئەو بڕیارانەی سەرەوە ئەو تاوانبارانە ناگرێتەوە کە لەتاوانەکانیان پەشیمان ببنەوەوخۆیان بێن خۆیان بدەن بەدەستەوەو دان بەتاوانەکانیاندا بێنن جاچاك بزانن کەخوا لێبووردەوخاوەن بەزەییە

**کەواتە تاوانبار هەتا زوو خۆی بدات بەدەستەوە تاوانەکەی ئاسانترەو بەزەیی ولێبووردەی پەروەردگاریش لێیەوە نزیکترە**

**پێغەمبەر(سلاوی خوای لێبێت)دەست نیشانی هەندێك لەو گەل و نەتەوانە دەکات کە لەنەوەکانی ئادەمەوە پەیدا بوون دەفەرمووێت**

عن سمرة عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: «سَامُ أبو العَرَبِ وَحَام أبو الحَبَشِ ويَافِثُ أبو الرُّومِ». جامع الترمذي ٣٣٥٠

**پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) فەرمووی :**

**( سام باوکی عەرەبەو حام باوکی حەبەشەو یافث باوکی ڕۆمە )**

وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ إِدْرِيسَ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٥٦﴾ مريم

وَرَفَعْنَـٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ مريم

**وە لە قورئانەکەدا یادی ئیدریس بکەوە بەڕاستی ئەو ڕاستگۆو پێغەمبەر بوو وە پلەو پایەی ئەومان بەرزکردەوە بۆپلەیەکی بەرز**

إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمْرَٰنَ عَلَى ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾

ذُرِّيَّةًۢ بَعْضُهَا مِنۢ بَعْضٍ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ سورة آل عمران

**بەڕاستی خوا ئادەم و نوح و بەرەی ئیبراهیم و بەرەی عمرانی پاك کردەوەو هەڵی بژاردن بەسەر جیهانیاندا(٣٣)ئەوەو بەری هەندێکیان لەهەندێکیانن و خوا بیسەرو زانایە(٣٤).**

وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤﴾ إبراهيم

**وە هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردووە مەگەر بەزمانی گەل و نەتەوەکەی خۆی نەبێت ، بۆ ئەوەی بۆیان ڕوونکاتەوە ، ئینجا خوا ئەوەی کەوویستی سەری لێدەشێوێنێت وئەوەی کەوویستی ڕێگەی ڕاستی نیشاندەدات ، وەخوا ئەو کەسەیە کەکەس توانای بەسەردا نیەو کاردروستە**

ئادەم بیست کوڕ و بیست کچی هەبوو لەناویاندا هابیل و قابیل و صالح وعبدالرحمن کە بە عبدالحارث ناوی دەبرد وە ( ود ) کەپێی دەوترێت شیث وە پێشی دەوترێت خواداو ( تفسیر ابن کثیر ٢٣ سورة نوح )

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾ سُورَةُ العَنكبُوت

وە بە دڵنیاییەوە نوحمان نارد بۆسەر گەل و نەتەوەکەی وە لەناویاندا مایەوە هەزار ساڵ پەنجا ساڵ کەمتر ، ئینجا تۆفانەکە بردنی وئەوان ستەمیان لە خۆیان کرد

قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٦٠﴾ الأعراف

خەڵکانێك لەگەل و هۆزەکەیدا ووتیان ئێمە بەدڵنیاییەوە لەگومڕاییەکی دیاردا دەتبینین

قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى ضَلَٰلَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦١﴾ الأعراف

ووتی ئەی گەلەکەم گومڕایم تێدا نیە بەڵکومن پێغەمبەرێکم لەلایەن خوای جیهانیانەوە

ئینجا کەوای لێهات کۆمەڵگاکە لە ئەنجامی ژن و مێردایەتی نەوەکانی ئادەمدا بەپێی زانستە بۆماوەیەکان خەڵکەکان زۆر لەیەکەوە نزیك بوون و ڕەوشتە بۆماوەیەکان بەئاسانی دەگوازرانەوە لەوەچەیەکەوە بۆوەچەیەکی تر کۆمەڵگاکە وای لێهات نوح لەماوەی ( ٩٥٠ ) ساڵ لەناویاندا نەتوانێت بیانهێنێتە سەر ڕێگەی ڕاست بۆیە داوای لەپەروەردگار کرد کەتۆڵەیان لێبستێنێتەوە

قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِى وَٱتَّبَعُواْ مَن لَّمْ يَزِدْهُ مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارًا ﴿٢١﴾ نوح

نوح فەرمووی خوایە ئەوان لێم یاخی بوون، وە شوێن ئەوانە کەوتن کە ماڵ و سامان و کوڕەکانیان هیچیان لێزیاد ناکات مەگەر زەرەرمەندی نەبێت

وَقَالُواْ لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ وَقَدْ أَضَلُّواْ كَثِيرًا وَلَا تَزِدِ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَٰلًا ﴿٢٤﴾ سُورَةُ نُوح

وه ووتیان واز لەخواکانی خۆتان مەهێنن وه وازمەهێنن نە لە( ود ) و نە لە سواع و نه لەیغوث و یعوق و نسرا(٢٣)بە دڵنیاییەوه ئەوانە زۆر گومڕا بوون، ئەی خوایە هیچ بۆ ستەمکارەکان زیادمەکە مەگەر گومڕایی و سەر لێشێواوی نەبێت(٢٤).

وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ سُورَةُ نُوحٍ

وه نوح ووتی خوایە لەسەر زەوی شوێنەوارێکی بێباوەڕەکان مەهێڵە(٢٦)بەڕاستی ئەگەر تۆ بیانهێڵی بەندەکانت گومڕا دەکەن وەهیچ منداڵێکیان نابێت مەگەر هەرخراپەکاروبێباوەر دەبن(٢٧).

فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ أَنِ ٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ فَٱسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ مِنْهُمْ وَلَا تُخَـٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ﴿٢٧﴾ سُورَةُ المُؤْمِنُونَ

وه پەیامان بۆ کرد کەلەژێر چاودێری ئێمەدا کەشتیەکە دروست بکەو پەیاممانداییە کاتێك کەفەرمانەکەی ئێمەهات و ئاو لەناوتەندورەوه هەڵچوو، ئەوا لەهەموو جووتەیەك دوودانە و کەس و کارەکەت بخەرە ناو کەشتیەکەوه ، تەنها ئەوانە نەبێت لەواندا کەپێشتر باسی لێوەکراوه و لەگەڵم مەدوێ دەربارەی ئەوانەی ستەمیان کرد.

واتە پەیامی جاری یەکەم بۆدروستکردنی کەشتیەکە بووه لەژێر چاودێری خوادا ، وه پەیامی دووەم ئاگادارکردنەوه بووه لەلایەن خواوه کە فەرمانەکەی خوا هات و بینیت ئاو لەناوتەندوری نانکردنەوه هەڵدەچوو ئەوه نیشانەی دەست پێکردنی تۆفانەکەیە ، یەکسەر دوو دانە لەنێرەومێیە لەوانەی لەسەر زەوی هەن لەگەڵ کەس و کارەکەت و ئەوانەی کە لەگەڵتدان بیانخەرە ناو کەشتیەکەوه ، تەنها ئەوانە نەبێت کەپێشتر خوا باسی لێوەکردون کەڕزگاریان

نابێت ، وخوا داوا لەنوح دەکات دەربارەی ستەمارەکانیش دڵت نەرم نەبێت و هیچ داوایەکم لێمەکە

فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾ سُورَةُ المُؤمِنُون

ئینجا کەلەنگەرت گرت تۆو ئەوانەی کەلەگەڵ تۆدان لەسەر کەشتیەکە ئەوا بڵێ سوپاس بۆ ئەوخوایەی کەڕزگاری کردین لەگەڵ ستەمکار

وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ سُورَةُ المُؤمِنُون

وە بڵێ خوایە دام بەزێنە خوارەوە دابەزاندنێکی پیرۆز وەتۆ باشترینی دابەزێنەرەکانی

وَقِيلَ يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِى وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ سُورَةُ هُود

وە ووترا ئەی زەوی ئاوەکەت قووت بدەرەوەو ئەی ئاسمان خۆت بگرەوە لە باران باراندن و ئاوەکە کەم بۆوەو فەرمانەکەی خوا جێبەجێ کراو کەشتیەکە لەسەر چیای (جود ) لەنگەری گرت و ووترا تێداچوون بۆ گەل و نەتەوەی ستەمکار

لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات ئەو هەموو ئاوە زیادەی سەر زەوی قوتدرایە کوێی ناخی زەویەوە ؟ ئایا دەریا بەستەڵەکان بۆئەوە نەکراون کەتوانای کۆکردنەوەی ئاوی زیادەی سەرزەویان هەبێت لەباری بەستراویدا لەکاتێکدا کە دەسەلاتێك بتوانێت پلەی گەرمی ئەم دەریایانە دابەزێنێت ؟ وە بەپێچەوانەوە ئەگەر دەسەلاتێك بتوانێت پلەی گەرمی ئەم دەریایانە بەرزبکاتەوە نابێتە هۆی تواندنەوەی ئەوشاخە بەفرینانەی کەلەناو دەریا بەستەڵەکەکان بەرزکراونەتەوەو بە تواندنەوەیان نابێت بەتۆفان لەسەر زەوی ؟ بە دڵنیاییەوە ئاوە زیادەکان بەشێوەی بەستراوی لەدەریا بەستەڵەکەکاندا هەڵدەگیرێن بە هۆی باری بەستوییانەوە کەچڕیەکەیان دادەبەزێت و بارستاییەکەیان زیاد دەکات،

**دەتواندرێت لەسەر یەکتری کەڵکە بکرێن و بەرزبکرێنەوە وەکو شاخ کە دەتواندرێت ئاوێکی یەجگار زۆر لەسەر ڕووبەرێکی کەم عەمبار بکرێت لە باری بەستویدا ، وە بەپێچەوانەشەوە بەزیادکردنی پلەی گەرما دەتواندرێت بەفرەکە بتوێندرێتەوە وە بگەڕێندرێتەوە بۆسەرزەوی وەکەڵکی لێوەربگیرێت بۆ ئاودێری و ئاوەدانکردنەوە یان بۆ تۆفان و تێداچوون**

فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَصْحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلْنَٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٥﴾ العَنكبُوت

**ئینجا نوح وهاوڕێیانی کەشتیەکەمان ڕزگارکردن ، وە ئەوەمان کردە بەڵگە و نیشانە بۆ جیهانیان**

ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ سُورَةُ المؤمنون

**ئینجا لە دوای ئەوان گەل و نەتەوەیەکی ترمان دامەزراند**

فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ المؤمنون

**وە پێغەمبەرێکمان لەخۆیان نارد بۆناویان بۆئەوەی پێیان بڵێت خوا بپەرستن و بۆ ئێوە هیچ خوایەك نیە لەوزیاتر ، ئایا ئێوە لەخوا ناترسێن ؟**

**ئەو گەل و نەتەوەیە گەلی عاد بوو کەئەوانیش سەرپێچی فەرمانی خوایان کردوو خوا بەم شێوەیە لەناوی بردن**

وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾ الأعراف

**وە بۆ گەلی (عاد) هودی برایانمان بۆناردن ووتی ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن و بۆ ئێوە هیچ خوایەك نیە لەوزیاتر ، ئایا ئێوە لەخوا ناترسێن ؟**

قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِى سَفَاهَةٍ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾ الأعراف

**ئینجا ئەو خەڵکانەی کە بێباوەڕبوون لەگەلەکەیدا ووتیان ئێمە لەهیچ و پوچیدا دەتبینین وەئێمە واگوماندەبەین کەتۆ لەدرۆزنەکانی**

قَالَ يَٰقَوْمِ لَيْسَ بِى سَفَاهَةٌ وَلَٰكِنِّى رَسُولٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾
أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّى وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ الأعراف

**ووتی ئەی گەلەكەم من هیچ ویوچیم تێدانیە بەڵام ئەمن نادراوێكم لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە(٦٧)نامەكانی پەروەردگارتان پێڕادەگەیەنم وە من بۆ ئێوە نسحەت كەرێكی دەستپاكم(٦٨).**

**ئینجا كاتێك كە بێ هیوابوو لێیان:**

قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌ أَتُجَٰدِلُونَنِى فِىٓ أَسْمَآءٍ
سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم ﴿٧١﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا
وَقَطَعْنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَمَا كَانُوا۟ مُؤْمِنِينَ ﴿٧٢﴾ الأعراف

**ووتی بەدڵنیاییەوە پیسی وڕقێك بەسەرتانداكەوت ئایا ئێوە دم بەدمانێ لەگەڵ منـدا دەكەن لەسەر چەندناوێك كەخۆتان وباوانەكانتان ناوتان لێناون(٧١) بەبەزەییەك لەئێمەوە خۆی و ئەوانەی كەلەگەڵیدابوون ڕزگارمان كردن ، وەپاشەواری ئەوانەمان بڕی كەبەڵگەو نیشانەكانی ئێمەیان بەدرۆ هێنانەوەو خاوەن باوەڕ نەبوون(٧٢).**

وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا۟ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ
لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ
نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾ فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ ﴿٨﴾ سورة الحاقة

**وە بەڵام گەلی عاد ئەوە تێداچوون بەبایەكی ساردی سڕكەری توندوبەهێز ( ٦) بە سەریدا ناردن حەوت شەووهەشت ڕۆژان بەبەردەوامی جاگەلەكەت لە ناوبایەكەدا دەبینی بەزەویدا كەوتبوون وەكولاسكە خورمای ووشكی كلۆر وابوون(٧)جا ئایا دەبینی لەوان هیچ مابێتەوە(٨).**

**كەواتە بایە ساردە سڕكەرەكە بەیانییەك دەستی پێكردووەو داوی تێپەڕبوونی ڕۆژی هەشتەم ئێوارێ كۆتایی پێهاتووە كەدەكاتە ماوەی هەشت ڕۆژو ئەوەی دەكەوێتە نێوان هەشت ڕۆژەكەوە كەدەكاتە حەوت شەو كەواتە كات و ماوەی**

درێژی شەوی ١ / ١ دەکەوێتە ماوەی بزر بوونی خۆر و ودەرکەوتنی تاریکایی نێوان ڕوناکیەکانی ١ / ١ و ٢ / ١ کە لە ئاوابوونی خۆری ڕۆژی ١ / ١ دەستی پێکردووە هەتا خۆرهەلاتی ڕۆژی ٢ / ١ هەروەها پەروەردگاریش پەنجەی بۆ ئەوە درێژکردووە سەرەتای دروستکردنی ئەم بوونەوەرە بەسەرەتای ڕۆژ دەستی پێکردووەو شەش ڕۆژی خایاندووە ، کەواتە لەسەر چ بنەمایەك شەوی ١ / ١ نیوەی یەکەمی هی ٣١ / ١٢ بێت وە نیوەکەی دووەمی هی ١ / ١ بێت

لە بەشەکانی داهاتوودا بە ووردی ئەم باسانە دەخەینە ڕوو

وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ الأعراف

وە بۆ گەلی (ثمود) صالحی برایانمان بۆناردن ووتی ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن و بۆئێوە هیچ خوایەك نیە لەوزیاتر ، بەدڵنیاییەوە ڕوونکردنەوەیەکتان بۆهاتووە لەلایەن پەروەردگارتانەوە ، ئەوە حوشترەکەی خوایە بەڵگەو نیشانەیە بۆئێوە ، وازی لێبێنن بلەوەڕێت لەخاکی خوادا وەخراپەی لەگەڵدا مەکەن دەنا سزایەکی بەئازار دەتانگرێتەوە

وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ الأعراف

ئەی گەلی ثمود بیر بکەنەوە کەخوا ئێوەی کرد بەجێنیشین لەدوای گەلی عاد وە لە زەویدا جێنیشینی کردن لەدەشتەکانیدا کۆشکەکان دەکەن و خانووەکان لە چیاکان دادەتاشن جایادی نازونیعمەتەکانی خوابکەن وە وا لامل مەبن لەزەویدا کە خراپەکاربن

( ڕەچەڵەکی گەلی ثمود دەگەڕێتەوە بۆ سام کوڕی نوح و لەدوای گەلی عاد هاتن وەخانوەکانیان بەناوبانگن لەناو ( وادی القری ) و دەوروبەری لەنێوان حیجازو شامدا ) ( ابن كثير ٧٤ الاعراف )

لەبەر ئەوەی تەمەنیان زۆر درێژبوو ئەوخانوانەی کەدروستیان دەکردن پێش مردنی خۆیان دەتەپین بۆیەخانویان لەشاخەکان دادەتاشین .(القرطبی٧٤ الاعراف )

فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوْاْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧٧﴾ الأعراف

وە حوشترەکەیان سەربڕی و بێفەرمانی خوایانکرد وە ووتیان ئەی صالح ئەوەمان بۆبێنە کەپەیمانمان پێدەدەی ئەگەر ئەتۆ لەنێردراوەکانی خوای

فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُواْ فِى دَارِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٧٨﴾ الأعراف

بومەلەرزەیەکی بەهێز لەناوی بردن وەوایان لێهات لەماڵەکانیاندا بەچۆکدا کەوتن

وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ مريم

وە لە قورئاندا یادی ئیبراهیم بکەرەوە بەڕاستی ئەو ڕاستگۆو پێغەمبەر بوو.

(ئیبراهیم لە سەردەمی نەمرود لە دایك بوو ( ١٢٦٣ ) هەزارو دوو سەد و شەست و سێ ساڵ لە نێوان تۆفانەکەی نوح و لە دایك بوونی ئیبراهیم داهەیە وە ئەم لەدایك بوونەی ئیبراهیم دوای ( ٣٣٣٠ ) سێ هەزار و سێ سەدو سی ساڵ لەدوای دروستکردنی ئادەمەوە بوو ) ( تفسير القرطبي الانعام ٧٥ )

وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ الأنعام

وە هەروەها دەسەڵاتی گەورەی خوامان لەئاسمانەکان و لەزەویدا نیشانی ئیبراهیم دا ، وە بۆ ئەوەی لە یەقین دارەکان بێت

دەسەڵاتەکانی دروستکەرەکە لەهەموو بوارەکاندا نیشانی ئیبراهیم درا بۆیە

فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ ﴿٧٦﴾ الأنعام

**جاكاتێـك كەشـەوی بەسـەرداهات ئەسـتێرەیەكی دی ووتـی ئـەوەخوای منـە جاكاتێك كەئاوابوو ووتی من ئاوابووەكانم خۆشناوێ**

فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَـٰذَا رَبِّى فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ الأنعام

**وەكاتێـك مـانگی دی بەدەركـەوت ووتـی ئـەوە خـوای منـە جاكاتێـك كـەئاوابوو ووتی جائەگەر خوا ڕێنمایم نەكات ئەوە لەگەڵ و نەتەوەی گومڕابوو دەبم**

فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَـٰذَا رَبِّى هَـٰذَآ أَكْبَرُ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَـٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ الأنعام

**جاكاتێـك ڕۆژی دی بەدەركـەوت ووتـی ئـەوە خـوای منـە ئـەوە گـەورەترە ،جـا كاتێك كەئاوابوو ووتی ئەی گەلەكەم من بێبەریم لەوەی ئێوە هاوبەشی دادەنێن بۆخوا**

إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ سورة الأنعام

**ئەمن بە دڵپاكی ڕووی خۆم لەوكەسە كرد كەئاسمانەكان و زەوی بەدی هێناوە وەمن لەهاوبەش دانەرەكان نیم بۆخوا**

إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَـٰٓأَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِى عَنكَ شَيْـًٔا ﴿٤٢﴾ مريم

**كاتێك كە بەباوكی ووت ئەی باوكە بۆچی ئەوە دەپەرستی كە نەگوێ بیست دەبێت و نەدەبینێت و نەهیچ شتێك لەتۆ زیاددەكات**

يَـٰٓأَبَتِ إِنِّى قَدْ جَآءَنِى مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَٱتَّبِعْنِىٓ أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا ﴿٤٣﴾ مريم

**ئـەی باوكـە بەدڵنیاییـەوە لەزانسـت ئـەوەی كـەبۆمن هـاتووە بۆتۆنـەهاتووە جـا پەیڕەوی من بكە ڕێگەی ڕاست ودروستت نیشاندەدەم**

يَـٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَـٰنَ إِنَّ ٱلشَّيْطَـٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَـٰنِ عَصِيًّا ﴿٤٤﴾ مريم

**ئـەی باوكـە شـەیتان مەپەرسـتە بەڕاسـتی شـەیتان سەرپێچـی كـەربوو بـۆ فەرمانەكانی خوای بەخشندە**

يَـٰٓأَبَتِ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَـٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَـٰنِ وَلِيًّا ﴿٤٥﴾ مريم
**ئەی باوکە ئەمن دەترسێم لەوەی سزایەکی سەختت لەلایەن خوای بەخشندە بەرکەوێت جا لەئەنجامدا ببیە دۆستی شەیتان**

قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِى يَـٰٓإِبْرَٰهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ
لَأَرْجُمَنَّكَ وَٱهْجُرْنِى مَلِيًّا ﴿٤٦﴾ مريم
**باوکی ووتی ئەی ئیبراهیم تۆ بێزاری لەخواکانی من ، جا ئەگەر واز نەهێنی ئەوا بەرد بارانت دەکەم و بۆماوەیەکی دوورودرێژ لێم دوورکەوەوە**

قَالَ سَلَـٰمٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّىٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِى حَفِيًّا ﴿٤٧﴾ مريم
**ئیبراهیم ووتی سڵاوی خوا لەسەرتۆ لەمەودوا داوای لێبوردنت بۆدەکەم لە پەروەردگاری خۆم بەڕاستی ئەو ڕێزدارە بەمن**

وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُوا۟ رَبِّى عَسَىٰٓ
أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّى شَقِيًّا ﴿٤٨﴾ مريم
**وە جیا دەبمەوە لەئێوەو لەوانەی کەبێجگە لەخوا دەیان پەرستن، وە لە پەروەردگارم دەپاڕێمەوە وەخۆزگە دەخوازم کەبەپاڕانەوەکەم لەخوا مایە پوچ نەبم وەکو ئێوە**

فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ
إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٤﴾ العنكبوت
**جا وەڵامی گەلەکەی بێجگە لەمە زیاتر نەبووکە ووتیان بیکوژن یان بیسوتێنن ، جا خوا ڕزگاری کرد لەئاگر، بەڕاستی لەمکارەدا بەڵگەو نیشانەی خوا هەن بۆ گەلێك کەباوەڕدێنن**

**جا کە ئیبراهیم زانی ئەم ڕێگای ووتووێژە نایگەیەنێت بەئەنجام بۆیە بڕیاریدا کە شێوازێکی تریان لەگەڵدا بەکاربهێنێت.**

وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَـٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾ سورة الأنبياء

وه سوێند بەخوا چارەی بتەکانتان دەکەم دوای ئەوەی کەدەڕۆن و بەجێیان دەهێڵن.

فَجَعَلَهُمْ جُذَٰذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

جاهەموو بتەکانی پارچە پارچە کردن تەنها بتە گەورەکەی ئەوان نەبێت بەو هیوایەی بگەڕێنەوە بۆلای

واتە تەنها بتە گەورەکەی هێشتەوەو بیورەکەشی خستە سەرشانی بتە گەورەکە بەوهیوایەی کاتێك کەخەڵکەکە دەگەڕێنەوەو ئەودیمەنە دەبینن بیرێك لەحاڵی خۆیان دەکەنەوە

جا کاتێك کەخەڵکەکە گەڕانەوە

قَالُوا مَن فَعَلَ هَٰذَا بِآلِهَتِنَا إِنَّهُ لَمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿٥٩﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

ووتیان کێ وای بەخواکانی ئێمە کردووە ؟ بەڕاستی ئەوەی ئەوکارەی کردووە لەستەمکارانە.

قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ ﴿٦٠﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

ووتیان گوێمان لێبوو گەنجێك کەناودەبرێت بەئیبراهیم باسی دەکردن

قَالُوا فَأْتُوا بِهِ عَلَىٰ أَعْيُنِ النَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

ووتیان جابیهێنن بۆ بەرچاوی خەڵکی بەڵکو دەیناسنەوەو شایەدی لەسەر دەدەن

جا کاتێك کە هێنایان

قَالُوا أَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِآلِهَتِنَا يَا إِبْرَاهِيمُ ﴿٦٢﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

ووتیان ئەی ئیبراهیم تۆ ئەوەت بەخواکانی ئێمە کردووە ؟

قَالَ بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَاسْأَلُوهُمْ إِن كَانُوا يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

ئیبراهیم ووتی بەڵکو گەورەکەیان وای پێکردوون جا لێیان بپرسن ئەگەر ئەوان قسەدەکەن

ئیبراهیم درۆی نەکرد کەووتی بتەگەورەکە بتە بجوکەکانی شکاندووە چونکە لە ڕاستیدا گەورە و بچوك هەر بت بوون هیچ جیاوازیەك لەنێوانیاندا نەبوو ئەدی بۆ ڕێزی گەورەیی بۆگەورەکەیان و بچوکی و کەمیش بۆ بچوکەکانیان داندرابوو، بێدەسەلاتی و هیچ لەدەست نەهاتویی گەورەکەیان بووە کە بچوکەکانی بەم چارەنوسە گەیاندووە ، لە هەمانکاتدا زیرەکی و زانایەتی ئیبراهیم دەردەخات کەچۆن توانی بەم شێوازە وا لەبەرامبەرەکەی بکات دان بەم ڕاستیەدا بنێن

فَرَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوٓاْ إِنَّكُمْ أَنتُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٦٤﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

جا بەخۆیاندا چوونەوە ، خۆ بەخۆ ووتیان بەڕاستی بەپەرستنی ئەم بتانە ئێوە ستەمکارن

ثُمَّ نُكِسُواْ عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰٓؤُلَآءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

جا سەری خۆیان شۆڕکردوو بەدڵنیاییەوە زانرا کەئەوبتانە قسەناکەن

قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْـًٔا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

ئیبراهیم ووتی ئایا ئێوە بێجگە لەخوا شتێك دەپەرستن کەهیچ کەڵکێکتان پێ ناگەیەنێ و زیانتان پێنادات

أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

ئۆف بۆئێوەوئەوانەی دەیانپەرستن جگە لەخوا،ئایائێوە ژیریتان بەکار ناهێنن

قَالُواْ حَرِّقُوهُ وَٱنصُرُوٓاْ ءَالِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَٰعِلِينَ ﴿٦٨﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

خەڵکەکە ووتیان ئەگەر پێتاندەکرێت پشتیوانی لەخواکانتان بکەن و ئیبراهیم بسوتێنن

جا بۆسزادانی ئیبراهیم ئاگرێکی گەورەیان کردەوەو ئیبراهیمیان هەڵدایە ناو ئاگرەکەوەو خوای گەورە بەهانای ئیبراهیمەوە هات و ڕزگاری کرد

قُلْنَا يَٰنَارُ كُونِى بَرْدًا وَسَلَٰمًا عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

خوا دەفەرمووێت   ووتمان ئەی ئاگر سارد و سەلامەت بە لەسەر ئیبراهیم

وَأَرَادُواْ بِهِۦ كَيۡدٗا فَجَعَلۡنَٰهُمُ ٱلۡأَخۡسَرِينَ ٧٠ سُوۡرَةُ الأَنۡبِيَاءِ

**وه وویستیان خراپه به ئیبراهیم بکه‌ن بۆیه ئێمه ئه‌وانمان کرد به زیان لێکه‌وترین خه‌ڵك**

فَلَمَّا ٱعۡتَزَلَهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۖ وَكُلّٗا جَعَلۡنَا نَبِيّٗا ٤٩ مَرۡيَمَ

**جا کاتێك جیابۆوه لێیان و له‌وانه‌ی جگه له‌خوا ده‌یان په‌رست ، ئیسحاق و یه‌عقوبمان پێبه‌خشی وه هه‌ریه‌كێك له‌وان کردمان به‌پێغه‌مبه‌رێك**

وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٨٤ الأَنۡعَام

**وه له نه‌وه‌کانی ئیبراهیم داود و سلیمان و ئه‌یوب و یوسف وموسا و هارون ، ( کردمانن به پێغه‌مبه‌ر ) وه ئاوا ئێمه چاکه‌ی چاکه کاران ده‌ده‌ینه‌وه**

وَزَكَرِيَّا وَيَحۡيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلۡيَاسَۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ٨٥ الأَنۡعَام

**وه زه‌که‌ریا ویحیا وعیسا وئیلیاس هه‌موویان له‌چاکه‌کارانن**

وَإِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطٗاۚ وَكُلّٗا فَضَّلۡنَا عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ٨٦ الأَنۡعَام

**وه ئیسماعیل و یه‌سه‌ع و یونس و لوط هه‌ر یه‌كێك له‌ئه‌وانمان به‌رزتر نرخاند به‌سه‌ر جیهانیاندا**

وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ٥٤ مَرۡيَمَ

**وه له‌قورئانه‌که‌دا یادی ئیسماعیل بکه‌وه به‌ڕاستی ئه‌و واده ڕاست بوو وه نێردراوی خوابوو وه پێغه‌مبه‌ربوو**

**به‌م شێوه‌یه په‌روه‌ردگار پێغه‌مبه‌ران و نێردراوانی خۆی له نوحه‌وه بۆبنه‌ماڵه‌ی ئیبراهیم ولوط و یونس وه له ئیبراهیمه‌وه بۆ به‌ره‌ی دوو دایك که سارا و هاجه‌ره‌ن، به‌ره‌ی دایکه سارا به ئیسحاق ده‌ست پێده‌کات وبه عیسای کوڕی مریه‌م کۆتایی دێت ، وه به‌ره‌ی دایکه هاجه‌ره به ئیسماعیل ده‌ست پێده‌کات و**

به محمد کۆتـایی دێـت کەکۆتایی هێنـەری پێغەمبەرانە، (سلاْوی خـوا لەسەر هەموویان).

حَدِيث أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ :

قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ صلى الله عليه وسلم اخْـتَتَنَ إِبْـرَاهِيمُ النَّبِـيُّ عليه السلام

وَهُـوَ ابْـنُ ثَمَـانِينَ سَـنَةً بِالْقَدُومِ ۞ البيان حديث رقم ١٣٨٣

پێغەمبـەر (سلاْوی خـوای لێبێت)فـەرمووی :( ئیـبراهیم پێغەمبـەر سـەلامی خـوای لێبێت خەتەنە کرا بە ( القدوم ) وە ئەو کوڕێکی تەمەن هەشتا ساڵان بوو. القدوم نوك تیژێکی پەیکەر داتاشینە .

ئینجا دوای ئەوەی کەهاجەرەی خێزانی دووەمی ئیبراهیم ئیسماعیلی بـوو خـوا فەرمانی پێکرد کەهاجەرەو ئیسماعیلی کوڕی بەرێت بۆ ئەو شوێنەی کە ئێستا شاری مەککەیە.

رَبِّ هَبْ لِي مِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٠٠﴾ سُورَةُ الصَّافَّاتِ

ئیبراهیم ووتی   خوایە ڕۆڵەیەکم لەچاکەکاران پێ ببەخشە

فَبَشَّرْنَـٰهُ بِغُلَـٰمٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ سُورَةُ الصَّافَّاتِ

جا مزگێنیمان دایە بەکوڕێکی هێدیو لەسەرخۆ ( کە ئیسماعیل بوو )

وە کاتێك کـە ئیـسـماعیل لـەدایك بـوو ئیـبراهیم تەمـەنی ( ٨٦ ) هەشـتاو شـەش ساڵ بوو. ( ابن كثير ١٠١ الصافات ) ( كتاب المقدس تكوين ١٦ ص٢٤ ).

هاجەر کوڕێکی بوو ناونرا ئیسماعیل   پەروەردگار داوای لـە ئیبراهیم کـرد کـە ئیسماعیل و دایکی بەرێت بۆ ئەو دۆڵەی کە ئێستا شاری مەککەی لێیە

وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَـٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ

وە کاتێك کە ئیبراهیم ووتی ئەی پەروەردگاری من ئەم وولاتـە بکـە بەوولاتێکی ئـارام وئاسـایش وە بـژێوی بـدە بەخەڵکەکـەی لەبـەروبومی میوەکـان بۆئەوانـەی کـەباوەڕیان بـەخواو ڕۆژی دوایـی هێنـاوە ، وە خـوا فـەرمووی وە ئـەوەش کـە

بێباوەڕە ئەوا خۆشیەكی كەمی پێدەدەم ، ئینجا ناچاری دەكەم بۆسزای ئاگرو خراپترین چارەنووس

لێرەدا شێوازێكی داواكاری لەلایەن ئیبراهیم و وەڵام دانەوەو جێبەجێكردن لە لایەن پەروەردگارەوە دەردەكەوێت، بەوەی كەئیبراهیم داوای ئارام و ئاسایش دەكات بۆ وولاتەكە وداوای بژێوی وجۆری میوەكان دەكات بۆ خەڵكەكەی ، پەروەردگاریش وەڵامی دەداتەوە و دەفەرموویێت نەك هەر ئارامی و ئاسایش بۆ وولاتەكەو بژێوی بۆخاوەن باوەڕەكان بەڵكو بۆ بێباوەڕەكانیش خۆشیەكی كەمیان پێدەبەخشم هەتا لەڕۆژی دواییدا توشی ئاگری دۆزەخ و خراپترین چارەنووسیان دەكەم

رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ
رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم
مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ﴿٣٧﴾ سُورَةُ إِبۡرَاهِيمَ

ئیبراهیم ووتی پەروەردگاری ئێمە من لەڕۆڵەكانی خۆم جێ نیشینم كرد لە دۆڵێكی بێشینایی وكشتوكاڵدا لەنزیك ماڵە پیرۆزەكەی تۆوە ، ئەی پەروەردگاری ئێمە بۆئەوەی نوێژەكانیان جێبەجێ بكەن جاوابكە پۆلێك لە خەڵكی ئارەزووی ئەوان بكەن و بێن بۆلای ئەوان و بژێویان پێبدە لەبەروبوومی میوەكان ، بەڵكو سوپاسمەند دەبن

رَبَّنَا وَٱجۡعَلۡنَا مُسۡلِمَيۡنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةٗ مُّسۡلِمَةٗ لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا
وَتُبۡ عَلَيۡنَآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ

ئیبراهیم ووتی پەروەردگاری ئێمە بمانكە بەموسڵمان بۆخۆت، وە لە ڕۆڵەكانی ئێمە نەتەوەیەكی موسڵمان دروستبكە بۆخۆت ، وە ڕێ ورەسمەكانی خۆمان نیشانبدە وە لێمان خۆشببە بەڕاستی تۆ لێخۆشبووخاوەن بەزەیی

رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ
وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ

ئیبراهیم ووتی پەروەردگاری ئێمە وە لەناویاندا پێغەمبەرێك لەخۆیان بنێرە بەڵگەو نیشانەكانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە وە فێری زانستی كتێبە ئاسمانیەكان وكاردروستیان بكات وپاكیان بكاتەوە بەڕاستی تۆ ئەوكەسەی كەكەس دەسەلاّتی بەسەردا ناشكێ وكاردروستی

إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٥٨﴾ البَقَرَة

بەڕاستی صەفا و مەڕوە لە درووشمەكانی خوان جاكەسێك كە حەجی كرد یان عومرەی هێنایەوە تاوانی لەسەر نیە كە بەدەوریاندا بسوڕێتەوە ، وە كەسێكیش وەكو چاكەیەك خۆی ببەخشێت بۆسوڕانەوە بەدەوریاندا ئەوا بە ڕاستی خوا سوپاسمەندو پێزانە

صەفا ومەڕوە دوو گردی بەرامبەری یەكن لەنزیك كەعبە

زۆر كەس لەلێكدانەوەی ئەم ئایەتە دەكەونە هەڵەوە ، هەركەسێك زانیاریەكانی لەسەر خوا وقورئان وپێغەمبەرەكانی هەرئەوەندەبێت كە لەدیویێكەوە تەماشایان بكات بەدڵنیاییەوە ناگات بەئەنجام لەپێش هەمووشتێكدا قورئان كتێبێكی فەلسەفییە دەبێت لەهەموو ڕووەكانەوە تەماشابكرێت دەنا ناگەیت بەمەرام

كاتێك ئیبراهیم هاجەرەو ئیسماعیلی لەودۆڵەدا جێهێشت وەكو خوا باس دەكات دۆڵێكی ووشك بوو هیچ كشتوكاڵێكی تێدانەبوو وواتە بێ ئاو بوو كاتێك تینویەتی تەنگی بەهاجەرەی دایك و ئیسماعیلی كۆرپە هەڵچنی هاجەر كۆرپەكەی لەناو دۆڵە بێئاوە ووشكەكەدا دانا بەهیوای ئەوەی خۆی بروات بۆ گەڕان بەدوای ئاودا، نەرمە غارێكی كرد بۆسەر گردی سەفا و لەوێوە تەماشای دەوروبەری كردوچاوی بۆئاو دەگێڕا بەلاّم هیچ ئاوی نەدیت ، لەترسی ئەوەی نەوەك دڕندەیەك پەلاماری كۆرپەكەی بدات بەنەرمەغار گەڕایەوە بۆلای كۆرپەكەی ، كە دڵنیابوو لێی، نەرمە غارێكی كرد بۆسەرگردەكەی بەرامبەری

کەناوی مەڕوەیە لەوێشەوە چاوی گێڕا هیچ ئاوی نەدیت، بۆیە بەنەرمەغار گەڕایەوە بۆلای کۆرپەکەی ، ئەم نەرمە غارانەی هاجەرە حەوت جار بەردەوام بوو لەنێوان سەفاومەڕوەدا تا لەکۆتایی جاری حەوتەم کە بەبێ هیوایی گەڕایەوە بۆلای کۆرپەکەی بینی لەژێر قاچی کۆرپەکەیەوە ئاوێك پەیدا بوو، لە تامەزرۆیی بۆ ئاو دەوری ئاوەکەی گرت بۆئەوەی نەڕوات

عن ابن عباس رضي الله عنهما عن النبي صلى الله عليه وسلم قال :

«يرحمُ الله أم إسماعيلَ، لولا أنها عجِلَت لكانَ زَمزمُ عيناً معيناً».

فتح الباري بشرح صحيح البخاري ٣٢٥٤

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت)فەرمووی :( سۆز و بەزەیی خوا لەسەر دایکی ئیسماعیل ئەگەر هاتبایەو پەلەی نەکردبایە ئەوا زەمزەم کانیەکی لەبەر ڕۆیشتوو دەبوو )

ئینجا ئەم هاتووچوونەی هاجەرە کەخۆبەخت کاری دایکە بۆرۆڵەکەی بەپیرۆز وەرگیراوخەڵکی بەپێی سەردەمەکانیان بیرۆزیان پێدەدا ، (ئەوەبوو لەسەردەمی نەزانی پێش ئیسلامدا دوو بتیان دانابوون یەکێکیان بەناوی (اسافا) لەسەر سەفاو ئەوی تریان بەناوی ( نائلە) لەسەر مەڕوە جاکاتێك کەئاینی ئیسلام هات ئەوخەڵکەی کەپێش ئیسلام لەنێوان سەفاو مەڕوەدا هاتوچۆیان کردبوو لەگەڵ بوونی ئەم دووبتەدا ، لەسەردەمی ئیسلام دوای لابردنی بتەکانیش ئامادە نەبوون ئەو هاتوچۆیە بکەن چونکە بەشێوازێکی نەزانین وهاوبەشی دانانیان بۆخوا دەزانی، جا خوا بۆی ڕوونکردنەوە کە لەسەردەمی ئیسلامدا هاتووچوون لەنێوان سەفاومەروەدا هیچ تاوانێکی تێدا نیە وەخوا سوپاسمەندە بۆ ئەوکەسەی کە خۆی دەبەخشێت بۆجێبەجێ کردنی ئەم ڕێوڕەسمە بیرۆزە).

( تفسير القرطبى ١٥٨ البقرة )

فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَـٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ قَالَ يَـٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ سُورَةُ الصَّافَّاتِ

جا کاتێك کەئیسماعیل وای لێهات لەگەڵ باوکیدا هەوڵ و تێکۆشانی دەکرد ئیبراهیم ووتی ئەی کوڕەکەم من لەخەودا بینم کەمن تۆ سەردەبڕم جا تۆش تەماشاکە بزانە لەم کارە چی دەبینی، ئیسماعیل ووتی ئەی باوکە ئەوەی فەرمانت پێکراوە جێبەجێی بکە، بە پشتیوانی خوا دەمبینی من لەوانەم کە دان بەخۆیاندا دەگرن

فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ سُوۡرَةُ الصَّافَّاتِ

جا کاتێك کەخۆیان دا بەدەست داواکەی پەروەردگارە و بەڕوودا خستی.

وَنَٰدَيْنَٰهُ أَن يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾

قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ الصَّافَّاتِ

وە بانگمان کرد کە ئەی ئیبراهیم (١٠٤) بەدڵنیاییەوە خەونەکەت بەڕاستی هێنایەدی ئێمەش ئاوەها چاکەی چاکەکاران دەدەینەوە(١٠٥).

إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ الصَّافَّاتِ

ئەم کردەوەیە بەڕاستی ئەوەیە تاقیکردنەوەی ئاشکرا(١٠٦) وە بەرانێکی گەورەو باشمان بەخشی لەجیاتی سەربڕینی ئەو(١٠٧).

وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْءَاخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سُوۡرَةُ الصَّافَّاتِ

وە بۆ ئیبراهیممان هێشتەوە بەسەر گەل ونەتەوەکانی دوای خۆیەوە.

بەوەی کە پیرۆزی بۆبنێردرێت و خەڵکی صەوڵەواتی لەسەر لێبدەن وهەر کەسێك لەهەمان کات وڕۆژدا مەڕێك بۆپەروەردگاری سەر ببڕێت وەکو ئەوە وایە کوڕێکی خۆی بۆپەروەردگاری سەر بڕیبێت کەئەوڕۆژە لەهەموو ساڵێك ڕێکەوتی یەکەم ڕۆژ تاهەر چوار ڕۆژەکەی جەژنی قوربان دەکات ، جا کە حاجیەکان لەسەردانی ماڵی خوادا ، یان موسوڵمانان لەووڵاتەکانی خۆیاندا مەڕێك سەردەبڕن لەپێناوی خوادا یادی ئیبراهیمی باوك و ئیسماعیلی کوڕ دەکەنەوەو قوربانی دەکەن و خۆیشیان لەگۆشتەکەی ناخۆن چونکە کەس

توانای نیه گۆشتی کوڕەکەی خۆی بخوات ، بۆ ئەوەی زۆرینەی گۆشتەکە بۆ هەژار و کەم دەرامەتەکان بێت

سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١١٠﴾
إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١١﴾ وَبَشَّرۡنَٰهُ بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾
سُورَةُ الصَّافَّاتِ

سڵاوی خوا لەسەر ئیبراهیم (١٠٩) ئاوەها چاکەی چاکەکاران دەدەینەوە(١١٠) بە ڕاستی ئەو لەبەندە خاوەن باوەڕەکانی خوایە(١١١) وە مزگێنیمان پێدا بە ئیسحاق ، پێغەمبەرێك لەچاکەکاران (١١٢).

وە لە کاتێکدا کە ئیسحاق لەدایك بوو ئیبراهیم تەمەنی ( ٩٩ ) نەوەدو نۆ ساڵ بوو ( ابن كثير ١٠١ الصافات )

عن أَنَسٍ قال: «قالَ رَجُلٌ لِرَسُولِ الله صلى الله عليه وسلم: يَا خيرَ البَرِيَّةِ، فقَالَ رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم: ذَاكَ إِبراهِيمُ عَلَيْه السَّلاَمُ». عون المعبود بشرح سنن أبي داوود ٣ ٦ ٦ ٤

پیاوێك بە پێغەمبەر خوای (سڵاوی خوای لێبێت)ووت ئەی باشترین دروستکراوی خوا ، جا پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت)فەرمووی ( ئەو کەسە ئیبراهیمە سەلامی خوای لێبێت )

إِنَّ أَوَّلَ بَيۡتٖ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكٗا وَهُدٗى لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ آل عمران

بەڕاستی یەکەمماڵی خوا کە بۆخەڵکی داندرا ئەوەیان بوو کە لە ( بەکە ) یە پیرۆزو ڕێ ڕووناك کەرەوەیە بۆجیهانیان

( مەکە ئەو شارەی کەپێغەمبەر تێدا لەدایك بووە و بطلیموس ناوی دەبات بە ( ماکورابا ) لەدۆڵێکی بەرداوی بێ شینایدا درێژ دەبێتەوە لەباکورەوە بۆ باشور لەنێوان چیای ئەبی قوبەیس لەڕۆژهەڵاتەوەو چیای ئەلهندی لەڕۆژ ئاواوە وەلەناوەڕاستی مەککەدا کەعبە دامەزراوە ، وە (بەکە) دۆڵەکەیەو

مەکەش شێوەیەکی تری زمانەوانیە کەشاری مەککە دەگەیەنێت لەبەرئەوەی وەکو لەقورئاندا باسی دەکات لەدۆڵێکی ووشکی بێ شینایی و کشتوکاڵدایە ، ئینجا ( ماکۆرابا ) یان بەشێوەیەکی ڕاست تر ماکارابا بەپێی شێوە زمانی ئارامی ڕۆژهەلاتی نەك سریانی ڕۆژ ئاوایی ڕاستتر وایە کەدۆڵی گەورەو پیرۆز یان دۆڵی پەروەردگار دەگەیەنێت ) ( تاريخ الشعوب الاسلاميه ص٣١ )

وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَـٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَـٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ البَقَرَة

وە کە ماڵە پیرۆزەکەی خۆمان بۆخەڵکی کرد بەشوێنی گەڕانەوەو ئارامی و ئاسایش، وە لەشوێنی ڕاوەستانی ئیبراهیم شوێنی نوێژ کردنیان دانا، وە پەیمانماندا بەئیبراهیم وئیسماعیل کەماڵەکەی من پاك بکەنەوە بۆئەوانەی بە دەوریدا دەسوڕێنەوەو ئەوانەی کەتیایدا دەمێننەوەو ئەوانەی کەنوێژی تێدادەکەن

وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَٰهِـۧمُ ٱلْقَوَاعِدَ مِنَ ٱلْبَيْتِ وَإِسْمَـٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّآ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ سُورَةُ البَقَرَة

وە کە ئیبراهیم و ئیسماعیل بناغەکانیان بەرز دەکردەوە لەماڵی خوا دەیان فەرموو پەروەردگاری ئێمە کارەکەمان لێوەربگرە بەڕاستی تۆ گوێ بیست و زانای بەهەمووشتێك

عَنْ أَبِي ذَرٍّ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّهِ أَيُّ مَسْجِدٍ وُضِعَ فِي الأَرْضِ أَوَّلُ ؟ قَالَ: «الْمَسْجِدُ الْحَرَامُ» قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ «الْمَسْجِدُ الأَقْصَىٰ» قُلْتُ: كَمْ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: « أَرْبَعُونَ سَنَةً، وَأَيْنَمَا أَدْرَكَتْكَ الصَّلاَةُ فَصَلِّ فَهُوَ مَسْجِدٌ».

صحيح مسلم بشرح النووي ٣ ١ ١ ١

{ئەبی زەر ووتی  ووتم : ئەی پێغەمبەری خوا کام مزگەوتە یەکەم مزگەوت بوو لە زەویدا داندرا ؟ فەرمووی ( مزگەوتی الحرام ) ووتم : دوای ئەو کامەیان فەرمووی (مزکەوتی الاقصی) ووتم نێوانیان چەندە ؟ فەرمووی (چل ساڵ ، وە لەهەر شوێنێك هەستت بەكاتی نوێژ کرد جا نوێژەکەت بکە ئەوا ئەویٚ مزگەوتە ) } .

بەم شێوەیە یەکەم ماڵی خوا لەشاری مەککە دروستکراو ئەو بەردە ڕەشەش کە لە بەهەشتەوە هەڵدرابوە خوارەوە لە سوچێکی ئەم مزگەوتەدا جێگیر کرا بۆ مەبەستێك لەسەردەمی پێغەمبەرایەتی محمد (سڵاوی خوای لێبێت)باسی دەکەین.

تیرەو هۆزەکان بەهۆی ئاوی زمزمەوە لەمەکە کۆبوونەوەو ئیسماعیل لە ناویاندا فێری زمانی عەرەبی بوو، وە ئافرەتێکی لەناویاندا کرد بەهاوسەری خۆی ، کاتێك کەئیبراهیم هات بۆسەردانی ئیسماعیل تەنها خێزانەکەی لەماڵەوەبوو پێی ووت باری ژیانتان چۆنە ئافرەتەکە لەوەڵامدا ووتی باری ژیانمان تەنگ و سەختە ، جا ئیبراهیم ووتی ئەگەر ئیسماعیل هاتەوە سڵاوی منی پێبگەیەنەو پێیبلێ باڕاگری دەرگاکەی بگۆڕێت  کاتێك کە ئیسماعیل گەڕایەوە پرسیاری کرد ئیمڕۆ کەس نەهاتووە ؟ ئافرەتەکەش وەڵامی دایەوە کەپیاوێکی بەتەمەن هات و سەلامی لێدەکردیت و ووتی با ڕاگری دەرگاکەی بگۆڕێت  ئیسماعیل ووتی ئەوە باوکم بووە فەرمانی پێکردوم کە من وتۆ لەیەکتری جیاببینەوەو ناردیەوە بۆلای کەس و کارەکەی و ژنێکی تری لێیان هێنا  دوای ماوەیەك کە ئیبراهیم هاتەوە بۆسەردانیان ئەمجارەشیان ئیسماعیل لەماڵەوەنەبوو، لە ژنەکەی پرسی باری ژیانتان چۆنە ؟ ژنەکە وەڵامی دایەوە لەخێرو خۆشیداین، جا ئیبراهیم ووتی ئەگەر ئیسماعیل هاتەوە سڵاوی منی پێبگەیەنەو پێی بڵێ با ڕاگری دەرگاکەی جێگیر بکات . کاتێك کەئیسماعیل گەڕایەوە پرسیاری کرد ئیمڕۆ کەس نەهاتووە ؟ ئافرەتەکەش وەڵامی دایەوە کەپیاوێکی بەتەمەن هات وسەلامی لێدەکردیت و ووتی با ڕاگری دەرگاکەی جێگیر بکات  ئیسماعیل

ووتی ئەوە باوکم بووە وە ڕاگری دەرگاکەش تۆیت ، باوکم ڕازیە بەوەی کە تۆ هاوسەری من بیت و لەگەڵم بمێنیتەوە

(ئەم لێك دانەوەیە لە حديث البخاری ٣٢٣٦ وەرگیراوە )

مەبەستی ئیبراهیم بۆ دیاریکردنی هاوسەرێکی گونجاو بۆکوڕەکەی ئەوەبوو کە بەهۆی کایگەریەکانی بۆماوەزانیەوە کاردەکاتە سەرنەوەکانی و لەداهاتوشدا لەنەوەکانی ئەوەوە پێغەمبەرێکی تر پەیدا دەبێت کەئەرکێکی قورس دەکەوێتە سەرشانی جابۆیە هەرلەسەرەتاوە ئافرتی یەکەم کەخۆڕاگرنەبوو بەرامبەر سەختیەکانی ژیان گونجاونەبوو ببێت بەبناغەیەك بۆ لەدایك بوونی ئەوپێغەمبەرەی کە لەداهاتوودا لەدایك دەبێت هەر بۆیەش ئافرەتی دووەم شیاووگونجاوتربوو

ئیبراهیم کە گەلەکەی جێهێشت تەنها لوط وسارای خێزانی لەگەڵیدا ڕۆیشتن

فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌۘ وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ العنكبوت

جا( لوط ) باوەڕی بەئیبراهیم هێناو ووتی من لەپێناوی خوای خۆم کۆچم کردوە ، بەڕاستی خوایە ئەوکەسەی کەس دەسەڵاتی بەسەردا ناشکێ و کاردرووستە

پەروەردگاریش شەرەفی پێغەمبەرایەتی پێدا

لە کاتێکدا کەخاوەن خێزان بوو وە بووبەڕابەری گەل و نەتەوەیەك بەڵام ئەم گەل و نەتەوەیە خوڕەوشتێکی ناشیرینیان هەبوو کەنێربازی بوو

وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَـٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ سُورَةُ العَنكبوت

وە لوط کە بەگەل ونەتەوەکەی گووت ئێوە کاری بەدڕەووشتی دەکەن کە کەسێك لەجیهانیاندا پێش ئێوە ئەمکارەی نەکردووە

أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ سُورَةُ العَنكبوت

لوط ووتی ئایا ئێوە دەچنە لای پیاوان بۆ نێربازی وڕێگە بەخەڵك دەگرن و لەکۆڕوکۆمەڵەکانتان خراپەکاری دەکەن وەڵامی گەلەکەی هەر ئەوەندەبوو کە ووتیان سزاو ئازاری خوامان بۆبێنە ئەگەر ئەتۆ لەڕاستگۆیەکانی

قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٣٠﴾ سُورَةُ العَنکَبوت

لوط ووتی خوایە سەرمبخە بەسەر گەلی خراپەکاردا

وَلَمَّا جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُوٓاْ إِنَّا مُهۡلِكُوٓاْ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِۖ

إِنَّ أَهۡلَهَا كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ سُورَةُ العَنکَبوت

وە کاتێك نێردراوەکانی ئێمە بەمزگێنیەوە هاتن بۆلای ئیبراهیم ووتیان ئێمە فەوتێنەری خەڵکی ئەوگوندەین بەڕاستی خەڵکەکەی ستەمکاربوون

واتە کاتێك نێردراوەکانی ئێمە بەمزگێنیەوە هاتن بۆلای ئیبراهیم و مزگێنیان دایە کەخوای گەورە لەسارای خێزانت کوڕێکی ترت پێدەبەخشێت کەئەویش اسحاق بوو

قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطٗاۚ قَالُواْ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَن فِيهَاۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥٓ

إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾ سُورَةُ العَنکَبوت

ئیبراهیم ووتی لوط لەوێ ( لەو گوندە )دایە ، ووتیان ئێمە زاناترین بەوەی لەوێدایە ، خۆی وکەس وکارەکەی رزگار دەکەین تەنها ژنەکەی نەبێت کە لەوکەسانەبوو کەدەمێننەوەو رزگاریان نابێت

وَلَمَّآ أَن جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗاۖ وَقَالُواْ لَا تَخَفۡ وَلَا تَحۡزَنۡ

إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهۡلَكَ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴿٣٣﴾ سُورَةُ العَنکَبوت

وە کاتێك کە نێردراوەکانی خوا هاتن بۆلای لوط (گەلەکەی ) گومانی خراپیان لەمیوانەکانی لوط کرد وە تەنگیان بە لوط هەڵچنی بۆیە زراوی لێیان چوو ( نەوەك دەست درێژی بکەنە سەر میوانەکان )، وە ئەوانیش ووتیان مەترسێ وە خەفەت مەخۆ ئێمە ڕزگارکەری تۆ وکەس وکارەکەتین تەنها ژنەکەت نەبێت کە لەوکەسانەبوو کەدەمێننەوەو رزگاریان نابێت

إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿٣٤﴾
وَلَقَد تَّرَكۡنَا مِنۡهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٣٥﴾ سُورَةُ العَنكبوت

**ئێمە لەئاسمانەوە سزایەکی سەخت دادەگرینە خوارەوە بۆسەر خەلکی ئەم دێیە بەهۆی ئەوەی کە لەڕێگەی ڕاست لایان دەدا(٣٤) وە بەدڵنیاییەوە لەو گوندە بەڵگەو نیشانەیەکی ئاشکرا وبینراومان بەجێهێشت بۆ گەل ونەتەوەیەك کە ژیروعاقڵبن (٣٥).**

وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ الأنبيَاء

**وە ئەیوب کە بانگی لە خواکرد من توشی داهێزان و بارێکی خراپ بووم وە تۆ بەبەزەیی ترینی بەزەیی دارەکانی**

فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرّٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ
رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾ الأنبيَاء

**جا وەلاممان بەو دایەوە وەلەسەرمان لابرد ئەوەی کەتوشی ببوو لەداهێزان، وەکەس وکارەکەشمان بۆهێنایەوە وبەقەدەر ئەوانیش هی تریان لەگەڵدا بوو وەك بەزەییەك لەئێمەوەو بیرەوەریەك بۆخواپەرستان**

**واتـە وەلامماندایـەوەو نەخۆشـی وداهێزانەکـەمان لەسـەرلابردو کـەس و کارەکەیشمان بەوەچەی نوێوە بەدووئەوندەیی بۆهێنایەوە**

وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ
وَكُنَّا لِحُكۡمِهِمۡ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ الأنبيَاء

**وە داود وە سلێمان کەبڕیاریان دەدا لەسەر شینایەکە کەبەشەو مەڕی گەل وهۆزێك بەڕەلاببونە ناوی وەئێمە بەبڕیارەکانیان ئامادەو ئاگاداربووین**

**کاتێك مەڕومالاتی خەڵکێك بەشەو بەڕەلا بوونە ناو کشتوکالّی یەکێکی ترەوە خاوەن کشتوکاڵەکە بۆوەرگرتنی مافەکەی داوای لەداودکرد کەبڕیار بدات لە نێوانیاندا وە داودیش بڕیاریدا هەموو مەڕەکان بدرێن بەخاوەنی کشتوکاڵەکە لە بری ئەوزەرەرەی کەبەکشتوکاڵەکە کەوتووە ، لێرەدا پەروەردگار(سلێمان)ی**

تێگەیاند کەبڕیارەکە ئاوەها نابێت ، داودیش فەرمووی ئەدی چۆن دەبێت ؟ سلێمان فەرمووی مەڕەکان بدە بەخاوەنی کشتوکاڵەکە بابەروبوومەکەیان بخوات لەبری ئەوزەرەرەی کەبەکشتوکاڵەکەی کەوتووە وە کشتوکاڵەکەش بدە بەخاوەنی مەڕەکان تا بەروبومی کشتوکاڵەکە هەڵدەگیرێت ئەوسا مەڕەکان بدرێنەوە بەخاوەنەکەی وکشتوکاڵەکەش بدرێتەوە بەخاوەنەکەی بەم بڕیارە زەرەری خاوەن کشتوکاڵەکە پڕدەبێتەوەو خاوەن مەڕەکەش هەرئەوەندە زەرەر دەکات کە باجی بەرەڵابوونی مەڕەکانی بدات

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا يَٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ سَبَإٍ

وە ئێمە لەلای خۆمانەوە دەسەڵاتێکی زیادەماندا بەداود( ئەویش ئەوەیکە) ئەی چیاکان و باڵندەکان لەگەڵیدا هاودەنگبن وەئاسنمان بۆ نەرم کرد

وَعَلَّمْنَٰهُ صَنْعَةَ لَبُوسٍ لَّكُمْ لِتُحْصِنَكُم مِّنۢ بَأْسِكُمْ فَهَلْ أَنتُمْ شَٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾ الأنبياء

وە داودمان فێری دروستکردنی قەلغان کرد بۆئێوە بۆئەوەی بتان پارێزێت لەناڕەحەتیەکانی جەنگەکانتان جا ئایائێوە سوپاسمەندن ؟

وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ
وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا
نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ سَبَإٍ

وە بۆ سلێمان ( با ) مان ملکەچ کرد ڕۆیشتنەکەی لەبەیانیانەوە تائێواران مانگێك وهاتنەکەی لەئێوارانەوە بۆبەیانیان ماوەی مانگێك ، وەکانیەکی مسی تواوەمان بۆوالێکرد کەلەبەری بڕوات ، وە لەجندوکەکاندا بەفەرمانی خوا ئەوانەمان بۆ ملکەچکرد کەلەژێر دەستیدا کاردەکەن ، وە کێ لەوان لابدات لەفەرمانەکانمان لەسزاو ئازاری ئاگری پێدەچێژین

وَلِسُلَيْمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةً تَجْرِى بِأَمْرِهِۦٓ إِلَى ٱلْأَرْضِ ٱلَّتِى بَٰرَكْنَا فِيهَا
وَكُنَّا بِكُلِّ شَىْءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾ الأنبياء

وه بۆ سلێمان بایەکی توندوتیژمان ملکەچ کرد کە بەفەرمانی خوا دەڕوات بۆ ئەوخاکەی پیرۆزیمان تێداداناو ئێمە وابووین بەهەموو شتێك ئاگاداربووین

وَمِنَ ٱلشَّيَـٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعۡمَلُونَ عَمَلٗا دُونَ ذَٰلِكَ
وَكُنَّا لَهُمۡ حَـٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾ الأنبياء

وە لە شەیتانەکان ملکەچمانکردن بۆسلێمان ئەوانەی کە بۆئەو دەچوونە قوڵایی دەریاکانەوەو کاری تریان دەکرد جگە لەوکارانە وەئێمە بۆئەوان پارێزگاری کەربووین

واتە ئێمە لەشەیتانەکانیش ئەوانەمان ملکەچکردن کە بۆسلێمان دەچوونە ناو قوڵایی دەریاکانەوە بۆ ئەومەرامانەی کەسلێمان دەیویستن وەئێمە بۆئەوان پارێزگاربووین لەهەموو هەڵس وکەوتێکی شەیتانەکان

ئینجا سلێمانَ سەردانێکی باڵندەکانی کردوو ئەم دیمەنە ڕویدا

وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيۡرَ فَقَالَ مَا لِيَ لَآ أَرَى ٱلۡهُدۡهُدَ أَمۡ كَانَ مِنَ ٱلۡغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ النمل

وە سەردانی باڵندەکانی کردوو ( یەکێك لەباڵندەکانی نەبینی) ، بۆیە ووتی ئەوە بۆ من هود هود نابینم ، یان لەوانە بووە کەنەهاتوون

لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابٗا شَدِيدًا أَوۡ لَأَاْذۡبَحَنَّهُۥٓ أَوۡ لَيَأۡتِيَنِّي بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴿٢١﴾ النمل

سوێند بێت سزای دەدەم سزایەکی توند، یان سوێندبێت سەری دەبڕم ، یان ئەوەتا دێت بۆلام بەبەڵگەو دەسەلاتێکی ئاشکراوە

فَمَكَثَ غَيۡرَ بَعِيدٖ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ وَجِئۡتُكَ
مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٖ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾ النمل

هود هود مایەوە بۆماوەیەك زۆر درێژ نەبوو ، جا کەگەڕایەوە ووتی چاوم گێڕا بەوەی کەتۆچاوی پێداناگێڕی وەهاتومەوە بۆلات لەسەبەئەوە بەهەواڵێکی ڕاستەوە بۆم هێناوی

إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ النمل

هود هود ووتی وام دیت ئافرەتێك خاوەن داریەتیان دەكات ، وە لە هەموو نازو نیعمەتێكی پێدراوە وەتەخت وتاراجێكی گەورەی هەیە

وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٢٤﴾ النَّمل

وە وام بینی خۆی و گەلەكەی كڕنوش دەبەن بۆخۆر لەجیاتی كڕنوشبردن بۆخوا ، وە شەیتان جوانكاری بۆكردن لەكارەكانیاندا ، وەلایدان لەسەر ڕێگاكە، جا بۆیە ئەوان نایەنەسەر ڕێگەی ڕاست

قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ النَّمل

سلێمان ووتی تەماشادەكەین...بزانین ئایا ڕاستتكرد؟یان لەدرۆزنەكان بووی

ٱذْهَب بِّكِتَٰبِى هَٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ النَّمل

بڕۆ بەونوسراوەی منەوە ، وە بیگەیەنە بەوان ، ئینجا وازیان لێبێنە و تەماشاكە ( بزانە )چ وەلامێك دەگەڕێننەوە

قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ النَّمل

بەڵقیس ووتی ئەی خەڵكینە ئەمن نامەیەكی پیرۆزم پێگەیشتووە

إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ النَّمل

ئەونامەیە لەسلێمانەوەیە وەئەونامەیە بە بسم الله الرحمن الرحیم دەست پێدەكات

سلێمان ( سەلامی خوای لێبێت ) لەنامەكەیدا داوای لێكردن

أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾ النَّمل

كە بەسەرمنەوە دەسەلات دارترنەبن وبێن بۆلام وەكو گەلێكی موسڵمان

قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى

مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ النَّمل

بەڵقیس ووتی ئەی خەڵكینە ڕێگەم نیشانبدەن لەوكارەی كەكەوتۆتە ئەستۆم من هیچ كاتێك بڕیارم لەسەر هیچ شتێك نەداوە تائێوە ئامادەوئاگادار نەبن

قَالُواْ نَحۡنُ أُوْلُواْ قُوَّةٖ وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ

وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ ﴿٣٣﴾ النمل

**خەڵکەکە وتیان ئێمە هێزدارین خاوەنی دەسەلاتی سەختی جەنگین و فەرمانیش بۆتۆیە جاتەماشاکە چ فەرمان دەدەیت**

قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا

وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٤﴾ النمل

**پاشایەکانی ژێر دەسەلاتی بەڵقیس وتیان ئەوانە ئەگەر چونە ناوگوندێکەوە بێکەڵکی دەکەن وەبەرێزترینی خەڵکەکەی دەکەن بەڕیسواترینیان وە ئاوەها ئەوان دەیکەن**

وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٣٥﴾ النمل

**بەڵقیس وتی وەمن نێردراوم بۆئەوان ناردوون بەدیارییەکەوە جاچاوەڕێ دەکەم بەچیەوە نێردراوەکان دەگەڕێنەوە**

فَلَمَّا جَآءَ سُلَيۡمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٖ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيۡرٞ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم

بَلۡ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمۡ تَفۡرَحُونَ ﴿٣٦﴾ النمل

**جا کاتێك نێردراوەکان هاتن بۆلای سلێمان پێی وتن دەستی ماڵ وسامانیم بۆ درێژدەکەن جابزانن ئەوەی خواداویەتی بەمن زۆر چاکترە لەوەی کەداویەتی بەئێوە بەلام ئێوە بەدەست ودیاریەکەتان دڵخۆشن**

ٱرۡجِعۡ إِلَيۡهِمۡ فَلَنَأۡتِيَنَّهُم بِجُنُودٖ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخۡرِجَنَّهُم مِّنۡهَآ

أَذِلَّةٗ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾ النمل

**سلێمان( بەنێردراوەکەی ) فەرموو بگەڕێرەوە بۆلایان جابەڕاستی بە لەشکرێکەوە دێم بۆسەریان کەنەتوانن بەڕوویدا بوەستن وەلەوێدا دەریان دەپەڕێنین بەملکەچی وبێدەسەلاتی وکەم وبچوك کراوەیی**

قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَيُّكُمۡ يَأۡتِينِي بِعَرۡشِهَا قَبۡلَ أَن يَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣٨﴾ النمل

سلێمان ووتی ئەی خەڵکینە کامەتان تەخت و تاراجەکەی بەڵقیسم بۆدێنیٚ پێش ئەوەی بەموسڵمانی ئەوان بێن بۆلام

قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ وَإِنِّى عَلَيْهِ لَقَوِىٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾ النَّمْل

لاشەزلێك لەجندوکە ووتی من بۆت دەهێنم پێش ئەوەی لەشوێنەکەی خۆت هەستی وەمن بۆسەر ئەوتەخت وتاراجە بەهێزو دەستپاکم

قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ﴿٤٠﴾ النَّمْل

ئەوەی کەزانستی لەکتێبە ئاسمانیەکە پێبوو ووتی من بۆت دەهێنم پێش ئەوەی چاوت بتروکێنی

ئەوەی کەعەرشی بەلقیسی بۆسلێمان هێنا ناوی ( اصف ی کوڕی برخیا ) بوو کە عائشە دەربارەی ئەو گێڕایەوە کەپێغەمبەر ( سەڵەواتی خوای لێبێت ) فەرمووی گەورەترین و پیرۆزترین ناوی خوا کە ( ( اصف ) رەحمەتی خوای لێبێت ) داوای پیٚ لەخوا کرد( بۆ هێنانی تەختی بەلقیس ) یا حی یا قیوم بوو

( كشف الاسرار المخفية ص ١٤٠ )

دنیای ووشەو وێردەکان دنیایەکی زۆر فراوانن هەموو کارێکیان پیٚ ئەنجام دەدرێت ، گرنگ ئەوەیە زانابی بەووێردەکان وکاتی بەکارهێنانیان بزانیت

خەڵکی بەلایانەوە سەیرە چۆن لەڕابردوودا مرۆڤ توانیویەتی ئەم هەموو بەردە گەورانە کۆبکاتەوەو ئەوکۆشك وتەلارو پردانەی پێدروست بکات لەکاتێکدا کە هیچ ئامێرێك نەبوبێت ئەوبەردانە بگوازێتەوەو بەرزیان بکاتەوە ، پەروەردگار پەنجە بۆئەوە درێژ دەکات کەزانستەکانی ناوکتابە ئاسمانیەکان توانای ئەوەیان هەیە نەك تاکە بەردێك بەڵکو تەخت وتاراجی پاشایەك لەووڵاتێکەوە بۆ ووڵاتێکی تر بگوازنەوە

وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِى ٱلْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ الكَهْف

وە دەربارە ( ذى القرنين ) پرسيارت لێدەکەن بڵێ یادەوەرییەك دەربارەی ئەو بۆئێوە باس دەکەم

إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ الكهف

ئێمە تواناو دەسەلاتماندا بەو لەزەویدا وە لەهەموو شتێك هۆكارێكمان دایە

فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا....... ﴿٨٦﴾ الكهف

جا بەدوای هۆکارێکدا چوو (٨٥)هەتا کەگەیشتە شوێنی ئاوابوونی خۆر لەوێدا خۆری بینی ئاوادەبێت لە کانیەکی قوڕەڕەش دا وە لەوشوێنە نەتەوەیەکی بینی (٨٦).

ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴿٩٠﴾ الكهف

جا بەدوای هۆکارێکدا چوو(٨٩) هەتا کەگەیشتە شوێنی خۆرهەلاتن خۆری بینی بەسەر نەتەوەیەکدا دەردەکەوێت کەلەنێوان خۆرو ئەواندا هیچ بەربەستێکمان دانەناوە (٩٠).

واتە لە ئەوشوێنەی کەخۆری لێدەردەکەوێت لەلای خۆرهەلاتی گۆی زەویەوە خاکێکی تەختاییە و هیچ بەربەستێکی وەکو شاخ و گرد نین لەنێوان خۆرو ئەواندا

ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾ الكهف

جا بە دوای هۆکارێکدا چوو(٩٢) تا گەیشتە نێوان دوو چیا لەخوار ئەم دوو چیایە نەتەوەیەکی بینی واپێنەدەچوو کە لەئاخافتن تێبگەن (٩٣).

قَالُوا۟ يَـٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ الكهف

خەڵکەکەی ئەویٚ ووتیان ئەی ذی القرنین بەڕاستی یاجوج وماجوج خراپە کارن لەزەویـدا ئینجا ئەگـەر خەرجییـەکت بۆکۆبکەینـەوە لەسـەر ئـەوەی کەلـەنێوان ئێمەو ئەواندا بەربەستێك دروست بکەیت

قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ الكهف

ووتی ئەوەی خوا لەهەبوندا داویەتی بەمن باشترە لـەوەی ئێـوە ، جاپشتیوانیم لێبکـەن بەهـەموو توانایەکتانـەوە بەربەسـتێکی بتـەو لـەنێوان ئێـوەو ئەوانـدا دروست دەکەم .

ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُوا۟ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿٩٦﴾ الكهف

ووتـی پارچـەی ئاسـنم بـۆبێنن هـەتا کەئاسـتی هـەردووك بەرەکـەی وەکویـەك لێکرد، ووتـی فـووی ئاگراوی پێداکـەن هـەتاکو ئاسنەکەی وەکـو ئاگر لێکـرد، ووتی مسی تواوەم بۆبێنن بەسەریا بەتاڵدەکەم

کەواتە ئەگەر ئاسنەکە گەرم بکرێت پێکهاتەکە بەهێزترو پتەوتر دەبێت

فَمَا ٱسْطَٰعُوٓا۟ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ لَهُۥ نَقْبًا ﴿٩٧﴾ الكهف

جا نەیانتوانی سەری بکەون ونەیان توانی لەشاخەکان ڕێگایەکی بۆبدۆزنـەوە (النقب ) ڕێگا لەشاخەکان (المنجد ص ٨٢٩ )

وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِى بَعْضٍ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَجَمَعْنَٰهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾ الكهف

وە وازمان لێهێنان لەناویەکتریدا شەپۆل بخۆن وکاتێکیش کەفوو بە (صـور ) دا کرا ئەوا هەموویانمان کۆکردۆتەوە

واتـە لەیـەکێك لەقۆناغـەکانی ژیـانی مرۆڤایەتیـدا گـەل ونەتەوەیـەك کەخراپـە کاربوون بۆڕەوڕەوەی ژیانی مرۆڤایەتی ، خوا نێردراوێکی بۆناردوون بەوەی کە لەشـوێنێکی سـەخت لـەنێوان دوو شـاخی سەرکەشـی هەڵـدێردا دەرگایـان

لێدابخرێت و توانای هاتنە دەرەوەیان نەبێت تاهاتنی کاتی کۆتایی ئەم بوونەوەرە، کەمانای پتەوی ئەوبەربەستەش نیشاندەدات کەلەوکاتەوە تادواکاتی بونەوەر دەمێنێت ، و دەسەڵاتیان بەسەریدا ناشکێت ، ئەم گەل ونەتەوەیە بە یاجوج و ماجوج ناسراون

وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا فَقَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱرْجُواْ ٱلْيَوْمَ ٱلْأَخِرَ
وَلَا تَعْثَوْاْ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٣٦﴾ سُورَةُ العَنكَبُوتِ

وە بۆخەڵکی مەدیەن شوعەیبی برایانمان نارد ، وە ووتی ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن وداوای ڕۆژی دوایی بکەن و ( بۆڕۆژی دوایی هەوڵدەن )، ولەزەویدا وەکو خراپەکار هەوڵ وتێکۆشان مەکەن

وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥ
قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ فَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ
أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَـٰحِهَا ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ
إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨٥﴾ الأعْرَافِ

وە بۆخەڵکی مەدیەن شوعەیبی برایانمان نارد وەووتی ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن بۆئێوە هیچ خوایەك لەوزیاترنیە، بەدڵنیاییەوە ئێوە بەڵگەو ڕونکردنەوەیەکتان بۆهاتووە لەلایەن پەروەردگارەکەتانەوە جائێوە مافی تەواو بدەن بەپێوان وتەرازو وە لەبەهاو کێش و نرخی شتەکانی خەڵکی کەم مەکەنەوە ، وە خراپەکاری مەکەن لەسەرزەویدا دوای ئەوجاکەکاریانەی کە تێیداکران ، ئەو کردەوەیەتان بۆئێوە باشترە ئەگەر ئێوە خاوەن باوەڕبن

وَلَا تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ
وَتَبْغُونَهَا عِوَجًا وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْ وَٱنظُرُواْ كَيْفَ
كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨٦﴾ الأعْرَافِ

وە لەسەر هەموو سەرەڕێ وڕێبازێك دامەنیشن ، وادەی شەڕفرۆشی وڕێگری دەکەن لەڕێبازی خوا بەرامبەر ئەوانەی کەباوەڕیان پێهێناوە وەدەتانەوێت ڕێبازی خوا چەوت بێت ، وە یادی ئەوە بکەنەوە کەئێوە نەتەوەیەکی کەم بوون جاخوا زیادی کردن وە تەماشاکەن دوا ئەنجامی خراپەکارەکان چۆن بوو

قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لَنُخْرِجَنَّكَ يَـٰشُعَيْبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَكَ مِن قَرْيَتِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۚ قَالَ أَوَلَوْ كُنَّا كَـٰرِهِينَ ﴿٨٨﴾ الأعراف

خەڵکانێك لەگەلەکەی کەخۆیان بەگەورە دەزانی ووتیان ئەی شوعەیب بێشك تۆوئەوانەی لەگەڵ تۆ باوەڕیان هێناوە دەرتان دەکەین لەگوندەکەمان یان ئەوەتا دەگەڕێنەوە بۆناومیللەتەکەمان شوعەیب فەرمووی : ئەدی ئەگەر ئێمە ئەوکارەمان بەخراپ زانی ؟

فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلرَّجْفَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دَارِهِمْ جَـٰثِمِينَ ﴿٣٧﴾ العنكبوت

جا بەدرۆزنیان دەرهێنا بۆیە بومەلەرزەکە لەناوی بردن و وایان لێهات لە ماڵەکانیاندا کپ ومات بەچۆکدا کەوتن ومردن

وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مُوسَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥١﴾ مريم

وە یادی موسا بکەوە لە قورئاندا بەڕاستی ئەو دڵسۆز بوو وەنێردراوو پێغەمبەرێکی خوابوو

وَنَـٰدَيْنَـٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنِ وَقَرَّبْنَـٰهُ نَجِيًّا ﴿٥٢﴾ مريم

وە بانگمانکرد لەلای ڕاستی چیای طورەوەو نزیکمان کردەوە لەخۆمان و لەگەڵی دواین

وَهَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿٩﴾ إِذْ رَءَا نَارًا فَقَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ أَوْ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدًى ﴿١٠﴾ طه

وە ئایا تۆ ووتووێژی موسات بۆهاتووە(٩) کە ئاگرێکی بینی جا بەکەس و کارەکەی گووت ئێوە لێرەبن من ئاگرێکم بینی بەڵکو بڵێسەیەکتان لەوئاگرە بۆبێنم یان لەسەر ئاگرەکە ڕێ نیشاندەرێك دەبینم(١٠).

فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَـٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ
ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ﴿١٢﴾ وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾ طه

**جا کەهاتەلای ئاگرەکە بانگی لێوەکرا ئەی موسا(١١) ئەوە منم پەروەردگاری تۆ جانەعلەکانت دانێ تۆلەدۆڵی پیرۆزی طوی دای(١٢) وە من تۆم هەڵبژاردووە جا گوێ بگرە لەوەی پەیامت بۆدەکرێ(١٣).**

فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَـٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَـٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ
أَن يَـٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَـٰلَمِينَ ﴿٣٠﴾ سورة القصص

**جا کەهاتەلای ئاگرەکە لەکەناری لای ڕاستی دۆڵەکەوە لەپەڵەیەکی پیرۆز لەدارەکەوە بانگی لێوەکرا کەئەی موسا ئەوە منم، من خوام پەروەردگاری جیهانیان**

إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾ طه

**بەڕاستی من خوام هیچ پەروەردگارێك نیە تەنها من نەبێت جا بمپەرستە وەنوێژەکان بەڕێوەبەرە بۆیادی من**

**جا خوا چاوێکی بەجەستەی موسادا گێڕاو بۆمەبەستێك ئەم پرسیارەی کرد:**

وَمَا تِلۡكَ بِيَمِينِكَ يَـٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ طه

**ئەی ئەوە چیە بەدەستی ڕاستتەوەیە ئەی موسا ؟**

قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيۡهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا
مَـَٔارِبُ أُخۡرَىٰ ﴿١٨﴾ طه

**ووتی ئەوە گۆچانەکەمە خۆمی بەسەردا ڕادەگرم ومەڕەکانمی پێ لێدەخوڕم و لەو گۆچانەدا پێداوویستی تریشم تێیدا هەیە**

قَالَ أَلۡقِهَا يَـٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلۡقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٞ تَسۡعَىٰ ﴿٢٠﴾
قَالَ خُذۡهَا وَلَا تَخَفۡۖ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلۡأُولَىٰ ﴿٢١﴾ طه

خوا فەرمووی گۆچانەکە هەڵدە ئەی موسا (١٩)جا هەڵیدا وەبوو بەمارێکی گەورە هەوڵی دەدا(٢٠) خوا فەرمووی بیگرەوەو مەترسێ ئێمە دەیگێڕینەوە سەر شێوازە یەکەمیەکەی (٢١).

وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخْرَىٰ ﴿٢٢﴾
لِنُرِيَكَ مِنْ ءَايَٰتِنَا ٱلْكُبْرَى ﴿٢٣﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾

وە دەستت بخە بن باڵت بەسپیەتی دێتەدەرێ بەبێ ئەوەی توشی هیچ خراپەیەك بووبێت ئەوەش بەڵگەو نیشانەیەکی ترە بۆتۆ(٢٢) بۆ ئەوەی لە بەڵگەو نیشانە گەورەکانی خۆمانت نیشان بدەین(٢٣) بڕۆ بۆلای فیرعەون بەڕاستی ئەو یاخی بووە(٢٤).

قَالَ رَبِّ ٱشْرَحْ لِى صَدْرِى ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِىٓ أَمْرِى ﴿٢٦﴾
وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن لِّسَانِى ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا۟ قَوْلِى ﴿٢٨﴾
وَٱجْعَل لِّى وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِى ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِى ﴿٣٠﴾
ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِى ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِىٓ أَمْرِى ﴿٣٢﴾ كَىْ نُسَبِّحَكَ كَثِيرًا ﴿٣٣﴾
وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾
قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾

موسا ووتی خوایە سنگ ودەروونم پاك بکەرەوە (٢٥) وە ئاسان کاریم بۆبکە لە کارەکانمدا(٢٦) وە گرێ یەك لە زمانمدایە بیکەوە (٢٧) لە قسەکانم تێدەگەن(٢٨) وە لەکەس وکارەکەی خۆمدا وەزیرێکم بۆ دابنێ(٢٩)هاڕونی برام بێت(٣٠)پشتی خۆمی پێ قایم دەکەم (٣١) وە هاوکاری خۆمی پێدەکەم لە کارو فرمانەکانمدا(٣٢) تا زۆر سوپاس وستایشی تۆ بکەین (٣٣)وە زۆر یادی تۆبکەین(٣٤) بەڕاستی تۆ بەئێمە ئاگادار وبینای(٣٥)خوا فەرمووی ئەی موسا ئەوانەت پێدران کەداوات کردن(٣٦).

ئینجا کەخوای گەورە ڕاستەوخۆ لەگەڵ موسا دوا موسا داوای لەخوا کرد کە هارونی برای بکات بەوەزیر بۆپشتیوانی کردنی پەروەردگاریش داواکەی پەسەند کردو فەرمووی

﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥ مِن رَّحْمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيًّا ﴿٥٣﴾﴾ مريم

وە لە سۆزو بەزەیی خۆمانەوە هاڕونی برایمان بەوبەخشی وەك پێغەمبەرێك

﴿وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴿٣٧﴾ إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾﴾ طه

وە بەدڵنیاییەوە جارێكی تریش تۆمان خستە بەر نازونیعمەتی خۆمان(٣٧) کەپەیاممانکرد بۆدایکت ئەوەی کەپەیام دەکرێت(٣٨) کە بیخە ناو سندوقێکەوەوهەڵیدە ناودەریاوە ئینجا ئاوی دەریاش بۆکەنارەکەی دەبات لەوێ دوژمنێکی من ودوژمنێکی ئەو دەیگرێتەوە ، وە خۆشەویستیەکم لەلایەن خۆمەوە بەتۆدا وە تا لەبەرچاوی خۆم پەروەردەودروست ببی(٣٩).

﴿إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾﴾ طه

کە خوشکەکەت بەڕێدا دەڕۆیشت جا دەیگوت ئایا دەتانەوێت ئەوکەسەتان نیشان بدەم کە ئەومنداڵە بگرێتە ئەستۆی خۆی جاگەڕاندمانیەوە بۆلای دایکت تاچاوی بەتۆ ڕوون ببێتەوەو خەفەتبار نەبێت ، وە کەسێکت کوشت جائێمە تۆمان لەغەمگینی ڕزگارکرد وە ئینجا بەچەندین تاقیکردنەوە تۆمان تاقیکردەوە ، وە چەندین ساڵ لەناو خەڵکی مەدیەندا مایتەوە جا تۆ لەکاتی دیاری کراوی خۆیدا هاتی ئەی موسا.

﴿وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِى ﴿٤١﴾﴾ طه

وه من ( كەسايەتيەكەی ) تۆم بۆ ( مەبەستی )خۆم دروستكرد

ٱذۡهَبۡ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِي وَلَا تَنِيَا فِي ذِكۡرِي ﴿٤٢﴾

ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾

فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ ﴿٤٤﴾ طه

تۆ وهاڕونی برات بڕۆن بەڵگەو نیشانەكانی من بەرن وەیادی من لەبیرمەكەن(٤٢)بڕۆن بۆلای فیرعەون بەڕاستی ئەوسەركەشی كردووە(٤٣)جا بەو بڵێن بەقسەكردنێكی نەرمونیان بەڵكو بیربكاتەوە یان لەخوابترسێ(٤٤).

قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفۡرُطَ عَلَيۡنَآ أَوۡ أَن يَطۡغَىٰ ﴿٤٥﴾

قَالَ لَا تَخَافَآ إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ طه

وتیان ئەی پەروەردگارەكەمان ئێمە دەترسین لەوەی كەپەلە بكات لە سزادانمان و دەستدرێژی بكاتە سەرمان(٤٥)خوا فەرمووی ئێوە مەترسێن من لەگەڵ ئێوەدام دەبیستم ودەبینم(٤٦).

فَأۡتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبۡهُمۡ

قَدۡ جِئۡنَٰكَ بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكَۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلۡهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ طه

جا بچنەلای و پێیبڵێن ئێمە دوو ڕەوانەكراوی پەروەردگاری تۆین جا بەنی ئیسرائیل لەگەڵ ئێمەدا بنێرە ، وە ئازاریان مەدە ، بەڕاستی ئێمە نیشانەیەكمان بۆهێناوی لەلایەن پەروەردگاری تۆوە وەسڵاوی خوا لەسەر ئەوكەسەی كەڕێگەی ڕاست دەگرێتەبەر

إِنَّا قَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡنَآ أَنَّ ٱلۡعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ طه

بێگومان ئێمە پەیاممان بۆهاتووە كەبەڕاستی سزای خوا بۆسەر ئەوكەسانەیە كە درۆیانكردو پشتیانكرد لەبەڵگە و نیشانەكانی خوا

قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾

قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ طه

فیرعەون ووتی جاخوای ئێوە کێیە ئەی موسا ؟(٤٩) ووتیان پەروەردگاری ئێمە ئەو پەروەردگارەیە کەهەموو شتێکی داوە بەوانەی کەدروستی کردوون ئینجا ڕێگەشی نیشانداون(٥٠).

وَلَقَدْ أَرَيْنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴿٥٦﴾ طه

وە بەدڵنیاییەوە هەموو بەڵگەو نیشانەکانمان نیشاندا جابەدرۆی دەرهێنان و گوێی پێنەدان

قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٥٧﴾ طه

فیرعەون ووتی ئەی موسا ئایائێوە بۆیەهاتوون بۆلای ئێمە کەبەجادوەکەتان لەخاکەکەمان بەدەرمان بنێن

وَقَٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱسْتَكْبَرُوا۟
فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُوا۟ سَٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾ سورة العنكبوت

وە قارون و فیرعەون و هامان وەبەدڵنیاییەوە موسا هات بۆلایان بەبەڵگەو نیشانەوە ، جاخۆیان بەگەورەزانی لەزەویدا ، وە لەوانە نەبوون کەلەپێش خۆیانەوە خەڵکی وەکو ئەوان نەبوبێت

بەنی ئیسرائیل گەل ونەتەوەی موسابوون ، ژێردەستەبوون لەلای فیرعەون لە وولاتی مصر ، سوکایەتیەکی زۆریان لەلایەن فیرعەون و داورودەستەکەیەوە پێکرا

قَالَ إِن كُنتَ جِئْتَ بِـَٔايَةٍ فَأْتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾ الأعراف

فیرعەون ووتی: ئەگەر بەڵگەو نیشانەیەکت هێناوە ئەوا بیهێنە ئەگەر ئەتۆ لە ڕاستگۆکانی

فَأَلْقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ ثُعْبَانٌ مُّبِينٌ ﴿١٠٧﴾ الأعراف

جا گۆچانەکەی هاویشت وەگۆچانەکە بوو بەمارێکی دیاروئاشکرا

وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِىَ بَيْضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ الأعراف

وە دەستی لەبن باڵی دەرهێنا جادەستی سپی پرشنگدار دەرکەوت بۆئەوانەی تەماشایان دەکرد

قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٞ ﴿١٠٩﴾ الأعراف

خەڵکانێك لە گەلەکەی فیرعەون ووتیان بەڕاستی ئەوە جادوکەرێکی زانایە

يُرِيدُ أَن يُخۡرِجَكُم مِّنۡ أَرۡضِكُمۡۖ فَمَاذَا تَأۡمُرُونَ ﴿١١٠﴾ الأعراف

دەیەوێت دەرتان بکات لەخاکەکەتان ، جا ئێوە چی دەفەرموون ؟

قَالُوٓاْ أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ وَأَرۡسِلۡ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾

يَأۡتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ ﴿١١٢﴾ الأعراف

ووتیان خۆی و براکەی دواخەن و بیانهێڵنەوە وەبنێرە بۆمەدائن لەوێ هەموو جادوکەرەکان کۆبونەوە (١١١) بۆت دێنن هەموو جادوکەرێکی زانا(١١٢).

وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرۡعَوۡنَ قَالُوٓاْ إِنَّ لَنَا لَأَجۡرًا إِن كُنَّا نَحۡنُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾

قَالَ نَعَمۡ وَإِنَّكُمۡ لَمِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ الأعراف

وە جادوکەرەکانی فیرعەون هاتن ووتیان (ئایا) بۆ ئێمە پاداشت هەیە ئەگەر هاتوو ئێمە سەرکەوتووبووین(١١٣) فیرعەون ووتی بەڵێ وەئێوە لەوکەسانە دەبن کەنزیکن لەمن(١١٤).

قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحۡنُ ٱلۡمُلۡقِينَ ﴿١١٥﴾ قَالَ أَلۡقُواْۖ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ سَحَرُوٓاْ أَعۡيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسۡتَرۡهَبُوهُمۡ وَجَآءُو بِسِحۡرٍ عَظِيمٖ ﴿١١٦﴾ الأعراف

ووتیان ئەی موسا دەست پێدەکەی یان ئێمە لەدەست پێکەرەکان دەبین(١١٥) موسا ووتی ئێوە دەست پێبکەن ، جا کاتێك کەدەستیان پێکرد جادوی چاوی خەڵکیانکردو تۆقاندیانن وە بەجادویەکی گەورەوەهاتن(١١٦).

وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۖ فَإِذَا هِيَ تَلۡقَفُ مَا يَأۡفِكُونَ ﴿١١٧﴾ الأعراف

وە پەیامماندا بەموسا کەگۆچانەکەت بهاوە جاگۆچانەکەی وەکومارێکی گەورە هەموو ئەوکردەوە درۆیانەی قوتدەدا کەدەیانکرد

فَوَقَعَ ٱلۡحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾

ڕاستی سەرکەوت و پوچەڵ بۆوە ئەوەی کەئەوان دەیانکرد(١١٨) جا لەوێ
دۆڕان وشکستیان هێناولەوپەڕی دەسەڵات ولوت بەرزیەوە گۆڕان بۆ ئەوپەڕی
زەلیلی و بچوکی(١١٩).

وَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾
رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ الأعراف

وە جادوکەرەکان بە کڕنوش بردنەوە بەزەویدا کەوتن(١٢٠) ووتیان باوەڕمان
هێنا بەپەروەردگاری جیهانیان(١٢١) پەروەردگاری موسا وهاڕون(١٢٢).

وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ الأعراف

وە بەدڵنیاییەوە ئێمە فیرعەون و پەیڕەوەکانیمان توشی ووشکە ساڵەکان وکەم
بوونەوەی بەرووبومی میوەکان کرد بەڵکو بیردەکەنەوە
بەڵکو بەونەهامەتیانە کەبەسەریاندا دێت بیر دەکەنەوەو پەشیمان دەبنەوەو
باوەڕدێنن بەپەروەردگاریان

وَقَالُواْ مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ الأعراف

وە ووتیان هەرچیەکمان بۆبێنی لەبەڵگەو نیشانە بۆئەوەی جادومان لێبکەیت
جا ئێمە هەرباوەڕ بەتۆناهێنین

فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ
ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَٱسْتَكْبَرُواْ وَكَانُواْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ الأعراف

ئینجا تۆفان وکوللە وئەسپێ وبۆق وخوێنمان بەسەردا ناردن ، بەڵگەو
نیشانەی ڕوون وتێروتەسەلن دوای ئەوەش هەرخۆیان بەگەورەزانی وەئەوانە
گەلێکی تاوانباربوون

وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ ٱلرِّجْزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ
لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾

وە کاتێك کە ئەوسزایەیان بەسەرداکەوت ووتیان ئەی موسا داوامان بۆبکە لە
پەروەردگارەکەت بەوەی کەپەیمانی بەتۆداوە ئەگەر بێت وئەم سزایەمان لەسەر

**لابەرێت ئەوا ئێمە باوەڕ بەتۆدەکەین و بەدڵنیاییەوە بەنی ئیسرائیل لەگەڵ تۆدا دەنێرین**

فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلرِّجْزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿١٣٥﴾ الأعراف

**خوا دەفەرمووێت  جا کاتێ کەسزاکەمان لەسەر لابردن تاکاتێکی دیاریکراو کە ئەوان دەیگەنێ ، جا ئەوان پەیمانەکەیان دەشکاند**

فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٣٦﴾
وَأَوْرَثْنَا ٱلْقَوْمَ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ يُسْتَضْعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلْأَرْضِ وَمَغَٰرِبَهَا ﴿١٣٧﴾ الأعراف

**جا تۆڵەمان لێکردنەوانێ وەژێر ئاومان خستن لەدەریادا بەوەی کەئەوان بەڵگەو نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەردەهێنا وە گێل و بێئاگابوون لەبەڵگە و نیشانەکانی ئێمە(١٢٦) وەخۆرهەلات وخۆرئاوای زەویمان کرد بەمیرات بۆ ئەوگەلەی کە کزوژێردەست کرابوون (١٢٧).**

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ أَنجَىٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿٦﴾ إبراهيم

**وە کەموسا بەگەلەکەی ووت یادی نازو نیعەتەکانی خوا بکەن بەسەرتانەوە کە ڕزگاری کردن لەداورودەستەی فیرعەون ، خرابترین سزایان پێدەچێژتن وە کوڕەکانتانیان سەردەبڕی وژنەکانتانیان دەهێشتنەوانێ ، لەو کارەدا کە لەگەڵتانکرا تاقیکردنەوەیەکی گەورەیە لەلایەن پەروەردگارتانەوە**

**بەداخەوە کەڵك لەم بەڵگەو نیشانانەی خوا وەرنەگیرا دوای هەزاران ساڵ لە دوای فیرعەون گەلێکی خاوەن باوەڕوخاوەن زمان ومێژوو، توشی هەمان چارەی ڕەشی بەنو ئیسرائیل بوو، وە زۆریش خراپتریان پێکرا لە بەنو ئیسرائیل، وکیماوی باران کران وڕاگوێزران وزیاد لە ( ٤٠٠٠ ) چوار هەزار گوند کاولکران و (١٨٢٠٠٠) سەدوهەشتاو دوو هەزار کەسیان لەماوەیەکی کەمدا زیندەبەچاڵکران و  (٨٠٠٠ ) هەشت هەزار گەنج ولاوی بەجەرگیان لە خێزانەکانیان جیاکردنەوەو لەسنوری نێوان چەند دەوڵەتێکی ئیسلامدا زیندە**

بەچاڵکران وئافرەتەکانیان هێڵرانەوە بۆئەوەی توشی داوێن بیسی بن، لەم هەموو کارەساتەدا کەسێك هەڵویستێکی نەبوو

ئەگەر هێزودەسەلآت وتواناى پەروەردگار نەبوایە ئایا ئێمە هەمووومان بێ هیوا نەبووین ؟

وَإِذْ وَٰعَدْنَا مُوسَىٰٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ثُمَّ ٱتَّخَذْتُمُ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَنتُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾

ثُمَّ عَفَوْنَا عَنكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٢﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ

وە کە چل شەو وادەمان بەموسادا جادوای ئەوچل شەوە ئێوە گوێرەکە پەرستیتان پەیڕەوی کرد، وە ئێوە ستەمکاربوون ئینجا دوای ئەوە لێتان خۆشبووین ، بەهیوای ئەوەی سوپاس وستایشی خوابکەن

لە سورەتی طە ئایەتی ٨٨ تەفسیری ( ابن کثیر و القرطبی) چیرۆکی ئەم گوێرەکە پەرستیە ڕوونکراوەتەوە

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم

مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ سُورَةُ الجَاثِيَةِ

وە بەدڵنیاییەوە زانستی کتێبە ئاسمانیەکان ودەسەلآت وپێغەمبەرایەتیماندا بەبەنی ئیسرائیل ، وە بژێویمان پێدان لەخواردنە خۆش وچاکەکان ، وە بەرزمانکردنەوە بەسەر هەمووجیهانیاندا

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ لِمَ تُؤْذُونَنِى وَقَد تَّعْلَمُونَ أَنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ

فَلَمَّا زَاغُوٓا۟ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمْ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ سُورَةُ الصَّفِّ

وە کاتێك کەموسا بەگەلەکەی گووت ئەی گەلەکەی من بۆچی ئازارم دەدەن وە بەدڵنیاییەوە ئێوە دەزانن من نێردراوی خوام بۆلای ئێوە ، جاکاتێك خۆیان لارکردەوە لەڕاستیەکان خواش دڵ ودەروونی ئەوانی لارکردەوە لەڕێگەی ڕاست وە خوا ڕێنومایی کەلێك ناکات کەلایاندابێت لەڕێگەی ڕاست

فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ

وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن

كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٠﴾ سُورَةُ العَنكَبُوتِ

وه هەریەكێك لەوانە سزاماندا بەپێی تاوانەكانی ، جا لەوانەدا ئەوەی كەهێزی (با)مان ناردەسەریْ وەئەوەی كەبومەلەرزەكە گرتیەوەولەناوی برد، وە ئەوەی كەلەوان بەناخی زەویدا بردمانەخواریْ، وەئەوەی كەلەوان لەناو ئاوی دەریادا نقومماننكردن ، وە خوا نەیدەویست كەستەمیان لێبكات بەڵام خۆیان ستەمیان لەخۆیانكرد

واتە دەستەبەدەستە ئەوانەی كەهاتوون كارەكانی خۆیان ئەنجامداوە ، ئینجا ئەگەر سەرپێچی فەرمانەكانی خوایان كردبێت ئەوا هەر گەل ونەتەوەیەكی بەدەردێك بردووەو فەوتاندونی وەنەوەیەكی تری تازەی كردووە بەجێنیشینی خۆی تاگەیشتە سەردەمی یونسی كوڕی مەتی

وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ سُورَةُ الصَّافَّاتِ

وە بەڕاستی یونس لەوكەسانەیە كەنێردراوی خوان

یونسی كوڕی مەتی پێغەمبەری خوا بوو بۆسەر خەڵكی نەینەوا ، لەدەست گەل ونەتەوەكەی هەڵات وتوشی ئەم ڕووداوە بوو:

إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾
فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾
لَلَبِثَ فِى بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾
وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِاْئَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾
فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾ سُورَةُ الصَّافَّاتِ

كە( لە دەست نەتەوەكەی ) هەڵات بۆناوكەشتی یەكی بارهەڵگر (١٤٠) بەشداریكرد لەگەڵیان ( بۆ دیاری كردنی چارەنوسی ئەوكەسەی دەبێت لە كەشتیەكەوە خۆی بخاتە ناو ئاوەكەوە بۆ سوكبوونی باری كەشتیەكەو نەمانی مەترسی لەسەر نقوم بوونی )جا لەوانە بوو كە (دۆڕا ) ولێیان برایەوە ( لەسەر ئەوەی كە گەل و نەتەوەكەی خۆی جێهێشتووە )(١٤١) جاحوتێك لە دەریادا قوتیدا وەئەو لۆمەكراو بوو(١٤٢) جا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە كە

ئـەو لەوانـەبوو کـە بـەردەوام یـادی خـوای دەکـرد (١٤٣) ئـەوا لـە ناوسـکی حووتەکـەدا دەمایـەوە هـەتا ئـەوڕۆژەی کەزیندودەکرانـەوە(١٤٤)جـا حوتەکـە هەڵیدایـە چـۆڵێکی ڕوتـەن لەکاتێکـدا ئەونـەخۆش بـوو(١٤٥) وە دارێکمـان لـە جۆرێك لـە کولەکە بەسەریەوە ڕواند(١٤٦ ) وە ئەومان نارد بۆلای سـەد هـەزار کـەس یـان زیـاتر دەبـوون( ١٤٧)جـا ئـەوان باوەڕیـان هێنـا وە نـازو نیعمـەتمان پێدان تاکاتی دیاریکراو(١٤٨).

عن ابنِ عبَّاسٍ عن النَّبيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ: «مَا يَنْبَغِي لِعَبْدٍ أَنْ يَقُولَ إِنِّي خَيرٌ مِنْ يونُسَ بنِ مَتَّى». عون المعبود بشرح سنن أبي داوود ٤٦٦١

پێغەمبەر (سلاّوی خوای لێبێت)فەرمووی: ( بۆبەندەیـەکی خـوا نـەهاتووە کە بڵـێ من لەیونسی کوڕی مەتی باشترم )

ئەمە ڕەوشت وڕێزی نێوان پێغەمبەرانە ، هەڵگرانی ئالاّی یەکسـانی ومافـەکانی مرۆڤ و سەربەستی گەل ونەتەوەکان

بەمُ شێوەیە ژیـان بەردەوام بـوو تاکـاتی ئـەوەهات نەخشـەو پیلانـەکانی لـەدایك بـوونی پێغـەمبـەرێکی تـر لەلایـەن پـەروەردگارەوە ئـاوەڵا بکرێنـەوەو لـەدنیای نادیارەوە ئاشکرابکرێت ، بەلەدایك بوونی پێغەمبـەری مـەزنمان عیسـای کـوڕی مریەم ( سلاّوی خوا لەسەر هەردووکیان ).

إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ
إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ سُورَةُ آلِ عِمْرَانَ

کە خێزانەکەی عیمران ووتـی خوایـە مـن بۆتـۆم بەخشـیوە ئـەوەی لـە سکم دایـە ئازادە ( بۆخزمـەتی مـاڵی تـۆ ) ، جـا ئـەم بەخشـینەم لێـوەربگرە بەڕاسـتی ئـەتۆ بیسەر وزانای بەهەمووشتێك

فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ
وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ
وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ سُورَةُ آلِ عِمْرَانَ

جا كاتێك كە منداڵەكەی بوو ووتی خوایە ئەوەی كە بووم كچ بوو ، خوا زاناترە بەوەی كە ئەو بوویەتی، جا هەموو كوڕێك وەكو ئەوكچە نیە ، وە دایكی ووتی من ناوم لێناوە مریەم ومن خۆی ونەوەكانی دەخەمە پەنای تۆوە لەشەیتانی نەفرین لێكراو

فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيۡهَا زَكَرِيَّا ٱلۡمِحۡرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزۡقًا قَالَ يَٰمَرۡيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا قَالَتۡ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾ سُورَةُ آلِ عِمۡرَانَ

جا خوا بەشێوەیەكی چاك وەریگرت، وە ڕواندنێكی چاك ڕواندی ، وە زەكەریای بۆ ڕاسپارد، هەر كاتێك زەكەریا بەسەر مریەمدا چوبا لەشوێنی خوا پەرستیەكەیدا لەلای مریەم بژێوی وخواردنی دەبینی ، ووتی ئەی مریەم ئەم بژێوی وخواردنەت لەكوێ بوو ، مریەمیش ووتی ئەوە لەلایەن خواوەیە ئەوكەسەی كەخوا وویستی لەسەربێت بەڕاستی بژێوی بێژماری پێدەدات

ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يُلۡقُونَ أَقۡلَٰمَهُمۡ أَيُّهُمۡ يَكۡفُلُ مَرۡيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾

ئەم باسانە لەهەواڵەكانی دنیای نادیارن بۆتۆیان پەیامدەكەین ، تۆلای ئەوان نەبووی كە بێنووسەكانی خۆیان هەڵدەدان ( بۆناو ئاو ) بۆ ئەوەی بزانن ( پێنووسی كامیان سەرئاو دەكەوێت و) كامەیان مریەم دەگرێتە ئەستۆ، وە تۆ لای ئەوان نەبووی كە لەگەڵ یەك لەكێشەدا بوون ( لەسەر ئەوەی كامەیان بەخێوكردنی مریەم بگرێتە ئەستۆ )

جا كەزەكەریا ئەم هەموو خواردن و میوەو بژێویەی لەلای مریەم دیت و دڵنیابوو كەبەڕاستی هەر خوا توانای ئەوەی هەیە بەزستانان میوەی هاوینە بێنێت و بەهاوینان میوەی زستانە بێنێت بۆیە ئەویش بیری كردەوە ئەگەر داوا كارییەك لەپەروەردگار بكات وەڵامی دەدرێتەوە [٤]

هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥ قَالَ رَبِّ هَبْ لِى مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةً طَيِّبَةً
إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتْهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٌ يُصَلِّى فِى
ٱلْمِحْرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحْيَىٰ مُصَدِّقًۢا بِكَلِمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدًا
وَحَصُورًا وَنَبِيًّا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾ سُورَةُ آلِ عِمْرَانَ

**لەوێدا زەکەریا داوای لەپەروەردگاری خۆی کرد ووتی خوایە لەلای خۆتەوە کوڕێکی چاك وباشم پێ ببەخشە، بەڕاستی تۆ گوێ بیستی داواکاریەکانی(٣٨) جا لەکاتێدا کەئەو وەستابوو لەشوێنی خوا پەرستیەکەیدا نوێژی دەکرد، فریشتەکانی خوا بانگیان لێوەکرد کەبەڕاستی خوا مزگێنیت دەداتێ بەیەحیا، کە باوەڕدێنێت بەووشەیك لەلایەن خواوە کەعیسای کوڕی مریەمەوەمەزن و خۆراگرە ، وە پێغەمبەرێکە لەچاکەکاران(٣٩).**

**یەحیای کوڕی زەکەریا ( سلاوی خوایان لەسەر بێت) یەکەمین کەسە کە لەلایەن پەروەردگارەوە ئەم ناوەی پێدراوە**

**یەحیا لەدایك بوو، وە بوو بەپێغەمبەر لەناو گەل و هۆزەکەیدا ، وەکاتێك کە عیسای کوڕی مریەم لەدایك بوو یەحیا یەکەم کەس بوو کەباوەڕی پێهێنا**

وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ
وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ
وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ سُورَةُ المَائِدَةِ

**وە بەدوای ئەواندا و لەسەر شوێن دەستی ئەوان عیسای کوڕی مریەممان نارد کە باوەڕداربوو بەوەی لەژێر دەستیدایە لەتەورات ، وە ئینجیلمان بۆهێنا کەتیایدا ڕێگە نیشاندەرو ڕەوشەنی ڕووناکی خواو باوەڕ پێکردنی ئەوەی کە لە ژێر دەستیدایە لەتەوراتی تێدایە ، وەڕێ نیشاندەرو ڕۆشنکەرەوەیە بۆ ئەوانەی لەخوا دەترسێن**

إِذْ قَالَتِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرْيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٍ مِّنْهُ ٱسْمُهُ ٱلْمَسِيحُ
عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ وَجِيهًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾
سُورَةُ آلِ عِمْرَانَ

**که فریشته‌کانی خوا ووتیان ئه‌ی مریه‌م به‌ڕاستی خوا مزگێنیت پێده‌دات بەووشەیەك لەلای خۆیەوە ناوی مەسیح عیسای كوڕی مریەمە كەلەدونیاداو لەدواڕۆژدا دیارو خاوەن پلەوپایەیەو لەنزیكەكانی بارەگای خوایە**

وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾ سُورَةُ آلِ عِمْرَانَ

**وە لەلەگەڵ خەڵكیدا دەدوێت لەبێشكەداو لەكامڵی تەمەنیدا وە لەچاكەكارانە**

قَالَتْ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى وَلَدٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِى بَشَرٌ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ
إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾ سُورَةُ آلِ عِمْرَانَ

**مریەم ووتی خوایە چۆن كوڕێكم دەبێت وەهیچ ئادەمیزادێك دەستی بەمن نەكەوتووە ، (نێردراوەكەی خوا وەڵامی دایەوە ) ئا ئاوەهایە خوا ئەوەی وویستی لەسەربێت دروستی دەكات ، ئەگەر بڕیاری جێبەجێ كردنی فەرمانێكیدا جاهەرئەوەندە پێی دەڵێت ببە دەبێت**

وَيُعَلِّمُهُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ سُورَةُ آلِ عِمْرَانَ

**وەفێری تەورات و ئینجیل وزانستی كتێبە ئاسمانیەكان وكاردروستی دەكات**

وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنِّى قَدْ جِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ أَنِّىٓ أَخْلُقُ لَكُم
مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ
وَٱلْأَبْرَصَ وَأُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِ ٱللَّهِ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأْكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِى
بُيُوتِكُمْ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٤٩﴾ سُورَةُ آلِ عِمْرَانَ

**وە نێردراوێكی خوایە بۆبەنی ئیسرائیل پێیان دەڵێت بەدڵنیاییەوە من بەڵگەو نیشانەیەكم لەلایەن پەروەردگارەكەتانەوە بۆتان هێناوە من لەقور لەشێوەی باڵندە بۆئێوە دروستدەكەم جافووی پێدادەكەم جابەفەرمانی خوا دەبێت بەباڵندەو دەفڕێت ، وە كوێری زگماكی وپەڵەی گروێیی چاكدەكەمەوە**

وبەفـەرمانی خـوا مردووەکـان زیندودەکەمـەوە، وە ئـەوەتان پێڕادەگـەینم کـە دەیخۆن و لەماڵەکانتاندا هەڵیدەگرن، بەڕاستی لەوانەدا بەڵگەو نیشانە هەیە بۆ ئێوە ئەگەر ئێوە بڕوادارین

وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ
وَجِئْتُكُم بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ سُورَةُ آلِ عِمۡرَانَ

وە باوەڕم هەیە بەوەی کەلەژێر دەستم دایە لەتەورات ، وە بۆئەوەی بۆتان ڕەوا بکـەم هەنـدێك لەوشـتانەی لێتـان قەدەغـە کـراوە ، وە بەڵگـەو نیشـانەیەکم لـە پەروەردگارتانەوە بۆتان هێناوە جاخوا بپەرستن وگوێڕایەڵی من بن .

وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَـٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم
مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِي
ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ قَالُوا۟ هَـٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾ الصَّفِّ

وە کە عیسای کوڕی مریەم ووتی ئەی بەنی ئیسرائیل من ناردراوێکی خـوام بـۆ ئێوە بـاوەڕم هەیـە بـەوەی کـە لـەژێر دەسـتم دایـە لەتـەورات وە مزگێنـی دەرم بـە نێردراوێکـی تـر کـە لـەدوای مـن دێـت نـاوی ئەحمـەدە جاکاتێـك عیسا بەڵگـەو نیشانەکانی بۆهێنان ووتیان ئەوە جادویەکی ئاشکرایە

وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ
وَلَـٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ
إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا
حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ سُورَةُ النِّسَاءِ

وە ووتـەی ئـەوان کـەدەڵێن ئێمـە مەسـیح عیسـای کـوڕی مریـەممان کوشـت ، وە نەیان کوشت و لەداریشیان نەدا، وە بـەڵام بۆئـەوان کەسێکی ترمـان وەك عیسـا نوانـد ، وەبەڕاسـتی ئەوانـەی کـەجیاوازبوون لـەبیروڕادا لەسـەر لـەداردانی ئـەو لەشك وگوامندان لەبارەی ئەوەوە هیچ زانستیەکیان نیە تـەنها دواکـەوتنی شـك

وگومان نەبێت ، وە بەدڵنیاییەوە نەیان کوشت(١٥٧) بەڵکو خوا بەرزی کردەوە بۆلای خۆی وەخوا خاوەن دەسەڵات وکاردرووستە(١٥٨).

پێغەمبەری مەزنمان عیسا(سڵاوی خوای لێبێت) دەفەرمووێت:( بە دڵنیاییەوە گوێ بیست بوون بەپێشینانی ئێوە ووترا کەداوێن پیسی مەکەن بەڵام ئەمن جا بەئێوە دەڵێم کەهەرکەسێك تەماشای ئافرەتێك بکات بۆئەوەی ئارەزووی لێبکات بەدڵنیاییەوە ئەوە داوێن پیسی پێکرد لەدڵی خۆیدا .جا ئەگەر چاوی ڕاستت لەخشتەت دەبات ، ئەوا دەری بێنە وە لەخۆتی فڕێدە لەبەر ئەوەی بۆتـۆ واچاکترە کە ئەندامێکی لەشت تووشی لەناوچوون بێت نەك هەمووجەستەکەت هەڵدرێتە ناو ئاگرەوە وە ئەگەر دەستی ڕاستت لەخشتەت دەبات ، ئەوا بیبڕەو لەخۆتی فڕێدە لەبەر ئەوەی بۆتۆ واچاکترە کەئەندامێکی لەشت تووشی لەناوچوون بێت نەك هەموو جەستەکەت هەڵبدرێتە ناو ئاگرەوە ). ( متى ص٩ الاصحاح الخامس )

پێغەمبەری مەزنمان عیسا (سڵاوی خوای لێبێت) دەفەرمووێت: کەسێك ناتوانێت لە یەککاتدا خزمەتی دوو گەورە بکات ، لەبەرئەوەی یان یەکێکیان تووڕە دەکات، وئەوی تریانی خۆش دەوێت ، یان لەگەڵ یەکێکیان دەبێت وڕقی لەوەی تریان دەبێتەوە ئێوەناتوانن لەیەککاتداخزمەتی خواومالْ وسامان بکەن بۆیە پێتان دەڵێم گرنگی مەدەن بەژیانتان بەوەی کەدەیخۆن وبەوەی کە دەیخۆنەوە .وە گرنگی مەدەن بە جەستەکانتان بەوەی کە لەبەری دەکەن ئایا ژیان لەخواردن چاکتر نیە وجەستەش باشترنیە لەجل وبەرگ ؟ تەماشای باڵندەکانی ئاسمان بکەن ئەوباڵندانە نەدەچێنن و نەدەدرونەوەو نە کۆدەکەنەوە بۆعەمبارەکان وە باوکە ئاسمانیەکەی ئێوە بژێویان پێدەدات، ئایائێوە بەشیاوی ودروستکراویتان باشترنین لەوان .( متى ص١١ الاصحاح السادس )

أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: سمعْتُ رَسُولَ اللّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ:
«أَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِابْنِ مَرْيَمَ. الأَنْبِيَاءُ أَوْلاَدُ عَلاَّتٍ.ولَيْسَ بَيْنِي وبَيْنَهُ نَبِيٌّ» .
صحيح مسلم بشرح النووي ٦٠٨٠

پێغەمبەر(سلاوی خوای لێبێت)دەیفەرموو:(من نزیکترین کەسم بۆ کوڕی مریەم، پێغەمبەرەکان کوڕانی باوکێکن،وە لەنێوان من وئەودا هیچ پێغەمبەری تر نین ). وواتە پێغەمبەرەکان هەموویان لەڕاسپاردەوکار وفەرمانەکانی سەرشانیان لە لایەن خواوە نێردراون ، کە باوکە گەورە وبەدی هێنەری هەموو بوونەوەرە ، کە هەموو پێغەمبەرەکانی هێناون، کە تیایان دایە لەقوڕ دروستی کردووە وتیایان دایە لە نێرینە ومێینە دروستی کردون و تیایاندایە وە کو پێغەمبەری مەزنمان عیسا (سلاوی خوای لێبێت) بەبێ نێرینە لەمێینە یەکی پیرۆز بەفەرمانی پەروەردگار لەدایك بوو وە هەموو کەس دەزانێت کەعیسا لەناو گەل و نەتەوەی ئیسرائیل لەدایك بوو ، وە محمدیش لەناو هۆزێکی عەرەب لە باوکێك کە ناوی عبداللەیەو لە دایکێك کە ناوی ئامینەیە لەدایك بوو ، کەواتە مەبەستی پێغەمبەر لەوەی کەپێغەمبەرەکان کوڕانی باوکێکن ئەوە دەگەیەنێت کەهەموو پێغەمبەرەکان سەربەخاوەنی یەك بەرنامەو یەك بڕیارن کەئەویش پەروەردگارەو ناوی ( الله ) یە

أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ
وَمِمَّنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٥٨﴾ مريم

ئەوانە ئەو پێغەمبەرانەن کەخوا نازو نیعمەتی خۆی بەسەردا بەخشیون لە نەوەکانی ئادەم ولەوانەی کەلەگەڵ نوح هەڵمانگرتن ولەنەوەکانی ئیبراهیم بەم شێوەیە خولانەوەی کاتژمێری بوونەوەر بەردەوام بوو تالەدوای عیسای کوڕی مریەم ( سەلامی خوا لەسەر هەردوکیان ) لەنەوەکانی ئیسماعیلی کوڕی

ئیبراهیم له ناوهۆزی قورەیش لەبەرەبابی هاشم ، دوا پێغەمبەر بەختەنەکراوی له دایك بوو لەساڵی (٥٧٠ ) زاینیدا

عن واثلة بن الأسقع أن النبي صلى الله عليه وسلم قال «إن الله عزّ وجلّ اصطفى من ولد إبراهيم إسماعيل واصطفى من بني إسماعيل كنانة واصطفى من بني كنانة قريشاً واصطفى من قريش بني هاشم واصطفاني من بني هاشم». مسند الإمام أحمد ١٦٥٩٤

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( خوای گەورە لەرۆڵەکانی ئیبراهیم ئیسماعیلی پاککردەوە وە لەنەوەکانی ئیسماعیل بەنی کەنانەی پاککردەوە وە لەبەنی کەنانە قورەیشی پاککردەوە وە لەقورەیش بەنی هاشمی پاککردەوە وەلەبەنی هاشم منی پاککردەوە )

پەیامەکەی ئەو پێغەمبەرە تەواو کەری پەیامی پێغەمبەرەرکانی پێش خۆیەتی بۆیە لەپەیامەکەی محمددا هەرکەسێك باوەری بەهەموو پێغەمبەرەکان وکتێب و پەیامەکانیان نەبێت ئەو کەسە باوەرەکەی ناتەواوە

ئەم پێغەمبەرە وەکو عیسای پیرۆز باسی لێوەکرد لەدونیای نادیاردا ناوی ئەحمەد بوو وەکاتێك لەناو هۆزێکی عەرەب لەدایك بوو خێزانەکەی ناوی محمد یان پێبەخشی وەکاتێکیش کەگەورەبوو لەبەر راستگۆیی لەناوخەڵکیدا نازناوی (الأمین) واتە ( دەست پاك ) ی پێبەخشرا وەکاتێکیش کەپەیامی پێغەمبەرایەتی بۆهات خوا بەمستەفا ناوی برد

له کاتێکدا کەشاری مەکە بەگەشەیەکی ئابووریدا تێدەپەری و ببوو بەمەنزڵی ئەو کاروانانەی کەبەزستانان وهاوینان لەهاتووچۆدابوون لەباکورەوە بۆ باشورو بەپێچەوانەشەوە ، عەرەبەکان کەوتنە رێکخستنەوەی کەعبەوچاك کردنەوەی دیوارەکانی ودانانەوەی بەردە رەشەکە لەجێگەی خۆی عەرەبەکان هیچ کێشەیەکیان نەبوو تاگەیشتنە سەر دانانەوەی بەردەکە لەشوێنی خۆی ،

لەوێدا ململانێ دەستی پێکرد بۆئەوەی هەریەکێك لەوان ببێت بەخاوەنی ئەم شەرەفە وناوی خۆی لەمێژوودا تۆماربکات بەوەی کەبەردەکەی لەجێگەی خۆی داناوەتەوە ، بەلاّم لەبەرئەوەی کەسیان شارەزاییان نەبوو کەبەردەکە لەکوێ دادەندرێت بۆیە هەموویان ڕێککەوتن لەسەر ئەوەی کەڕازین بەبڕیارو بۆچوونی ئەو کەسەی کە لەم دەروازەیەوە دەردەکەوێت   یەکەم کەس کە لەدەروازەکەوە دەرکەوت محمد بوو هەموو عەرەبەکان بەخۆشحاڵیەوە ڕازی بوون بە بڕیارەکانی محمد لەبەرئەوەی کەدەیانزانی ڕاستگۆیەو بەویژدانەوە بڕیارەکان دەدات وکەس بێبەش نابێت   هاتنی محمد لەوکاتەداو چارەسەرکردنی کێشەکە بەوشێوەیە کەهەموولایەك ڕازی بوون وبەردەکەش لەشوێنی مەبەست دانرایەوە   لێرەدا چەند پرسیارێك دەورژێندرێن ئەوانیش :- ئایا عەرەبەکان ڕازی دەبوون بەکەسێك ناوبژییان بکات ئەگەر نەرم کاریەك نەبوایە لەلایەن پەروەردگارەوە ؟ بەتایبەتی لەسەردەمێکی وادا کەقورئان وعەرەبەکانیش ناوی دەبەن بەسەردەمی نەزانی، کەناڕێکی وناتەبایی هەبوو لەنێوان عەرەبەکانداو یەکتریان تالاّندەکردو کچەکانیان زیندە بەچاڵدەکرد   ئایا ئەگەر محمد نەبوایە کەسی تر هەبوو کەدەستنیشانی شوێنی ڕاستەقینەی بەردەکەی کردبا ؟ ئایا هاتنی محمد لەوکاتەدا بەڕێکەوت بوو یان      ؟ ئایا هێنانی ئەم بەردە لە بەهەشتەوەو دانانی لەم شوێنەیدا مەبەستێکی تێدانیە ؟ خوێنەری بەڕێز بەویژدانەوە بۆخۆت خاوەنی وەلاّمی ئەم پرسیارانەی

وەکو لەپێشەوە ڕوونمان کردەوە ئەم بەردەڕەشە لەبەهەشتەوە لەگەڵ ئادەم و حەواو شتەکانی تردا ناردراوەتە خوارەوە

ناردنە خوارەوەی ئەم بەردە تەواوکارییە بۆهەموو پێداویستیەکانی بەردەوام بوونی ژیان بۆئادەم ونەوەکانی   ژیان لەسەرزەوی نەمری نیە ، لەدایك بوون ومردنی تێدایە   کەواتە ژیان پابەندە بەکاتەوە بۆدیاری کردنی سەرەتاوکۆتایی شتەکان

ئینجا بۆدیاری کردنی کاتی شوێنەکان پێویستیمان بەخاڵێکی دیاریکراو هەیە کە کات تێیدا نەبوو بێت واتە (سفر) بێت ......

ئەم بەردەڕەشە لەپێکهاتەکانی بەهەشت درووستکراوە . وەلە بەهەشتدا ژیان نەمرییە ، کەواتە لەبەهەشتدا ژیان پابەندنیە بەکاتەوە چونکە نەلەدایك بوون هەیە نەمردن ، کەواتە لەپێکهاتەکانی بەهەشتدا کات نیە واتە کات (سفرە) لەسەریان

کەواتە بەپلەی یەکەم لەبەر ئەم هۆیەیە کە ئەم بەردە لەبەهەشتەوە ناردراوەتە خوارەوە بۆ دیاریکردنی ڕۆژهەڵات وڕۆژ ئاوای گۆی زەوی ، بەپلەی دووەمیش پیرۆزی بەردەکەیە کەلەشوێنێکەوە هێندراوە هەموو مرۆڤ هەوڵی بۆدەدات و ئومێدەوارە بیگاتێ وخاڵێکی دیاریکراویشە بۆ سوڕانەوەکانی دەوری کەعبە کەواتە دەبێت شوێنی هێڵی (سفری) درێژی گۆی زەوی بەسەر ئەم بەردەدا بڕوات لەم سەردەمەی ئێستاماندا ئەم هێڵی (سفرە) بەنزیك شاری (لندن ) ی پایتەختی شانیشینی بەریتانیادا تێدەپەڕێت لەبەر چەندهۆیەکی ڕامیاری و ئابووری و سەربازی و ......هتد

خوای گەورە لەقورئاندا باسی چیرۆکی موسامان بۆدەکات کەدوای ئەوەی لە فەلەستینەوە گەڕایەوە بۆ مصر لەشەوێکی سەختی باراناویدا تروسکایی ئاگرێکی بینی لەشاخەکەی بەرامبەریان ، کاتێ موسا هات بۆلای تروسکاییەکە لەپڕ لەژێر دارێکی پیرۆزەوە دەنگێك بانگی موسای کرد

فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٠﴾ سُورَةُ القَصَصِ

جا کەهاتەلای ئاگرەکە لەکەناری لای ڕاستی دۆڵەکەوە لەپەڵەیەکی پیرۆز لەدارەکەوە بانگی لێوەکرا کە ئەی موسا ئەوەمنم من خوام پەروەردگاری جیهانیان .

وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيًّا ﴿٥٢﴾ مَرْيَمَ

وه بانگمان کرد لەلای ڕاستی چیای طورەوەونزیکمان کردەوەولەگەڵی دواین
کەواتە ئەوڕووناکییەی کەموسا بینی ڕەوشەنی ڕووناکی خوابوو لەدارێکی
پیرۆزەوە بەدەرکەوت لەکەناری ڕاستی دۆڵەکەوە
کەواتە ئەم دارە کە لەم شوێنە پیرۆزەدا ڕەوشەنی ڕووناکیەکەی پەروەردگاری
لێوە بەدەرکەوت هەرهەمان دارە کەخوا لەباسی ڕەووشەنی ڕووناکیەکەی
خۆیدا باسی دەکات و دەفەرمووێت :
﴿ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لەلاپەڕە ( ١٣ ) ڕونمانکردەوە ﴾
کەواتە شوێنی ئەودارەی کەموسا ڕەوشەنەکەی خوای تیادابینی شوێنی هەمان
دارزەیتونە کەخوا لەباسی ڕەوشەنەکەی خۆیدا شوێنەکەی دیاریکردووە بەوەی
کەنەڕۆژهەلآتیەو نەڕۆژئاوایی کەواتە ئەو شوێنەی کەموسا ڕەوشەنی خوای
تیادا بینی نەڕۆژهەلآتەو نەڕۆژئاوا لەهەمان هێڵی ئەوناوچەیەوە نزیکە کە
بەردەکەی بەهەشتی لێیە کەکات لەسەریدا سفرە
وەکولە پێشەوە ڕوونمان کردەوە بەداخەوە موسوڵمانەکان و کۆمەڵگا ئاینیە
ئاسمانیەکان تائێستا بێئاگان لەوەی کەشەو مانای ئەوکاتە دەگەیەنێت
کەلەسەرەتای تاریکی ڕۆژێکەوە دەست پێدەکات بۆسەرەتای ڕووناکی ڕۆژی
داهاتوو کەواتە لەسەر چ بنەمایەك شەو لەتکراوە لەکات ژمێری( ١٢) نیوەی
یەکەمی بۆڕۆژی ڕابردووە وە نیوەی دووەمیشی بۆسەرەتای ڕۆژی داهاتووە
ئایا چۆن دەبێت ڕۆژێك دوو لەتە شەوی هەبێت یەکێکیان لەپێشیەوەو
یەکێکیان لەپاشیەوە ، ئایا سەرەتا خوا نەیفەرمووکە ئاسمانەکان وزەوی لە
شەش ڕۆژدا دروستکرد ، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ڕۆژ تەواو دەبێت و شەوی
بەدوادا دێت کەمایەی پشودانە
ئەم هەولآنە هەموویان بۆ ئەوەبوون کەئەم خاڵی سفرەی هەلآتنی خۆر لەسەر
گۆی زەوی بگوازرێتەوە لەشاری مەککەوە بۆ ( لندن ) ی پایتەختی
ئیمبراتۆریەتی بەریتانیای عظمی




اطلس العالم / دار الشرق العربي للطباعة والنشر والتوزيع ص ٣٤

خوێنەری بەڕێز لەم نەخشەیەدا سەیری شوێنی تێپەڕبوونی هێڵی ( سفر ) و هێڵی ( ٤٠ )ی درێژی گۆی زەوی بکە وشوێنی مەککە و شوێنی لەندەن دیاری بکە دەبینیت لندن کەلەویەری ڕۆژ ئاوادایە کەوتۆتە سەر هێڵی سفری گۆی زەوی‌یەوەو هەموو کاتەکان لەوێوە دەست پێدەکەن و ئەگەر بتەوێت کاتی مەککە بدۆزیتەوە دەبێت (٣) سێ کاتژمێر لەکاتی لەندن بەرەوپێش برۆیت بۆ نمونە کاتژمێر (١٠)ی پێش نیوەڕۆ بەکاتی لەندەن کاتژمێر ( ١ ) یەکی دوای نیوەڕۆ بەکاتی مەککە نیشان دەدات (اطلس العالم مكتبة لبنان ص٣ ).

خوێنەری بەڕێز زۆر پێویستە سەردانێکی ئەو (اطلس العالم ل ٣) بکەیت و وردەکاریەکان بەچاوی خۆت ببینیت و بۆت ڕوون ببێتەوە کەشاری مەککەو

دەوروبەری چۆن کاتەکەیان جێگیرە لەچاو دەوروبەرەکەی خۆیاندا لەکاتێکدا کەپشت بەکاتی غرینیتش ببەسترێت ، لەهەمان کاتکدا کەهەموو ناوچەکانی تری نیوەدورگەی عەرەب وخۆرهەلأت وباکوری خۆرهەلأتەکەی پشت بە جیاوازی کاتی ناوچەکەوە دەبەستن لەسەر بناغەی جیاوازی نیو سەعات ، یان لەسەر بناغەی کاتی ناوخۆ

گومانیش لەوەدا نیە کەلەندەن لەبەشی ڕۆژئاوای گۆی زەویە ومەککە لە ناوچەیەکدایە لەسەر گۆی زەوی پێی دەگوترێت ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست ، واتە ناوەڕاستی ڕۆژهەلأت وڕۆژئاوا ، ئەی کەواتە لەسەر چ بنەمایەك ئەم هێڵە لە سەر بەردە ڕەشەکەوە گوێزرایەوە بۆسەر کاتژمێری بیگ بەن

ئەم پێغەمبەرە یەکەم پەیام کەبۆی هات لەلایەن پەروەردگارەوە فەرمانێك بوو

ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ ۞ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ۞ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ۞ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ ۞ عَلَّمَ ٱلْإِنسَـٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ۞ سُورَةُ العَلَق

بخوێنە بە ناوی پەروەردگارت ئەو پەروەردگارەی کەهەموو شتێکی دروست کردووە(١) ئەو پەروەردگارەی کە ئادەمیزادی دروست کردووە لەپارچە خوێنێکی مەیو(٢) بخوێنە، وە پەروەردگارەکەی تۆ بەخشەرترە لەهەموو کەس(٣) ئەو پەروەردگارەی کە ئادەمیزادی فێری زانست و نووسین کرد بە پێنووس(٤) ئادەمیزادی فێرکردو ئاگاداری کرد بەوەی کەنەیدەزانی(٥).

بەرنامەیەکی خوا لەئاسمانەوە بۆسەرزەوی لەیەکەم سەرەتایەوە داوا لە نێردراوەکەی دەکات کەبەزانست دەست بەبەرنامەکانت بکە، ئەو بەرنامەو کتێبەی کەئێمە بۆتی دەنێرین هەموویان زانستین، جا بۆیە ئەم قورئانە بۆئەوە نەهاتووە کەلەسەر دۆلأبە بەرزەکانی ماڵەکان تۆزی لێبنیشێت یان لەکاتی منداڵ بووندا لەلای کۆرپەکەوە دابندرێت ، لەم کتێبەدا هەموو شتێك ڕوون کراوەتەوە دەربارەی کاروباری ڕامیاری و ئابووری و مێژوو جوگرافیا و زەوی ناسی و زانستەکانی کیمیا و فیزیاو فەلەك و زانیاری قولأیی دەریاکان و

بۆماوەزانی و گیانەوەرزانی و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و یاسا بنەڕەتیەکانی ئیدارەی دەوڵەت لەبەڕێوە بردن و باج و سوپا و مافی تاك و کۆمەڵ و ئەدەبیاتی گەلانی ڕابردوو ......هتد جابۆیە لێرەدا کەمێك لەم بارەیەوە دەدوێین و بەڵگەو نیشانەکان دەهێنینەوە :-

أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَآءً وَأَمْوَٰتًا ﴿٢٦﴾ المرسلات

ئایا ئێمە وامان نەکردووە کە زەوی ڕاکێشەر بێت(٢٥) بۆ تەنە مردووەکان وە بۆ تەنە زیندووەکان(٢٦). ( الصحاح / كفت / ص ٥٧٣ )

واتە ئایا ئێمە زەویمان والێنەکردووە کەتەنە زیندووەکان و تەنە مردووەکان بۆ لای خۆی ڕاکێشێت ؟ ئەم یاسایە لەزانستەکانی فیزیادا ناسراوە بەیاسای نیوتن یان یاسای کێش کردنی زەوی ، کەگرنگیەکی یەجگار زۆری هەیە لە بوارە جیاجیاکاندا

لە بارەی کشتوکاڵەوە پێمان ڕادەگەیەنێت

قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدتُّمْ فَذَرُوهُ فِى سُنۢبُلِهِۦٓ
إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّا تَأْكُلُونَ ﴿٤٧﴾ سورة يوسف

یوسف ووتی بە بەردەوامی حەوت ساڵ ( دانەوێڵە ) دەچێنن جائەوەی کە دروتانەوە لە گوڵەگەنمەکەی خۆیدا بیهێڵنەوە تەنها کەمێك نەبێت لەوەی کە لێی دەخۆن

کە لەبەروبومی دانەوێڵەدا ئەوەی کەبۆهەڵگرتن وعەمبارکردن دادەنرێت با لەگوڵەکەی خۆیاندا بمێنێتەوە ، بۆئەوەی هیچ مێشوولەو کرم و ئەسپێ یەك نەتوانێت لێیان نزیك بکەوێتەوە  ئەوەی بۆکاتێکی کەم بەدوای ( دەڕاسە ) ماشێنی درونەوەی گەنمدا بڕوات دەزانێت تووشی چ دەردێك دەبێت لە ئەنجامی هەڵمژینی تەپ و تۆزی ئەم دانەوێڵە درواوەیە کەپڕە لەچەندین پێکهاتەی کیمیائی بۆپاراستنی دەنکی دانەکان

لە بارەی زانستەکانی کیمیاوە دەربارەی چڕی ( الكثافه ) پێمان ڕادەگەیەنێت

مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ سُورَةُ الرَّحْمَٰنِ
شوێنی تێکەڵ بوونی دوو دەریا کە بەیەکتری دەگەن ( ١٩ ) لە نێوانیاندا بەربەستێك هەیە ناهێڵێت تێکەڵ بەیەکتر بن ( ٢٠ )
يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ سُورَةُ الرَّحْمَٰنِ
لەو دوو دەریایەدا لوءلوء و مەرجان دەردەهێندرێت
واتە ئەی ئادەمیزاد دەتوانیت لەکارگەکانی دونیای ژێر ئاوی شیرن وسوێردا بەرهەمەکانی لوءلوء و مەرجان دەربێنیت و بۆجوانکاری بەکاریان بهێنیت و لە پێکهاتەکانیان بکۆڵیتەوە  دوو دەریا ئاوەکانیان تێکەڵ بەیەکتری نابن دەبێت هۆی چی بێت ؟ دوو پێکهاتە ئەگەر چڕیەکانیان جیابێت تێکەڵ بەیەکتری نابن؟ نەوت سەر ئاو دەکەوێت لەبەرئەوەی چڕی ئاو زیاترە ، کەواتە هۆی تێکەڵ نەبوونی ئەم دووئاوە چڕیەکەیانە کەیەکێکیان سوێرە و یەکێکیان شیرینە ئینجا توێژینەوە لەسەر لوءلوء ومەرجانی هەردووك ئاوەکەش بکەن وبزانن کامەیان چاکتر وجوانتر وبەهێزترن !
وەدەربارەی ئەو زانستیەی کەمرۆڤ هەتائێستا نەیگەیشتۆتێ دەفەرمووێت
وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُوا۟ بَقَرَةً ﴿٦٧﴾ سُورَةُ البَقَرَةِ
وە کە موسا بەگەل و نەتەوەکەی خۆی گووت : بەڕاستی خوا فەرمانتان پێدەکات کەمانگایەك سەربڕن
کەسێك خزمێکی خۆی کوشت و داوای لەپێغەمبەری مەزنمان موسا کرد (سەلامی خوای لێ بێت )  کەپیاو کوژەکەی بۆئاشکرا بکات پەروەردگاریش فەرمانی پێکردن بەوەی مانگایەك سەربڕن و گۆشتەکەی لەگۆشتی مردووەکە بدەن ئەوا گیانی بەبەردا دێتەوەو پێتان ڕادەگەیەنێت کەکێ کوشتویەتی
( تفسير ابن كثير ٦٧ البقرة )
گۆشتی مانگایەك لەگۆشتی مردوویەك بدرێت ، مردووەکە بێتە قسەکردن و وەڵامی پرسیارەکانت بداتەوە .ئایادەبێت ئەم زانستەچی بێت ؟ مانگاکە دەبێت چ جۆرێك بێت ؟خوێنەری بەڕێز ئەم باسە لەسوورەتی (البقرە) باسکراوە

دەربارەی تونای ئادەمیزاد بۆچوونە دەرەوە لەسنوری ئاسمانەکان و زەویدا پێمان ڕادەگەیەنێت

يَـٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَـٰنٖ ﴿٣٣﴾ سُورَةُ الرَّحۡمَٰن

ئەی کۆمەڵەی جندوکەو ئادەمیزادەکان ئەگەر لەتواناتاندا هەبوو لەسنوری ئاسمانەکان و زەوی بچنەدەرەوە ، ئەوا لەوسنورە بچنە دەرەوە ، ناشتوانن لەو سنورە بچنە دەرەوە مەگەر بەهێزودەسەلأتێکی فراوان

کەواتە بۆچوونە دەرەوە لەسنوری ئاسمانەکان وزەوی پێویستیمان بەهێزو توانایەکی زۆرگەورە هەیە بۆئەوەی لەوسنورە بمانباتە دەرەوە وەکو هێزی ناوکەئەتۆم

دەربارەی مێژووی گەلانی ڕابردوو پەروەردگار بەبەکارهێنانی ئەوپەڕی وردەکاری وجوانکاری دەفەرموویێت

غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ﴿٣﴾ الرُّوم

ڕۆمەکان دۆڕان(٢) لە نزمترین شوێن لەسەر زەوی ، وە ئەوان لەدوای ئەو دۆڕانەیان ( لە شەڕێکی تریان ) لەداهاتوودا دەیبەنەوە(٣). لە پەیوەندیە کۆمەلأیەتیەکاندا دەفەرموویێت :

إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِ ﴿٥٨﴾ النِّسَاء

خوا فەرمانتان پێدەکات بەوەی کە ئەمانەتەکان بدەنەوە بەخاوەنەکانیان وەکاتێک کەدادوەریتان لەنێوانی خەڵکیداکرد بەڕاست و دروستی دادوەری بکەن لەنێوانیاندا

دەربارەی سزای تاوانباران

عَنِ النَّبِي صلى الله عليه وسلم قَالَ:

( قَتِيلُ الْخَطَأِ شِبْهِ الْعَمْدِ بِالسَّوْطِ أَوِ الْعَصَا مِائَةٌ مِنَ الإبِلِ أَرْبَعُونَ مِنْهَا فِي بُطُونِهَا أَوْلاَدُهَا ) . السندي في شرح سنن النسائي ٨ ٧ ٨ ٤ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی**

**كوژراوێك بەهەڵە وەكو ئەوەی بەنیمچە ئەنقەست كوژرابێت بەقامچی یان بە گۆچان ، خوێنەكەی سەدوحوشترە ، چل لەوحوشترانە دەبێت ئاوس بن**

**ئایا ئەمە مادەیەك نیە لەقانونێك بۆسزادان ( العقوبات ) بۆئەوەی كەهیچ ئادەمیزادێك هەوڵی كوشتنی كەسێكی تر نەدات هەتا بەئەنقەستیش .ئینجا ئەگەر دەشتەوێت شارەزای یەكی تەواو لەیاساكانی ناو قورئان پەیدا بكەیت ئەوا بەچاوی عەقڵەوە نوسراوەكانی جەعفەری صادق و شافعی و ئەحمەدی و حەنەفی ومالكی بخوێنەوە هەموویان بەیەك زمان دەدووێن كەئەگەر ددانێكیان شكاندی بۆت هەیە ددانێكیان بشكێنیەوە و زیاتر نا**

**لە دەربارەی درووستكردنی جۆری خانووبەرەكان و كارگەكانەوەو لەبارەی زانستەكانی گیانەوەرزانیەوە دەفەرمووێت**

أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلْإِبِلِ كَيْفَ خُلِقَتْ ﴿١٧﴾ الغاشية

**ئایا تەماشای حوشتر ناكەن چۆن دروستكراوە**

**( الابل ) مێیەی حوشترە كەواتە دەبێت جیاوازییەك هەبێت لەپێكهاتەی جەستەی نێرە ومێیەكەیدا .هەموو بەشەكانی هەندەسە لەم ئایەتەدا دەردەكەوێت   ئەگەر دەتانەوێت خانویەك لەسەر پایە دروست بكەن تەماشای پێیەكاتی حوشترو قاچەكانی بكەن پانی پێیەكانی پانی بنەپایەكان دەردەبڕێت بۆ ئەوەی بەخاكدا نەچنە خوارێ ، وە ئێسكەكانی نێو پێیەكان ڕێژەی شیشەكان، وە گۆشتی پێیەكان ڕێژەی كۆنكریتەكەی نیشان دەدەن، وە باریكی قاچەكان ئەستوری پایەكان دیاری دەكەن، وە پشتەكەی سەربانی خانووەكە**

دیاری دەکات، جا چ بەشێوەی گومبەت بەگەچ وشێلمان، یان وەکو سەربانێك بە چیمەنتۆو شیش ، گرنگ ئەوەیە لەسەربانی نێوان چوار پایەکاندا شیشەکە وەك ئێسکەکان لەبەشی ژێرەوەو کۆنکرێتەکەش وەك گۆشتەکە لە بەشی سەرەوەی ئەستوری سەربانەکەدابێت ملی حوشترەکە تارمەکەیەتی دەرچووە تەنها لەسەرێکەوە بەسەربانەکەوە بەستراوەتەوە ،وە سەرەکەی تری بەرەڵایە کەواتە دەبێت بۆڕاگرتنی ئەم بەشە دەرچووە شیشەکان وەکو ئێسکەکان بچنە بەشی سەرەوەی ئەستوری تارمەکە وە ئەو گوێسە بانانەش کەبەدەوری خانوەکەدا دروستدەکرێن ئەگەر شیشەیان تێدا نەبێت لەکلکی حوشترەکە زیاتر جیانابنەوە لەبەرئەوەی ئەویش ئێسکی تێدانیە وە دڵنیام لەوەی کە ئەندازیارانی بیناسازی و میکانیکی دەتوانن دوکانێك لەشێوەی حوشتردا دروست بکەن و بتوانن لەشوێنی خۆی بیجوڵێنن و توانای بەرزکردنەوە و نزم کردنەوەیشی هەبێت بێجگە لەمەش کەڵك لەجەستەی حوشتری مێینە وەردەگیرێت بۆ دروستکردنی کارگەی شیر لەگیاکان .کەسێك بەووردی و بەویژدانەوە لەئایەتەکانی دوای ئەم ئایەتە بکۆڵێتەوە بۆی ڕوون دەبێتەوەکە ئەم ئایەتانە هەموویان ئایەتی( ئینشائاتن )

وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ رُفِعَتْ ﴿١٨﴾ الغَاشِيَة

ئایا تەماشای ئاسمان ناکەن چۆن بەرز کراوەتەوە

واتە ئاسمان بەرزکراوەتەوە بەرز بوونەوەی شتێك بەسەر شتێکی تردا بەبێ بوونی ڕاگرێك، واتە شتە بەرزبووەوەکە چڕی یەکەی کەمترە بۆیە کەوتۆتە سەرو ئەو توخمەوە کەچڕیەکەی لەوزیاترە ، بۆنمونە نەوت سەر ئاو دەکەوێت لەبەرئەوەی چڕی ئاو زیاترە لەنەوت ، وە گازی ئۆزۆن لەچینە بەرزەکانی هەوادایە لەبەر ئەوەی چڕیەکەی کەمترە لەچاو توخمە گازیەکانی ژێرخۆیەوە

ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ ...... ﴿١١﴾ فُصِّلَت کاتێك کە ئاسمان لە دوکەڵ و گازەکان پێکهاتبێت کەواتە دەبێت چڕی ئەم دوکەڵ و گازانە کەمترین لەو

گازانەی کەدەوری زەویانداوە بۆیە بەرزبوونەوە بۆسەرەوە  ئەمانە هەموو زانستی کیمیان ، قورئان پەنجەی بۆدرێژکردون پێویستە ئێمەش بەدوایاندا بچین و زیاتر شارەزاییان لێپەیدا بکەین

وە لەبارە ئابووریەکاندا پێمان ڕادەگەیەنێت کە

وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ الإسراء

وە مافی تەواوی خزمەکان وهەژارو ڕێبوارەکان بدە ، ودەست بلاوی مەکە بەشێوەیەکی وەها هیچت بەدەستەوە نەمێنێ

إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓا۟ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَـٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَـٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾ الإسراء

بەڕاستی دەست بلاوەکان برای شەیتان بوون و شەیتانیش بۆ پەروەردگاری خۆی بێباوەڕ بوو

وواتە لە باری ئابووری یەوە ئاگات لەسامان و سەروەتەکەی خۆت بێت و بەولاو ئەولایدا مەدە ئەوانەش کەوادەکەن برای شەیتان و شەیتانیش بۆ پەروەردگاری خۆی بێباوەڕ بوو ، ئینجا ئاگاشت لەخزم و کەسوکارو خەڵکی هەژارو ڕێبواریش بێت

وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ ٱلْبَسْطِ
فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾ الإسراء

وە دەستت وا لێمەکە داخراوبێت هەتا بنبینی قورگت ، نەئەوەندەش بیکەیەوە هەموو کردنەوەیەك ، کەوات لێبکات بەداماوی و لۆمەکراوی و تەنگ پێهەڵچنراوی دانیشی وبمێنیەوە

لەسەردەمانێکدا لەکاتەکانی تەنگانەو گرانیدا زۆرجار کارەساتی دڵتەزێنی وەها ڕوودەدات کە لەبەر نەبوونی و دەستکورتی دایك وباوك کۆرپەکانی خۆیان دەکوژن، جا پەروەردگار ڕوویان تێدەکات و دەفەرموێت

وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَـٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ
إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ الإسراء

وە منداڵەکانتان مەکوژن لەترسی هەژاری، ئێمە بژێویان پێدەدەین، وە نەکەن وابکەن بەڕاستی کوشتنی ئەوان هەڵەیەکی گەورەیە

واتە خراپی باری ئابووریتان نەبێتە هۆی ئەوەی کەمنداڵەکانتان بکوژن

وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ سُورَةُ الإِسۡرَاءِ

وە نزیکی داوێن پیسی مەکەونەوە بەڕاستی ئەمکارە کارێکی ناشیرین و ڕێبازێکی خراپە

واتە هەر لەیاسا بنەڕەتیەکانەوە داوێن پیسی لەلایەن پەروەردگارەوە بەکارێکی خراپ و ناشیرین لە قەڵەمدراوە ئایا هیچ خاوەن غیرەتێك پێی خۆشە داوێن پیسی لەگەڵ کەس وکاری ئەودا بکرێت ؟

وە مزگێنی یەك بەتێکڕای مرۆڤایەتی ڕادەگەیەنێت و دەڵێت

ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ

لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ﴿٣﴾ سُورَةُ النُّورِ

پیاوی داوێن پیس مارەیی ژنێك نابڕێت بۆخۆی مەگەر ئەوژنە داوێن پیس بێت، یان بێباوەڕبێت بەخوا وە ئافرەتی داوێن پیس، یان بێباوەڕ شووناکات بە پیاوێك، مەگەر ئەوپیاوە داوێن پیس بێت یان بێباوەڕبێت

جا دڵنیابە ئەمە فەرموودەی خوایە قسەی ناوبازاڕ نیە وە لەدەرگای ماڵی کەس مەدە بۆئەوەی کەسیش لەدەرگای ماڵەکەت نەدات ئینجا لەبەرئەوەی کەداوێن پیسی دەردێکی کوشندەی ناوکۆمەڵە ، تا زیاتر باسی لێوەبکرێت زۆرتر تەشەنە دەکات ، بۆیە بەیاسایەك پەروەردگار باسکردنی ئەم کردەوەیە سنوردار دەکات و دەفەرمووێت

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ سُورَةُ النُّورِ

ئەوانەی وادەخوازن کەداوێن پیسی بلاو ببێتەوە لەناو باوەڕدارەکاندا ئەوا سزاو ئازارێکی سەخت بۆ ئەوان هەیە لەدونیاو دواڕۆژدا ، خوادەزانێت و ئێوە نازانن .( ئەم کارە چەند ناشیرینەو ئەوانە چ مەبەستێکیان هەیە ، ئێوە نازانن من هەرخۆم دەزانم چۆن سزایاندەدەم )

وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤﴾ سُورَةُ النُّور

وە ئەو کەسانەی کە ئافرەتە پاکەکان لەکەداردەکەن ، جا چوار شاهید ناهێنن ( بۆ ڕاستی ڕووداوەکە ) ئەوا ئەوانە دارکاری بکەن بەلێدانی هەشتا شوارك ، وە بۆهەتاهەتایی شاهیدیان لێقبولْ مەکەن وە بەڕاستی ئەوانە لادەرن لەسەر بەرنامەی پەروەردگار

لەهەموو یاساکاندا دووشاهید داندراوە بۆشاهیدیدان لەسەر کێشەیەك، بەلام بۆ کاری داوێن پیسی چوار شاهید داندراوە ، خوا مەبەستیەتی باس لەم کێشەیەوە نەکرێت بۆیە بەخاوەن باوەڕەکان دەڵێت ئەگەر کارێکی وەها ناشیرنتان بینی ئەوا ئەگەر توانیتان چوار شاهید پەیدابکەن کێشەکە ئاشکرا بکەن ، وە ئەگەر نەتانتوانی چوار شاهید پەیدا بکەن وهەواڵەکەتان بلاوکردەوە ئەوا سزاکە لەئێوە وەردەگیرێت جاخوێنەری بەڕێز سەیرکە تا تۆ فریای ئەوە دەکەویت چوار شاهید پەیدا بکەیت ڕووداوەکە ببینن ئەوا ئەوان کاری خۆیان تەواوکردووە ، ئەم دەردە ئەوەندە خێرا بلاودەبێتەوە لەڕێی تەماشاکردن و بیستن و بیر لێکردنەوەیەوە ئادەمیزاد توش دەکات ، بۆیە پەروەردگار داوادەکات ئەگەر چوار شاهیدتان پێ ئامادەنەکرا ئەوا کێشەکە داپۆشن و بێدەنگی لێبکەن و بۆمنیان لێبگەڕێن جاچاوتان لێبێت لەڕۆژی دواییدا چیان پێدەکەم و چۆن تۆڵەیا لێوەردەگرمەوە

لە یاسای سزاداندا لەسزادانی دزەکاندا دەفەرموویت :

وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٣٨﴾ المَائِدَة

وه دزکەری پیاو ودزکەری ژن دەستیان ببڕن وەکو پەندێك لەلایەن خواوە ، سزای ئەوەی کە بەدەستیانکەوتووە ، وە خوا ئەوخاوەن دەسەلاٌتەیە کەکەس دەسەلاٌتی بەسەردا ناشکێت وکاردرووستە

ووردەکاریەکانی یاسای دەستبڕین زۆرن ، بەپێی ئەندازەی ماڵە دزراوەکەو باری ژیانی دزەکەو ئەندازەی بڕینی دەستەکە ، ( ئینجا خوێنەری بەڕێز ئەگەر مەبەستتە لەیاساکانی شەریعەتی ئیسلامیدا دەست دەکەون )

ئایا دەبێت چ کەم وکوڕییەك لەم یاسایەدا هەبێت کەماڵ وسامان وسەروەتی هاوولاٌتیانی تێدا پارێزراوە من ئەگەر نیازی دزی کردنم نەبێت بۆچی لۆمەو تانە لەیاسایەکی ئاوەها بەهێز دەدەم و لێیدەترسێم !؟

ئەمە بڕیارەکەیە ئینجا ئەگەر دزەکە پێش ئەوەی ئاشکرا ببێت و بگیرێت پەشیمان بێتەوە ئەوا پەروەردگار دەفەرمووێت

فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾ المَائِدَة

جا کەسێك کەتۆبەی کرد لەدوای ئەوستەمەی کەکردویەتی وخۆی ڕاست و چاککردەوە ئەوا خوا لێیخۆش دەبێ بەڕاستی خوا لێبووردەو بەبەزەییە

وە دەربارەی زانستەکانی فیزیاو ماتماتیك دەفەرمووێت

هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلشَّمۡسَ ضِيَآءٗ وَٱلۡقَمَرَ نُورٗا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعۡلَمُواْ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلۡحِسَابَۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۚ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٥﴾ يُونُس

ئەو خوایەیە کە خۆری والێکردووە ڕووناك و تیشکدەر بێت، و مانگی والێکردووە کەڕەوشەندار بێت، وە ئەندازەی گرتووە بەپێگەکان بۆئەوەی کە فێرو شارەزابن لەژمارەی ساڵەکان وژمێریاری ، خوا ئەوەی دروست نەکردووە مەگەر بەشێوەیەکی ڕاست ودروست نەبێت ، خوا بەدرێژی بەڵگە و نیشانەکانی ڕووندەکاتەوە بۆنەتەوەیەك کەبەوباسە دەزانن

وه بۆچارەسەری و پتەوکردنەوەی بیروهۆش دەفەرموویّت

وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٥﴾ الكهف

وەیادی خوای خۆت بکەوە ئەگەر شتێکت لەبیرچۆوە ، وەبڵێ خۆزیا خوا ڕێگەیەکم پێدەبەخشێت و نیشانم دەدەدات بۆئەوەی لەوشتە نزیك بکەومەوە کەلەبیرم چۆتەوە

( خوێنەری بەڕێز بەباوەڕێکی پتەوەوە ئەم کارە ئەنجام بدە ئەوسا خۆت دەبینیتەوە کەوەڵامت دەدرێتەوە یان نا )

کەمێك خۆت خەریك بکە لەگەڵ ئایەتەکانی قورئان پێویستیت بەئامێری ژمێریاری ( الـة الحاسـبة ) نامێنێت لەزانستەکانی قورئانەوە هەموو دەرگاکانت بۆ دەکرێنەوەو فێردەبیت چۆن مامەڵە لەگەڵ شتەکاندا بکەیت، من لێرەدا نمونەیەکتان بۆ دێنمەوە کەلێکدانی ژمارەکانە ، هەموو ژمارەکان یاسای تایبەتی خۆیان هەیە وە پەیوەندیەکی نهێنی هەیە لەنێوان ژمارەکاندا بۆنمونە :-

هەر ژمارەیەك بتەوێت لەگەڵ ژمارە ( ١١ ) لە یەکتریان بدەیت ئەوا هەرئەوەندە تەماشای ژمارەکە بکەو بیری خۆت بخەگەڕو پەیڕەوی ئەم هەنگاوانە بکە :-

١١ × ٢٧ = ؟

سەیری ژمارە ٢٧ بکەو خانەی یەکانی وەکو خۆی بنوسەرەوە = ٧

ئینجا خانەی یەکانی و خانەی دەیانی کۆبکەرەوە ٧ + ٢ = ٩ لەشوێنی خانەی دەیانی ژمارە تازەکە دایبنێ

خانەی دەیانی ژمارە کۆنەکە = ٢ لە خانەی سەدانی ژمارە نوێیەکە بینووسە

ئینجا ژمارە نوێیەکە بەپێی خانەکانی یەکان و دەیان و سەدان دابنێ

سەرئەنجامەکە = ٢٩٧

کە ئەمەش ئەنجامی لێکدانی ١١ × ٢٧ = ٢٩٧

جا ئەگەر هاتوو ئەو ژمارەیەی کە لەگەڵ ژمارە (١١) لێك دەدرێت کۆی خانەی یەکانی وخانەی دەیانی لە ژمارە ( ٩ ) زیاتربوو ئەوا بۆنمونە :-

١١ × ١٩ = ؟

خانەی یەکانی ژمارە تازەکە = ٩
خانەی دەیانی ژمارە تازەکە = ٩ + ١ = ١٠
سفرەکە لەخانەی دەیاندا دەنووسێت و یەکەکەش بەدەستەوە دەگیرێت لەگەڵ
دووەم ژمارە کۆدەکرێتەوە کەدەبنە خانەی سەدان
خانەی سەدانی ژمارە تازەکە = ١ + ١ =٢
جا کاتێك کە ژمارە تازەکە دەنوسین بەم شێوەیە دەردەچێت
٩ ٠ (١+١) = ٩ ٠ ٢ کە ئەمەش ئەنجامی لێکدانی ١١ × ١٩ = ٢٠٩
بەهەمان شێوە بۆ سێ ژمارەیی و ........تاکۆتایی وە بۆ هەموو ژمارەکانی تریش یاسا هەیە بەڵام زیاتر نامانەوێت لە باسەکەمان دورکەوینەوە



٢٩٧ = ١١ × ٢٧



٤٠٧ = ١١ × ٣٧



٤٧٥٢ = ١١ × ٤٣٢

هەروەها بۆ هەموو ژمارەکانی تریش یاسای تایبەتی خۆیان هەیە ، بۆ ژمارە ١٢ ، ١٣ ، ١٤ ، .......هتد هەریەکەیان یاسای تایبەتی خۆی هەیە

وە هەموو ئەو ژمارەنەی کە لە ( نۆ ) گەورەترن پابەندن بەژمارە ( نۆ ) وە ، لەوانەیە هەندێك لەو ژمارانە پابەندبن بەژمارەی تریشەوە ، بەڵام ئەوەی یاسای بنەڕەتیە ئەوەیە کە کۆی ڕێنوسەکانی هەرژمارەیەك ئەگەر کۆبکرێنەوە و لە ژمارەکە دەربکرێن ئەوا ئەوەی کەماوەتەوە بەبێ زیادو کەمی دابەش دەبێت بەسەر ( ٩ ) دا

بۆنمونە ژمارە ( ١٢٣٥ ) ، ٥ + ٣ + ٢ + ١ = ١١

١٢٣٥ - ١١ = ١٢٢٤ ÷ ٩ = ١٣٦ بێ پاشماوەو زیادوکەمی

ژمارە (١٩٦١) :-

١+٦+٩+١ = ١٧ ، ١٩٦١ - ١٧ = ١٩٤٤ ÷ ٩ = ٢١٦ بە بێ پاشماوە

ئینجا وەرە سەیری پەیوەندی نێوان ژمارەکان بکەن لە ( ١ ) هەتا ( ٩ )

ئەگەر تەماشای ٩ + ١ = ١٠ بکەین دەبینین لەنێوان یەکگرتنی سەرەتای ژمارە (یەك ڕەنووسی یەکان ) و کۆتای ژمارە (یەك ڕەنووسی ) یەکاندا ژمارەیەکی تازە لەدایك دەبێت کە ژمارە ( ١٠ ) یە و دوو ڕەنووسیە لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە :

- سفر ژمارەنیە لەبەرئەوەی لەبنەڕەتدا نیە بەڵکو نیشانەیە بۆناسینی ژمارەیەك کەلەدوای ژمارە ( ٩ ) دەست پێدەکات بەهۆی پاڵپشتی کردنی ژمارەیەکی بنەڕەتیەوە کەژمارە ( ١ ) یەکە کەواتە ئەگەر ژمارەی ( یەك )نەبێت هەرگیز ژمارە ( ١٠ ) لەدوا وبەهۆی ژمارە ( ٩ ) دروست نابێت

- کەواتە ژمارە ( یەك ) بنەڕەتیە ، ( دوو ) لە ( یەك) ەوە درووست بووە ، هەروەها سێ لە ( دوو + یەك )ەوە درووست بووە بەهەمان شێوە

هـەموو ژمارەکـان لەیەکـەوە درووسـت بـوون ئـەو ( یـەك )ە هەیـە و بنەڕەتیـە ، ئـەو یەکـە تـاك وتەنهایەویەکـە ئـەم بوونـەوەرەی دروسـت کـردووە ، سُبۡحَـٰنَهُۥۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٤﴾ سُورَةُ الزُّمَر گـەورەیی و پیرۆزی بۆ ئەوخوایەی کە یـەك و تـاك وتەنهایـە و ( بەهۆی گەورەیی و فراوانی دەسەلاَتەکەیەوە ) خەفەت دەرولەناوبەری هەمووشتەکانە

ئینجا با کەسیش لەچارەنووس و پاشەڕۆژی ئەم قورئانـە نەترسـێت چـونکە بەدڵنیاییەوە بەملیۆنەها سەرباز پارێزگاری ئەم قورئانە دەکەن بۆنمونە

إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾ المَائِدَة سایەکی زمانەوانی زمانی عەرەبی دەڵێت : ئەگـەر( ان ) لـەپێش مبتـدأ وخـبر هـات ئـەوا یەکـەمیان منصـوب دەکـات و دووەمیان مرفوع دەکات بۆیە ئەگەر دەسکاری هەریەکێك لەووشەکانی ئایەتەکە بکرێت ئەوا ووشەکانی تر ناڕەزایی خۆیـان دەردەبڕن و دەسـتکاریەکە ئاشـکرا دەکەن ( المنجد ، انّ ، ص ١٩ )

فِى ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٧٤﴾ الأَعۡرَاف یاسایەکی تری زمانی عەرەبی دەڵێت حەرفی جەر ئەوناوەی کەبەدوایدا دێت مەجروری دەکات ( فِی ) حەرفی جەڕە ئەوناوەی کەبەدوایـدا هـاتووە ( الارضِ ) دەبێـت مجـرور بێـت واتـە دەبێـت بـەم شـێوەیە بنوسـرێت کەلـەژێر پیتـی( ضِ ) کەسـرە هـەبێت ( الأرضِ ) ، ئەگـەر وەهانەبوو ئەوا هەریەکەیان شاهیدی لەسەر ئەوەی تریان دەدات کەهەڵە هەیـەو دەستکاری کردنێك ڕویداوە

أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ ﴿١٧﴾ سُورَةُ الغَاشِيَة بل ) لە زمـانی عـەرەبی دا مانای حووشتری مێیە دەگەیەنێت هەر بۆیەش لەووشەکەی دوای خۆیـدا پیتـی ( تْ ) مێینـەی بـەکارهێناوە کەپشـتیوانی لەمێینـە بـوونی ووشـەی ( الابـل ) دەکات بۆیـە هـەرکاتێك ئـەو ( ت ) بزربکرێـت حوشترەکە هاواری پێدەکەوێت و دەستکاری کردنەکە ئاشکرا دەبێت .( الصحاح ، الابل ، ص٢ )( المنجد ، ت ، ص٥٨).

غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ سُورَةُ الرُّومِ سـەیری جوولـەی سـەر یەکـەم پیـت و دووەم پیـت بکـەین دەبیـنین ئەگـەر بگـۆڕێن ماناکـە بەتـەواوی دەگۆڕێـت ، لەمانایەکـەوە بۆمانایەکی دژ بەخۆی ( المنجد ، غلب ص ٥٥٦ )

وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ سُورَةُ الفِيلِ ( ابابیل ) باسی باڵندەکانە ، ئینجا هەرگۆڕانکاریەك بەسەر ( طیراً ) دابێت ئەوا ابابیل قبوڵی ناکات لەبەر ئەوەی ابابیل مانای پۆل پۆلی باڵندە دەگەیەنێت ، نەك ئەوباڵندانەی کە ئەم کارەیان ئەنجامداوە و سوپای ئەبرەهەو فیلەکانیان بەردباران کردووە ناویان تەیرە ئەبابیلە بوبێت ( المنجد ، ابل ، ص ٢ ) ( تەفسیری خاڵ / بەرگی ٣٠ / فیل ل ١٨٦ )

نمونە یەجگار زۆرن ، هەر ووشەیەك لە قورئاندا چەندین پاسەوانی بەسەرەوەن بۆیە هیچ بوارێك بۆ دەسکاریکردنی نیە

ئینجا پەروەردگار دەربارەی زانستەکانی فەلەك پێمان ڕادەگەیەنێت

إِنَّ فِي ٱخْتِلَـٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَّقُونَ ﴿٦﴾ يُونُسَ

بەڕاستی لەجیاوازی شەوو ڕۆژەکان و ئەوەی کە خوا دروستی کردووە لە ئاسمانەکان و زەویدا بەڵگەو نیشانە هەن بۆ گەلێك کە لەخوا دەترسێن زۆریش گرنگە ئەم گەشتە گیانیە سەرنج ڕاکێشە بەقوڵایی ئاسمانەکان و زەمیندا پشتگوێ نەخەی ئەوەی من مەبەستمە ئەوەیە کە بەویژدانەوە ڕوونی بکەمەوە کەتەنهاچاوەکانی ژیری هەموو قورئان دەبینێت !

وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهْتَدُوا۟ بِهَا فِي ظُلُمَـٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ..... ﴿٩٧﴾ الأَنْعَامِ

ئەو خوایەیە کە ئەستێرەکانی بۆدانـاون بۆئەوەی بەهۆی ئەو ئەستێرانەوە ڕێگەتان نیشان بدرێت لەتاریکاییەکانی ووشکایی ودەریاکاندا

ئینجا پەروەردگار بۆتەواوکاری کتێبە ئاسمانیەکان وتەواوکاری ئاینەکان وکۆکردنەوەیان لەکتێبێکی ئاسمانیدا بەناوی قورئان ولەئاینێکدا بەناوی ئیسلام دەفەرمووێت :

هَـٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ آل عمران

ئـــەم قورئانـــە ڕوونکردنەوەیـــە بۆهـــەموو خـــەڵکی وەڕێگـــا ڕووناککـــەرەوەو ڕێنیشاندەرە بۆئەوانەی لەخوا دەترسن

وواتا ئەم قورئانە تـەنها بۆموسـوڵمانەکان نیـە، بەڵکو بۆ هـەموو مرۆڤایەتیـە لـە هــەموو ســەردەمێکدا ، ئـەم قورئانــە خــەڵکی بێبــاوەڕیش دەتوانێـت کــەڵکی لێوەرگرێـت بۆکاروبـاری ژیـانی ، ئـەم قورئانـە تەواوکـەری تـەورات و ئینجیـل و نوسـراوە ئاسمانیـەکانی پـێش ئەوانـە ، کەواتـە ئـەی پـەیڕەوانی پێغەمبـەری مـەزنمان موسـاو پـەیڕەوانی پێغەمبـەری مـەزنمان عیسـا (سـڵاوی خوایـان لەسـەربێت ) بەدڵنیاییـەوە خـوا لەقورئانەکەیـدا داوا لەمحمـد دەکـات کەئـەم وویست وئارەزوو داواکاریەی من بگەیەنە بەخاوەن کتێبەکان

قُلْ يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَآءٍۭ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا ٱللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِۦ شَيْـًٔا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقُولُوا۟ ٱشْهَدُوا۟ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ آل عمران

ئـەی محمـد بڵـێ ئـەی پـەیڕەوانی کتێبـە ئاسمانیـەکان وەرن بۆجێبـەجێ کردنـی ئەو وێردە هاوبەشەی لەنێوان ئێمـەو ئێوەدایـە بەوەی کەلـەخوازیاتر کەسـی تـر نەپەرستین وهیچ هاوبەشی بۆدانەنێین، وە هەندێکمان هەندێکی ترمان نەکەین بەگـەورەو دەسـەڵاتدار بێجگـە لـەخوا ،جـا ئەگـەر پشـتیان تێکـردی و گوێیـان پێنەدای ئەوا پێیان بڵێن شاهیدی بدەن بەوەی کەئێمە موسڵمانین

واتە ئەی محمد بانگ لەپـەیڕەوانی ئاینە ئاسمانیـەکان بکە بۆپـەرستنی خوای تاك وتـەنها، وە پێیـان بڵـێ بائێمە لـەگوێ ڕایـەڵیمان بۆخـوا بۆ کەسـی تـر گـوێ ڕایەڵنەبین ، هەموو بڕیارو یاسـاکان لەلایـەن خـواوە هـاتوون لەنێو ئێمـە ولـەنێو ئێوەشـدا هـیچ کەسـێك بـۆی نیـە دەوری خوایـەتی ببینـێ و بـەئارەزووی خـۆی دەسکاری وویستەکانی خوا بکات، ئینجا ئەگـەر بـەوە ڕازی نـەبوون ئـەوا پێیـان

بڵێن كه ئێوه شاهیدی بدەن لەسەرئەوەی كەئێمە موسڵمانین وباوەڕ بەتاك و تەنهای خواو فریشتەكانی وپێغەمبەرەكانی وكتێبەكانی دێنین

ئایاپێغەمبەری مەزنمان موساو پێغەمبەری مەزنمان عیسا (سلاٌوی خوایان لەسەربێت ) ڕابەری هەمان بانگەواز نەبوون بۆدانهێنان بەتاك وتەنهایی خوای گەوره ؟ لەقورئاندا ئەوەندەی باسی پێغەمبەرانی بەنو ئیسرائیل كراوه ئەوەندە باسی ئیسماعیل ومحمد نەكراوه (سلاٌوی خوا لەسەرهەموویانبێت ). لەئاینی ئیسلامدا هەركەسێك باوەڕی بەهەموو پێغەمبەرەكان وهەموو كتێبەكان و هەموو ئاینەكان وهەمووفریشتەكان نەبێت ئەوا ئەوكەسە باوەڕەكەی تەواونیه كارێكی زۆر سەرسوڕهێنەره ئێمە هەمووومان زۆر لەیەكەوه نزكین هۆی چیه لەیەكتری دووركەوتوینەوەو لەیەكتری تێناگەین ؟ ئایا دەبێت پەیمانەكەی شەیتان بێت ڕۆڵی خۆی ببینێت بەوەی كەبڕیاریدا هەتاهەبێت هەرخەریكی گومڕاكردنی نەوەكانی ئادەم بێت ؟

هەربۆیەشە پەروەردگار لەكۆتایی سوڕەتی ( البقره ) دا ئەم ڕاستیه پەیام دەكات و پێویستی دەكات لەسەرشانی هەمووموسڵمانێك

ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾

پێغەمبەروخاوەن باوەڕەكان باوەڕیان هێنا بەوەی بۆپێغەمبەر هاتۆته خوارەوه لەلایەن پەروەردگارەكەیەوه ، هەموویان باوەڕیان هێنا بەخواو فریشتەكانی و كتێبەكانی ونێردراوەكانی، جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ كام لەنێردراوەكانی خواو، وەووتیان ئەی پەروەردگار گوێ بیست و گوێڕایەڵی لێبوردەیی تۆ بووین ، وەچارەنووس هەر بۆلای تۆیه

باسەكه باسی باوەڕه ، وەهەر خاوەن باوەڕێكیش ئەم مەرجانەی سەرەوەی تێدا نەبێت كەواتە باوەڕەكەی ناتەواوه كەواتە ئەگەرخاوەن باوەڕێكی پەیڕەوی

**محمـد بـاوەڕی بەموساوعیسـاوپێغەمبەرانی ترنـەبێت باوەڕەکـەی ناتـەواوە ئینجا ئەو پێغەمبەرەش** (سلاوی خوای لێبێت) **کە نـاوی محمـدە کۆتـایی هێنـەری هـەموو پێغەمبەرەکانـە بەچـاوی ڕێـزەوە تەماشـای پێغەمبـەرانی پـێش خـۆی دەکـات و هـەڵگری ئـالای ڕزگـارکردنی مرۆڤایەتیـە ، لـەزۆر لـەبوارەکانی ژیـانی دونیـاو دواڕۆژ ڕێگەنیشـاندەرە بـەرەو بەهەشـت .ئەوشـتانەی کـەمرۆڤ درکیـان پێناکات ڕێگەیان نیشاندەدات و بۆیان ڕووندەکاتەوە**

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم

(أَنَا أَكْثَرُ الأَنْبِيَاءِ تَبَعاً يَوْمَ الْقِيَامَةِ. وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ يَقْرَعُ بَابَ الْجَنَّةِ) .

صحيح مسلم بشرح النووي ٣٧ ٤ ٦ ١٩ م ١ الحديث الشريف

**پێغەمبـەر** (سـلاوی خـوای لێبێـت) **فـەرمووی:( لـە ڕۆژی دووایيـدا مـن لەهـەموو پێغەمبـەرەكان زیـاتر خـەڵكم لەگەڵدایـە ، وە مـن یەکـەم کەسـم کەلـەدەرگای بەهەشت دەدات )**

قَالَ رسُولَ اللّهِ صلى الله عليه وسلم:(إِنَّ الشَّيْطَانَ يأتي أَحَدَكُمْ فيقولُ مَنْ خَلَقَ السَّماءَ ؟ فيقولُ :اللهُ عزَّ وجَلَّ فيقولُ: مَنْ خَلَقَ الارْض ؟ فيقولُ الله فيقولُ: مَنْ خَلَقَ الله ؟ فإذا أحَسَّ أحَدُكُمْ بشيءٍ مِنْ هَذا فَلْيَقُلْ آمَنْتُ بِالله وَبِرُسُلِه) . مسند الإمام أحمد ٨٢٨٣ الحديث الشريف

**پێغەمبەر** (سلاوی خوای لێبێت) **فەرمووی : شەیتان دێت بۆلای یەکێك لەئێوە جا دەڵێـت کـێ ئاسمـانی دروسـتکردووە ؟ جـا ئەوکەسـە دەڵێـت خـوای گـەورە وپیرۆز جا شـەیتان دەڵێـت کـێ زەوی دروسـتکردووە ؟ جا ئەوکەسە دەڵێـت خـوا جـا شـەیتان دەڵێـت کـێ خـوای دروسـتکردووە ؟ جـا ئەگـەر یـەکێك لــەئێوە هەسـتی بەشـتێککرد لــەوجۆرە بابڵێـت : بـاوەڕم هێنابـە خـواو نێردراوەکانی**

ئینجا هەموو هەڵس وکەوتوو ژیانی ئەم پێغەمبەرە تەواوکارییە بۆیاساکانی ئیسلام بۆنمونە پێنج مەرج هەیە لەسەر مرۆڤ کە ببێت بەئەندامێك لە کۆمەڵگای ئیسلامدا

یەکەم باوەڕهێنان بەخواو فریشتەکانی وپێغەمبەرەکانی و کتێبەکانی وباوەڕهێنان بەهاتنی ڕۆژی دوایی

دووەم نوێژ کردن

سێهەم بەڕۆژوو بوون

چوارەم زەکاتدان

پێنجەم حەج کردن

خوێنەری بەڕێز بەووردی سەرنجی یەك لەدوای یەکی ئەمخاڵانەی سەرەوە بدە دەبینیت : بناغەی بەرنامەکە باوەڕە باوەڕ بەچی ؟ باوەڕ بەخوا کەگەورەترین دەسەڵاتە ، باوەڕ بەتەورات وئینجیل وکتێبە ئاسمانیەکانی تر کەلەلایەن خواوە ناردناونە خوارەوە ، باوەڕ بەفریشتەکانی خوا کەپاك وبێگەردن و لەفەرمانەکانی خوا یاخی نابن ، باوەڕ بەپێغەمبەرەکانی خوا لە ئادەمەوە بۆ محمد، باوەڕ بەمردن وبەزیندوبوونەوە

ئینجا کەسێك کەهەنگاوی یەکەمی بڕی وبناغەی باوەڕەکەی دامەزراو وپتەو بوو، ئەوا بەرەو هەنگاوی دووەم ڕێگەدەگرێتەبەر کەنوێژکردنە، واتە پەیوەندی کردن بەپەروەردگارەوە ، بۆ ئەنجامدانی ئەوئەرکە لەکاتی خۆیدا پێوویستی بەخۆپاککردنەوەیەك هەیە پێی دەوترێت دەست نوێژ .

ئینجا وەکو ووتمان نوێژ پەیوەندی کردنە لەگەڵ پەروەردگار ، پەیوەندیەکانیش جۆریان هەیە هەیانە لەهەر شوێنێکەوە بێت دەکریت هەشیانە پێویستیت بەپەیوەندیکردنی بەریدی مەرکەزیە کەڕووکردنە مزکەووتی کەعبەو شاری مەککەیە

کـۆدی نوێــژ ووتنــی ( اللــه اکــبر ) ە ، هــەرکاتێك ڕووی خــۆت کردەســێڵی سەتەلایتی ئیلاهی لەمزگەوتی بیت الحرام بەووتی ( الله اکبر ) پەیوەندیەکە گرێدەدرێت ، ئەم پەیوەندیە بەردەوامە تاخۆت کۆتایی پێدێنیت بەسەلامدانەوە بەلای ڕاست وچەپدا دیارە دروستکەری مرۆڤ لەهەموو کەس چاکتر دەزانێت کە مـرۆڤ بۆپتـەوکردنی باوەڕەکەی ، ڕۆژانـە پێویسـتی بەپێنج کـات هەیـە بـۆ خۆبارگاوی کردنەوە بەبارکەی باوەڕ :

کـاتی یەکـەم : لـە بەربەیاندایـەو نوێـژێکی دوو کڕنووشـیە تـۆ کـە لەخـەو هەڵدەسـتیت هـەموو خانـەکانی لەشـت لەپشـوودابوون بۆیـە خـۆ بارگـاوی کردنێکی دوو کڕنووشی تاکاتی نیوەڕۆ بارگەی باوەڕەکەت بەهێزدەکەنەوە

کـاتی دووەم لـەلادانی خۆردایـە لەناوەڕاسـتی گـۆی زەوی ، کـە لەبەربەیانـەوە تائەوکاتە تۆ خەریکی ئیش وکاریت وسەرقاڵی بژێوی ژیـانی ڕۆژانـەی خـۆت و ماڵ ومنداڵەکەتی بۆیە پێوویستیت بەنوێژێکی چوار کرنووشـی هەیـە بۆئەوەی لاشــەکەت ســارد بکاتــەوەو بارگاویــت بکاتــەوە بۆگەڕانــەوە بۆتــەواوکردنی کارەکانی ئەم ڕۆژەت

کـاتی سێهەم لەکاتێکدایە کەسێبەری هـەموو تـەنێك ببێـت بـەدوو ئەوەنـدەی خۆی ، بەنوێژێکی چوار کڕنووشی خۆت بارگاوی دەکەیتەوە تاکۆتایی ڕۆژەکە بۆتەواوکردنی کارەکان

کاتی چوارەم کاتی خۆر ئاوابوونـە ، لەماندویەتیـەوە بۆپشـودان پێوویسـتیت بەنوێـژێکی سـێ کڕنووشـی هەیـە بۆماڵئـاوایی لـەڕۆژی ڕابـردوو وەپێشـوازی لەشەوی داهاتوو

کـاتی پێنجـەم نوێـژێکی چـوار کڕنووشـیە لـەتاریکی شـەودا دەکرێـت پـێش خـەوتن ، بۆئـەوەی خـەوەکـەت خۆشبێت وبـەباوەڕێکی بارگاویـەوە ڕووبـەڕووی تاریکـایی شـەو ببیـەوەو لەهێرشـی شـەیتان وجندوکـەکان پـارێزراو بیـت و ئامادەبی بۆبەربەیانی ڕۆژی داهاتوو

ئینجا هەرحەفتەی جارێکیش کۆبونەوەیەکی جەماوەری هەیە لەناوەڕاستی دواڕۆژی حەفتەکەدا کەڕۆژی هەینی یە وەخۆبارگاوی کردنەکە بەکۆمەڵەو بەووتارێکی گەورەی موسڵمانان ونوێژێکی دوو کڕنووشی پێکدێت وتیایدا چارەسەری هەموو کێشەکانی حەفتەی ڕابردوو دەکرێت وخۆیش بارگاوی دەکرێتەوە بەبارگەیەك کەبۆماوەی یەك حەفتە کاری پێدەکرێت وبەش دەکات نوێژکردن تەنها بەرز بوونەوەو داهاتنەوە نیە ، بەڵکو کۆمەڵێك ئەرك وماف و داواکاری وبیرەوەریـن، کەسێکی خاوەنباوەڕ لەپەیوەندیەکدا لەگەڵ پەروەردگارەکەی دەریدەبڕێت وجێبەجێی دەکات لێرەدا تەنها ئەوەندە پەنجە بۆ ووێردێکی ناو نوێژ درێژ دەکەم کەیادوبیرەوەری پێشوازیکردنی پێغەمبەری مەزنمانە لەبارەگای یەزداندا ئەویش خوێندنی ( التحیات ) ە

لەگەشتەکەی بۆبارەگای یەزدان ، پێغەمبەری مەزنمان ئەوەندە لەپەروەردگار نزیك بۆوە وەکو ئەوسەرەو سەری دووکەوان لەوێدا پێغەمبەر فەرمووی : (التحیات لله) ، واتە سڵاوەکان بۆخوا ، التحیە : سەلام کردنە لەکەسێکی بچوکەوە بۆ گەورەکەی ، لە سەربازێکەوە بۆسەرکردەکەی ،خوا وەڵامی دایەوە: ( السلام علیك ایها النبی ورحمە الله وبرکاتە )، پێغەمبەریش لەوێدا بیری کردەوە و فەرمووی : ئەوسەلامەی خواو بەزەیی و بەرەکەتەکەی بۆسەر ئێمەو بۆسەر هەمووچاکەکاران ، لەوێدا کەفریشتەکان لەدەوری عەرشی پەروەردگار بەڕیز وەستابوون کەتەماشایانکرد محمد لەبارەگای خواشدا دۆست ولایەنگرو چاگەکارەکانی لەبیرنەچوو بۆیە ووتیان ( اللهم صلی علی محمد وعلی اهل محمد کما صلیت علی ابراهیم وعلی اهل ابراهیم فی العالمین انك الحمید المجید) ئەمە مەڕاسیمی پێشوازی کردنی محمد بوو لەبارەگای خوادا ، خراوەتە ناونوێژەوەو تۆلەهەموو تەحیاتێکدا پەیمان بخوا نوێ دەکەیتەوە کە باوەڕت بەوە هەیە کەپەروەردگار لەبارەگاکەی خۆیدا بەم شێوەیە پێشوازی لە پێغەمبەرەکەی کرد

سـێهەم : بـەڕۆژوو بوونــە ، بـەڕۆژووبوون زەکاتــدانی دەروونــە ، پشــودانی کۆئەندامەکانی لەشە ، هەست پێکردنـی ئازارەکـانی فەقیرو هەژارەکانە ، یـادی هاتنە خوارەوەی پەیڕەوو پڕۆگرامی ئاینی ئیسلامە

چوارەم زەکـات دانـە ، واتـە بـاج دانـە یاسـاکانی باجـدان زۆر زۆر فـراوانن و ووردەکاری زۆریان تێدایە بۆ ئەوکەسـەی کـەزەکاتیش دەدات و بۆئەوکەسـەش کــە وەری دەگرێــت ، دەســەڵاتی دەوڵــەت هەڵدەســتێت بەکۆکردنــەوەی لــە دەزگایەکدا بەناوی ( بیت المال ) کەڕۆڵی وەزارەتی دارایی دەبینێت

زەکاتی کشتوکاڵێك کەبەهۆی باران هاتبێتە بەرهەم دەیـەکی بەرهەمەکەیـە ، وە زەکــاتی کشــتوکاڵێك کەبــەهۆی ئــاودێری هاتبێتــە بەرهــەم بیســت یــەکی بەرهەمەکەیە وەزکاتی کشتوکاڵێك کـەنیوەی بـەئاوی باران و نیوەکـەی تـری بـە ئـاودێری هێندرابێتـە بەرهـەم ( ٤ / ٣ )ی دەیەکەکەیـە . وە زەکـاتی پـارەو زێـڕ ئەگەر هەموو ئـەوماڵ و سامانانەی کەکەسێك هەیـەتی بەپارە یـان بـەزێڕ بگاتـە نرخـی بیسـت مسـقاڵ زێـر ئـەوا زەکـاتی لێدەردەچـێت، بۆهـەر چـل مسـقاڵ مسـقاڵێك و بۆهـەر چـل دینـار دینارێـك، بەمـەرجێك ئەومالـە سـاڵێکی تـەواو لای خاوەنەکەی مابێتەوە وواتە ئـەوپارە یـان زێـڕەی کەهەتـە لـەدوای سـاڵێك بـەوە شەوەوە کەزیادی کردووە ئەگەر لەنرخی ٢٠ بیسـت مسـقاڵ زێـڕ زیـاتر بووئـەوا ٢,٥ ٪ لەســـەدا دوونیـــو زەکـــات لەماڵەکـــە وەردەگیرێـــت .هـــەر لەســـەر ئـــەو بنەمایەشە مارەیی ئافرەتان ( ١٩ ) مسقاڵ داندراوە بۆئەوەی نەگاتـە ئەنـدازەی زەکاتدان

جاکەسێك کەگەیشـتە ئـەوەی زەکـات بـدات وزیـادەی هـەبێت ئـەوا لەسـەری پێویست کراوە کەمەرجی پێنجەم جێبەجێ بکات کەحەج کردنە

پێنجــەم حــەج کــردن ســەردانی مــاڵی خــوا یــە ، بۆچـی ؟ بـۆ مـۆرکرنی بڕوانامەیــەك لەلایــەن پــەروەردگارەوە بــۆ ئەومرۆڤــە کەلــەدوای تــەواوبوونی مەڕاسیمەکە ئەو بڕوانامەیەی پێدەدرێت وئالای دیموکراتیەت هەڵدەکات حەج

کـردن کۆمـەڵێك خواپەرسـتی ویادگـارو بیرەوەریـن ، لـەڕۆژی عەرفـەی پـێش جەژنی قوربان پێویستە لەدەوروبەری چیای عـەرەفات ئامادەبێت بۆ بیرەوەری یەکتر ناسینەوەی ئادەم وحەوا ڕاکردن لەنێوانی صەفاو مەروەدا کەپێویستە حاجی یەکان بیکەن، بیرەوەری هاتن و چوونەکەی هاجەرەی دایکی ئیسماعیلە لە نێوان صەفا و مەروەدا و شەیتان ڕەجم کردن یادی شەیتان ڕەجم کردنی ئیبراهیمـە ، وە سـەربڕینی قوربانیـەك، یـادی سـەربڕینی ئیسماعیلە لەلایـەن ئیبراهیمەوە ، سوڕانەوەی دەوری کەعبە یادی پێغەمبەرە کە بەدەوری کەعبـەدا دەسـوڕایەوە ، ئینجـا لەگـەڵ ئەوەشـدا حـەجکردن کۆبوونەوەیـەکی سـاڵانەی موسـڵمانەکانە ، بـۆ ئـەوەی ئەگـەر دەسـەڵاتداری وولاتێـك زوڵمـی لـەڕەش و ڕوتەکەی وولاتـی خـۆیکرد ئـەوا حاجیەکانی ئەو وولاتە لەگەڵ حاجیەکانی تـردا کێشـەکانیان باسـبکەن و لەڕێگەیانـەوە هەواڵەکـە بگاتـە گـەورەی مووسڵمانان و کێشەکەیان چارەسەربکرێت

حاجیەکان کەحەجەکەیان تـەواو کـرد ئـاڵای زەردی دیمووکراتیـەت هەڵـدەدەن بەشێوەیەك لەهەرشـوێنێك حاجیـەك ببینـدرێت دەبێـت نیشـانەی دەستپاکی و داوێنپاکی وزمانپاکی ونمونەی قوربانی وخۆبەختکردن بێت

کەسێك نەتوانێت دوای حەج کردنەکەی ڕێز لەحەجەکەی خۆی بگرێـت نەیکات باشترە ، چونکە حەج یەك جار پێویستکراوە گەر لەدەستچوو نایەتەوە

ئینجا وەکو ڕوونمان کردەوە بۆپەیوەندیەکانی تەلـەفۆنی لـەنێوان پـەروەردگارو بەندەکانیـدا ئـەوا بەریـدی مەرکـەزی لەشـاری مەککـە دەستنیشـان کـراوە بـۆ گرێدانی شەپۆلەکانی پەیوەندییەکان لەنێوان پەروەردگار وبەندەکانیـدا ، بـەڵام کاتێـك کـەمرۆڤ بیـەوێت لەسـنوری زەوی و ئاسمانەکـەی بچـێتە دەرەوە ئایـا لـەکوێوە ئـەم گەشـتە دەست پێـدەکات ؟ ئایـا لەبـەر ئـەوەی کـە کەعبـە یەکـەم مزگەوتی خوایەو وەکو باسمانکرد بنکەیـەکی پەیوەندی بێتەلـە ، ئایا دەبێت

هەمان شوێن گونجاو بێت بۆدانانی وەکو بنکەیەکی ئاسمانی، بۆئەوەی لەوێوە بەرەو دەرەوەی سنوری زەوی وئاسمانەکان بڕۆیت ؟
لەمبارەیەوە پەروەردگار دەفەرمووێت
﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَا الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿١﴾﴾ الإسراء
پاکی وپیرۆزی بۆ ئەوپەروەردگارەی کەبەشەو( محمد) ی بەندەکەی خۆی لە مزگەوتی بیت الحرام لەمەکەوە برد بۆمزگەوتی بیت المقدس لەشاری قودس، ئەو مزگەوتەی کەپیرۆزیمان بەدەوروبەرەکەیدا ، ( وەئەو گەشتەشمان بۆیە بەمحمد کرد ) بۆئەوەی لەبەڵگەو نیشانەکانی خۆمانی نیشان بدەین بەڕاستی پەروەردگار گوێ بیست وبینایە
ئینجا پێغەمبەر لەوێوە ، لەم بنکە ئاسمانیەوە گەشتەکەی بەرەو بارەگای پەروەردگار دەستپێکردو بەڕێوڕەسمێك پێشوازی لێوەکراو بەکۆمەڵێك ئەرك و فەرمان ومزگێنیەوە گەڕایەوە ( تفسیر ابن کثیر الاسراء ١ )
کەواتە پەروەردگار پێمان ڕادەگەیەنێت ئەی ئادەمیزادەکان ئەگەر وویستتان گەشتێك بکەن بۆدەرەوەی سنوری خۆتان، ئەوا دەبێت بچن لەبنکەی ئاسمانی بیت المقدس گەشتەکەتان دەست پێبکەن
ئەوانەی لەسەرەوە باسمانکردن و بۆنمونەش زەکات ونوێژ لەقورئادا تەنها سەری باسەکان باسکراون ئینجا پێغەمبەر ڕوونکردنەوەو ووردەکاری یەکانی تەواوکردوون
ئەگەر مرۆڤێك بەووردی وبەوویژدانەوە توێژینەوە لەسەر ژنهێنانەکانی محمد بکات بۆی دەردەکەوێت کە محمد چۆن خۆی کردووە بەمۆمێك بۆڕووناك کردنەوەی ڕێبازەکانی مرۆڤایەتی
زەید لەخێزانێکی عەرەب بوو ، سروشتی عەرەبیش پێش ئیسلام وەکو ڕەشەبای بیابان وابوو ، ئیمڕۆ هۆزێکت دەبینی لەسەرخاك و ماڵ و ئاوی

خۆیـــان بـــوون بۆبـــەیانی دەتبینینـــەوە تـــالأنکراون وخۆیـــان ومـــالّ و منداڵەکانیشیان لەبازاڕدا دەفرۆشرێن ، زەیدیش یەکێك بوو لەومندالأنەی کە هێنرایە بازاڕ بۆفرۆشتن ، لەوێدا خەدیجە کڕی ، وە کاتێك کەبوو بەهاوسەری پێغەمبەر زەیدی خستە بەردەستی پێغەمبەر ، ئەویش ئازادی کردوکردی بە کوڕی خۆی لەناو خەڵکیدا زەید بەکوڕی محمد ناوی دەرکرد ، کاتێك زەید گەورە بووحەزی چووە سەر کچە پورێکی پێغەمبەر بەناوی( زەینب)، داوای لە پێغەمبەر کرد بۆی بخوازێت ، ئەویش بۆی خواست و بوو بەهاوسەری زەید ، دوای ماوەیەك زەیـد کەدەچـوو بـۆلای زەینـەب توانـای جێبـەجیٚ کردنـی ئەرکـەکانی نـەبوو بۆیـە داوای لەپێغەمبـەرکرد کـەناتوانێت بـەردەوام بێـت ولەگەڵیدا بژیەت لەبەرئەوەی زەینەب ئازاری دەدات وقسەی پێدەڵێت

لەوەلأمدا خوا دەفەرموویت کە محمد بەم شێوەیە وەلأمی زەیدی دایەوە

( لەشیکردنەوەکانی القرطبی و ابن کثیر وەرگیراوە ئایەتی ٣٧ الاحزاب )

وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ

﴿٣٧﴾ سُورَةُ الأَحْزَابِ

وە ئەو کەسەی کەخوا نازو نیعمەتی پێداوەو تۆش خستوتەتە نازو نیعمەتەوە پێی دەڵێی لەخوا بترسیٚ وژنەکەت لای خۆت بگرەوە

واتە تۆ ئەی محمد بەزەید دەڵێی ژنەکەت لای خۆت بگرەوەو لەخوا بترسیٚ و تەلأقی مەدە کەواتە مەبەستێکی پەروەردگار لێرەدا خۆی ئاشکرا دەکات کە کە هەموو کێشەکە ئارەزوو وویستی پەروەردگاربووە بۆتەلأقدانی (زەینەب ) لەزەیدوماره کردنەوەی بۆمحمد لەپێناوی مەبەستێك بۆیە دەفەرموویت

فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَـٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ

حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ ﴿٣٧﴾ سُورَةُ الأَحْزَابِ

کاتێك زەید کەزانی بەکەڵکی ئەونایەت دەستی لێهەڵگرت وتەلأقیدا. ئینجا ئەی محمـد ئێمـە زەینـەبمان لـەتۆمارەکرد بۆئـەوەی خـاوەن باوەڕەکـان توشـی

تەنگەبەری و ناڕەحەتی نەیەن دەربارەی ژنی ئەو کەسانەی کەبەناوی ئەوانەوە ناسراون

کەواتە لێرەدا وویستی خوا وابوو بۆئەوەی زەید زەینەبی هاوسەری تەلاق بدات، وە خواخۆی لەمحمدی مارەبکاتەوە بۆئەوەی بەندێك لەیاساکانی ژن هێنان ڕوونبکرێتەوە بۆ موسڵمانەکان ئەویش ئەوەیە  لەوانەی کەبۆتان حەلاڵ کراوە:-

وَحَلَٰٓئِلُ أَبۡنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنۡ أَصۡلَٰبِكُمۡ ....... ﴿٢٣﴾ سُورَةُ النِّسَاءِ

لێتان قەدەغەکراون ...خێزانی ئەوکوڕانەتان کە لەپشتی خۆتانن

وواتە ژنی کوڕەکانتان هەر قەدەغەن لەئێوە لەدوای کوڕەکانیشتان، ئەگەر کوڕەکانتان بمرن یان بووکەکانتان تەلاق بدرێن هەرلەئێوە قەدەغەن

ئینجا وواتە بەپێی کێشەکەی زەینەب وزەید ئەوا خێزانی کوڕێك کەلەپشتی ئەوباوکە نەبێت کەلای ئەو گەورە بووبێت ، ئەو بەخێوکەرە بۆی هەیە ژنی تەلاقدراوی ئەوکوڕە مارە بکاتەوە ، لەسەر ئەم بنەمایە خوا خۆی زەینەبی لە محمد مارەکرد  بۆ ئەوەی موسڵمانەکان پەیڕەوی ئەم یاسایەبکەن وحوکمی ئایەتەکەی پێشتر ڕێگەیان لێنەگرێت وپەیڕەوی پێغەمبەربکەن

سەرچاوە زۆرن بۆیەکێك کەبیەوێت بەویژدانەوە هەمووشتێك لەسەر پێغەمبەر بزانێت ، تاوانیشە کەسێك نەیناسێت و پلاری لێبدات  و محەمەدیش بەوە کەم نابێتەوە و بچوك نابێتەوە کەپلاری لێبدرێت و وێنەی کاریکاتێری بۆ بکێشرێت ، خۆ ئێمەش زۆرمان پێناخۆشە سوکایەتی بەهەر پێغەمبەرێك بکرێت ، یان سوکایەتی بەهەر کەسایەتیەك بکرێت ئەگەر موسڵمانیش نەبێت ، بەڵام خۆشەویستەکانمان لەپەیڕەوانی کوڕی مریەمی پێغەمبەرمان ( سەلامی خوایان لەسەربێت ) لەجیاتی ئێمە نەدەبوو ڕێگە بەوکەسانە بدەن کە سوکایەتی بەنێردراوەکانی باوکەگەورەکەمان دەکەن ، ئاخۆ ئێوە نازانن کاتێك محەمەد دژایەتی دەکرا هانای بۆبراکانی برد لەپەیڕەوانی ئاینی کوڕی مریەم

(سەلامی خوایان لە سەربێت ) لە وولاّتی حەبەشە ؟ وە نەجاشی پشت و پەنایەکی چاکبوو بۆیان ، ئایا ئێوەنازانن کاتیّ کەنەجاشی مرد پێغەمبەری ئیسلام نوێژێکی بەکۆمەلّی بۆکۆچی دوایی نەجاشی کرد ؟ بەبیر وباوەڕی ئێمە کەسێك سوکایەتییەك بەهەر پێغەمبەرێك بکات وەکو سووکایەتی بەمحمد کردبێت وەهایە ، لە دیدەی ئێمەی موسلّماندا مریەمی کچی عمران ( سەلامی خوایان لەسەربێت ) پاکترین و بەڕێزترینی ئافرتانە لەدونیاوخاوەن پلەو پایەیەکی تایبەتە لەدواڕۆژدا

ئینجا بۆدابینکردن ومسۆگەرکردنی دواڕۆژ دەفەرمووێت :

عن ابن عُمرَ قَالَ: أَخَذَ رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم بِبَعْضِ جَسَدِي فقَالَ: (كُنْ فِي الدُّنْيَا كَأَنَّكَ غَرِيبٌ أَوْ عَابِرُ سبيلٍ وَعُدَّ نَفْسَكَ مِنْ أَهْلِ القُبور ) . تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي ٢٣٧٠ الحديث الشريف

پێغەمبەر(سلاّوی خوای لێبێت)فەرمووی:( لە دونیادا وەهابە وەکو کەسەێك کەغەریبی، یان ڕێبوارێکی ناوڕێگای وتێدەپەڕیت ، وەخۆشت لەگەلّ خاوەن گۆڕەکان بژمێرە )

هەرچی هەتبێت لەمالّ وسامانی دونیا ڕۆژێکدێت هەربەجێی دەهێلّیت ، جا بۆیە بۆتۆ وەهاچاکترە کەخۆت بەغەریب یان بەڕێبوارێك بزانیت وخۆت لەگەلّ خەلّکی گۆڕستان سەرژمێری بکەی ، چونکە دلّنیابە ڕۆژێکدێت بەڕووتی و بێکەسی و بیّ مالّ وسامان ئەم هەوارە بەجێدەهێلّیت

عن النبي صلى الله عليه وسلم قَالَ:
(إِنَّ الله تعالى يَقُولُ يَا ابن آدَمَ تَفَرَّغْ لِعِبَادَتِي أَمْلأْ صَدْرَكَ غِنًى وَأَسُدَّ فَقْرَكَ، وَإِنْ لاَ تَفْعَلْ مَلأْتُ يَدَيْكَ شُغْلاً وَلَمْ أَسُدَّ فَقْرَكَ) . تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي ٢٥١٥ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سلاْوی خوای لێبێت) فەرمووی :( خوای گەورە بە ئادەمیزاد دەڵێت خـۆت بۆپەرسـتنی مـن تەرخانبکـە سـنگت پڕدەکـەم لەدەوڵەمەنـدی وە هەژاریەکەت لەسەر لادەبەم ، جا ئەگەر وانەکەی دەستت پڕلـەئیش وکار دەکەم وهەژاریەکەشت لەسەر لانابەم )**

**هـەروەها ئاگاداریمـان پێـدەدات و ئەومەترسـیانەمان پێڕادەگەیـەنێت کەدەبنـە هۆی ئەوەی کەڵك لەژیانی دونیا وەرنەگرین بۆیە دەفەرمووێت**

قَالَ رَسُولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم : ( يَهْرَمُ ابنُ آدَمَ وَيَشِبُّ مِنْهُ اثْنَانِ: الحِرْصُ عَلَى المَالِ وَالْحِرْصُ عَلَى العُمُرِ ).

تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي ٣ ٠ ٥ ٢ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سلاْوی خوای لێبێت)فەرمووی ( دوو شت ئادەمیزاد دەتـەپێنن و پیری دەکەن سوربوون لەسەر ماڵ وسامان وسوربوون لەسەر تەمەن )**

**وەدەربارەی ئەوانەی پاشەملە باسی خەڵکی دەکەن دەفەرمووێت**

حَدِيث حُذَيْفَةَ رضي الله عنه قَالَ : سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم يَقُولُ

لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ نَمَّامٌ ۞٦٤ البيان

**پێغەمبـەر (سلاْوی خـوای لێبێـت)فـەرمووی :( ناچێتە بەهەشـتەوە ئەوکەسـەی پاشەملە قسە لەنێوان خەڵکیدا دێنێ ودەبات ).**

**ئینجـا پێغەمبـەر دەربـارەی ڕوودانـی کارەسـاتەکانی ڕۆژی دووایـی کـە لـەچ ڕۆژێکدا دەبێت دەفەرمووێت**

أَنَّ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم قَالَ: ( خَيرُ يومٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ ، يومُ الجُمُعَةِ . فِيهِ خُلِقَ آدَمُ وفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ . وفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا فِي يومِ الْجُمُعَةِ ). صحيح مسلم ١٩٢٧ الحديث الشريف

باشترین ڕۆژ کەخۆری تێدا دەرکەوت ، ڕۆژی هەینی بوو لەوڕۆژەدا ئادەم دروستکرا وە لەو ڕۆژەدا خرایە بەهەشتەوە وە لەوڕۆژەدا لەبەهەشت دەرکرا وەکاتی ڕۆژی دوایی دانایەت مەگەر هەرلەڕۆژی هەینیدا نەبێت

عن ابن عبّاس قالَ: قالَ رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم: «فَقيهٌ أشَدُّ عَلَى الشّيْطَانِ منْ ألف عَابِد» تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي ٢٧٥١

پێغەمبەر (سَلاَوی خَوایَ لێبێت)فەرمووی : { زانایەك ( له یاساو دەستورەكانی خوادا) توندترە لەسەر شەیتان لەهەزار خوا پەرستی( نەزان )}

ئایا ئەم ڕاستیەی سەرەوە ئەوە ناکەیەنێت کەبەرنامەکانی پەروەردگار هانی خەڵکی دەدەن بۆفێربوون وخوێندن وخوێندنەوە ...؟ ئایا کەسانی خوێندەواری خاوەن باوەڕ لەلای پەروەردگار پیرۆزترنین لەخاوەن باوەڕە نەخوێندەوارەکان؟ئەدی بەچ مافێك دواکەوتوویی ونەزانین دەدەنە پاڵ ئیسلام؟ ئینجا پێغەمبەر بۆگەیاندنی زانستەکان و چارەسەری نەخۆشیەکان و پاراستنی دەم و ددان لە نەخۆشیەکان دەفەرموویێت

عَنِ النَّبِـي صلى الله عليه وسلم قَالَ: (السِّوَاكُ مَطْهَرَةٌ لِلْفَمِ مَرْضَاةٌ لِلرَّبِّ ).

السندي في شرح سنن النسائي ٥ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت)فەرمووی : سیواك کردن پاککەرەوەیە بۆ دەم و ڕازیکردنی پەروەردگارە

بەهەمان شێوە هانمان دەدات بۆ ئەوەی بەبەردەوامی بەدوای زانستەکاندا بگەڕێین و شتە شاراوەکان ئاشکرا بکەین وڕێگەی زانست بگرینەبەر بۆ ڕووبەڕوبونەوەی هەموو کێشەکان بۆیە دەفەرموویێت

عن أبي هريرة يرفعه قال: «لَوْلاَ أنْ أشُقَّ عَلَى الْمُؤْمنِين لأمَرْتُهُمْ بِتَأْخِير الْعِشَاءِ وبالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ.». ابن قيم الجوزية في شرح سنن أبي داوود ٤٦

﴿ ئەگەر لەسەر خاوەن باوەڕەکانم گران نەکردبایە ئەوا فەرمانم پێدەکردن بە دواخستنی نوێژی خەوتنان وبەسیواك کردن لەهەموو کاتی نوێژێکدا ﴾.

واته به پاككردنەوەی ددانەكان پێش خەوتن ، بۆئەوەی لەخەوێكی خۆشدابێ
وبەكتریا تامی ناودەمت نەترشێنێت




ڕەگــی داری ســوس یارمــەتی چــاك بوونــەوە وســوتانەوەی برینــەكانی نــاو دەم دەدەن
1001 NATURAL REMEDIES P 19)

عرق السوس licorice مێكوك ( كەڵە فەرهەنگ ل ٨١ )

سیواك :واتـه پێداهێنان ولێخشاندنی چیلكەیدارێك بەناو دەمووددانـدا كـه دە
وددان پاكدەكاتـەوە ( المنجد ساك - السواك ص ٣٦٥ )

ئەوەی مەبەستمانە ئەوەنیە پاكانە بكەین بۆداری سیواك. بەڵكو ئاشكراكردن
ڕووە زانـــستەكەیە كـــەڕەگ وقـــەدی زۆردرەخـــت هەیـــە كەپێكهاتـــەكانیا
یاریدەدەرێكی چاكن بۆچارەسەری هەموو نەخۆشیەكانی ناودەمودان و پـوو
و ئەندامەكانی تری جەستەی ئادەمیزاد

چـیلكەی ددان ڕوەكـی ددان ئـاژنین = سـتناج گیایـەكی سـاڵانەی ڕەق
لـەدەلتاو لەهەڵەبجـە وحەویجـە و بەشـێوەی بـاخ لەموصـل وزاخـۆ دەڕوێـ
تۆوەكـەی ئـەم مـاددە كیمیائیانـەی تێدایـە ( خـیلین khellin ) ( خیلـۆ

( khellol (فــسناجين visnagin ) (ريـــسين resin) ، (ئـــەمۆدين ammoidin)

( فـيرۆ كۆمـارين furo cumarins ) ، ( مـاجۆدين majudin ) و چـەندين ماددەی كيميائی كه سيفەتی ميز پێكردن( diuretic)و دژی كۆڵنجيان هەيە، هەر لـه بەرئـەوه بـۆژانی گورچـيله بـەكاردەهێنرێن وكاردەكەنـه سـەر ماسـولكه سـافەكانی بۆڕيـەكانی هەناسـه ، ڕيخۆڵـه ، مندالْـدان وخـوێن بـەره بـچوكەكانی تـاجی شـله ئامـاده كراوەكـانی لەدەمـەوەو بەشـێوەی دەرزی ( شـرينقه )بۆ گەوره كردنی خوێنبەری تاجی بەتايبەتی لەكاتی نەخۆشـی سينگه كوژێدا ( الذبحة الصدرية ) بەكاردەهێـندرێت لاسـكه كانيـشی بۆپـاك كردنـەوەی ددان بەكاردەهێـندرێت ( ل ١٧٠ كەڵه فەرهەنگ )

ئينجـا دوای ئـەوه پـەروەردگار ڕێبازوشـێوازی پەشـيمان بوونـەوەمان نيـشان دەدات بۆئەوەی دەسخەڕۆی دونياودواڕۆژ نەبين بۆيه دەفەرمووێت

إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧﴾ سُورَةُ النِّسَاءِ

بەڕاستی قبـوڵكردنی تۆبـەو پـەشيمان بوونـەوه لەلايـەن خواوەيـه بۆئەوانـەی كـه كارێكی خـراپ دەكـەن بەنـەزانی جا دوابـەدوا لەنزيكـەوه پەشـيمان دەبنـەوه جـا ئەوانه خوا تۆبەكەيان لێقبولْ دەكات وەخوا زاناوكاردروسته

وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّى تُبْتُ ٱلْـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمْ كُفَّارٌ أُوْلَٰٓئِكَ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٨﴾ سُورَةُ النِّسَاءِ

وه تۆبەكردن بۆ ئەوانەنيه كەخراپەكاريەكان دەكەن تاكاتێك مـردن دەگاتـه سـەر يـەكێكيان دەڵێـت مـن ئێـستا تۆبـەمكرد، وەتۆبـەكردن بۆئەوانـەش نيـه كەبـەبێ باوەڕی دەمرن ئەوانه سزاوئازارێكی سەختمان بۆئامادەكردوون

زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ
ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ سُورَةُ آلِ عِمْرَانَ

جوانكاری كراوه بۆخەڵكی لەخۆشەوویستی ئارەزووەكان لەئافرەتان ومندالآن ومالێكی زۆری كۆكراوە لەزێڕو زیوو وئەسپی فێركراو ومالآت وشینایی و كشتوكاڵ ، ئەوانە هەموویان تامولەزەتی ژیانی دونیان ، وەخوا شوێنی گەڕانەوەی باشی هەیە بۆئێوە ( كەچاكترە لەو تامولەزەتانەی دونیا ).

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ
وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾ سُورَةُ الحَشْرِ

ئەی ئەوانەی كەباوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن وە باهەمووخاوەن دەروونێك تەماشابكات چی لەپێش خۆیەوە ناردووە بۆئەوڕۆژەی كەلەپێشیەتی ( كە ڕۆژی دووایيە) وە لەخوا بترسێن بەڕاستی خوا شارەزايە بەوەی كەدەيكەن

وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمْ أَنفُسَهُمْ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿١٩﴾ الحَشْرِ

وەوەكو ئەوانە مەبن كەخوايان لەبيركرد ، جا خوا ئەوانی والێكرد كەخۆيان لەبيربكەن ، ئەوانە ئەوكەسانەن كەلەڕێگەی ڕاست لايانداوە

دەربارەی نيشانەكانی ڕۆژی دوايی پێغەمبەری ئيسلام دەفەرمووێت

حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه :
أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى
يَخْرُجَ رَجُلٌ مِنْ قَحْطَانَ يَسُوقُ النَّاسَ بِعَصَاهُ ۞ ١٦٨٦ البيان

( دواكاتی بونەوەر نايەت هەتا پياوێك لەناو ( قحطان ) دەردەكەوێت خەڵكی بە گۆچانەكەی لێدەخوڕێت ) واتە پێش كۆتايی بونەوەر لەناو عەرەبی( قحطان ) پياوێك پەيدا دەبێت ئەوەندە زاڵ دەبێت بەسەر خەڵكەكەدا وەكومالآت بە گۆچانەكەی لێياندەخوڕێت

حَدِيثُ أَبِى هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عنه :

أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَمُرَّ الرَّجُلُ بِقَبْرِ الرَّجُلِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي مَكَانَهُ ۞ ١٦٨٤ البيان

( دواكاتى بونەوەرنايەت هەتا پياوێك بەلاى گۆڕێكدا دەڕوات جادەڵێت خۆزيا من لەجێگەى ئەوبومايە )

واتە ژيان ئەوەندە تەنگ و ناخۆش دەبێت مرۆڤ حەسودى بەمردوو دەبات

ئينجا لەنيشانە سروشتيەكاندا كەپێش ئەوڕۆژە ڕوودەدەن دەفەرمووێت

حَدِيثُ أَبِى هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عنه :

أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَحْسِرَ الْفُرَاتُ عَنْ جَبَلٍ مِنْ ذَهَبٍ يَقْتَتِلُ النَّاسُ عَلَيْهِ فَيُقْتَلُ مِنْ كُلِّ مِائَةٍ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ وَيَقُولُ كُلُّ رَجُلٍ مِنْهُمْ لَعَلِّى أَكُونُ أَنَا الَّذِى أَنْجُو ۞ ١٦٨٠ البيان

يحسر : يكشف

( دواكاتى بونەوەر نايەت هەتا ڕووبارى فورات چيايەك ئاشكرا دەكات لەژێر لەسەر ئەوزێڕە خەڵكى يەكترى دەكوژن،جاهەر لە سەدكەس نەوەدونۆيان دەكوژرێن ، وە هەموو پياوێك لەوان دەڵێت هيوا دەخوازم ئەمن ئەوەيانبم كە ڕزگارم دەبێت )

وادەردەكەوێت ئەوسەردەمە نزيك بوبێتەوە ، ئێستا توركيا سەرگەرمى دروست كردنى چەندين بەنداوە لەسەر ڕووبارى فورات !

وەلە نيشانەكانى ترى هاتنى ئەوڕۆژە دەفەرمووێت :

حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ
لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَكْثُرَ الْهَرْجُ قَالُوا وَمَا الْهَرْجُ يَا رَسُولَ
اللَّهِ قَالَ الْقَتْلُ الْقَتْلُ ۞ ١٦٧٨ البيان

**( دواكاتى بونەوەر نايەت هەتا هەرەج زۆر دەبێت ووتيان هەرەج چيە ئەى پێغەمبەرى خوا ؟ فەرمووى كوشتن كوشتن )**

عن أنس قال: قال رسولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: «إنَّ مِنْ أشْراطِ الساعةِ أنْ يُرفَعَ العِلم، ويَثبُتَ الجهلُ، ويُشرَبَ الخمرُ، ويَظهرَ الزِّنا».

صحيح البخاري ٨٠ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سلاوى خواى لێبێت)فەرمووى :( بەڕاستى لەنيشانەكانى دواكاتى بوونەوەر ئەوەيەكە زانست لادەبردرێت ، وەنەزانين جێگير دەكرێت ، وە شەڕاب دەخورێتەوە ، وە داوێن پيسى پەيدا دەبێت )**

**ئەم سەردەمە ئەگەر ئێستا نەبێت بەدڵنياييەوە دوورنيە**

**پێغەمبەر (سلاوى خواى لێبێت)فەرموويەتى (قيامەت هەڵناستێت هەتا خەڵكى گرنگيەكى زۆر دەدەن بەڕازاندنەوەى مزگەوتەكان وشانازى پێوەدەكەن )**

(ل٩٠ نيشانەكانى ڕۆژى دوايى)

حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ :
قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَيُوشِكَنَّ
أَنْ يَنْزِلَ فِيكُمُ ابْنُ مَرْيَمَ صلى الله عليه وسلم حَكَمًا مُقْسِطًا
فَيَكْسِرَ الصَّلِيبَ وَيَقْتُلَ الْخِنْزِيرَ وَيَضَعَ الْجِزْيَةَ وَيَفِيضَ
الْمَالُ حَتَّى لَا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ ۞ ٩٣ البيان

لقسط العدل ، الجزيه : سەرانه ، يفيض : زۆردەبێت وبلاۆدەبێتەوە
پێغەمبەر (سلاۆی خوای لێبێت)فەرمووی ( سوێندبەوەی دەرووني مني بەدەستە واخەرێکە کەکوڕی مریەم (سلاۆی خوای لێبێت)لەناو ئێوەدا دادەبەزێتەوە خوارێ وەك دادوەرێکی ڕاست جا خاچ دەشکێنێت وبەراز دەکوژێت وسەرانە دادەنێت و ماڵ وسامان زۆردەبێت و بلاۆدەبێتەوە بەشێوەیەك هەتا وایلێدێت کەس نایەوەێت )
پێغەمبەر (سلاۆی خوای لێبێت)فەرمووی :(عیسای کوڕی مریەم دادەبەزێتە سەر زەوی لەئاستی منارە سپیەکەی خۆرهەلاّت لە دمشق ).
(ل٢١٧ نیشانەکانی ڕۆژی دوایی)

پێغەمبەر (سلاۆی خوای لێبێت)فەرموویەتی :( یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت ئەوەیە مردنی کتوپڕ زۆردەبێت ) (ل١٠٨ نیشانەکانی ڕۆژی دوایی)
ئایا لەهیچ سەردەمێکدا مردنی کتوپڕ وەکو ئێستا زۆربووە ؟ شتێکی سەرنج ڕاکێشە نەك تەنها ئادەمیزادەکان بەڵکوهەموو ئاژەڵ وباڵندەکانیش توشی جەڵتەدەبن !.
پێغەمبەر (سلاۆی خوای لێبێت)فەرموویەتی :( قیامەت هەڵناستێت تا خوای گەورە پیاوچاکانی سەرزەوی دەباتەوە بۆلای خۆی ، ئیتر تێکەڵەیەك دەمێنێتەوە نەچاکیان پێچاکەو نەخراپیان پێخراپە )
(ل١٠١ نیشانەکانی ڕۆژی دوایی)

يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكْرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾
إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخْشَىٰهَا ﴿٤٥﴾
كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَهَا لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا عَشِيَّةً أَوْ ضُحَىٰهَا ﴿٤٦﴾ النَّازِعَات

وە برسیارت لێدەکەن دەربارەی کاتژمێری کاتی ڕۆژی دوایی کە لەکوێدا دەگیرسێتەوە ( وەکەی ڕۆژی دوایی ڕوودەدات )(٤٢)تۆ چ کارت بەزانینی باسی

**ئـــەم كاتەيـــە(٤٣) كۆتـــايى خولانـــەوەى كاتـــژمێرى ئـــەم بوونـــەوەرە بـــۆلاى پـــەروەردگارى تۆيـــە (٤٤) بـــەڵكو تـــۆ ئاگاداركـــەرەوەى ئەوانـــەى كـــە لەوكاتـــە دەترسـێن(٤٥) ئـەورۆژەى كـەدەيبينن ئـەوان وەكـو ئـەوەوان كەهـەر ئەوەنـدە نەماونـەوە لەسـەردونيا مەگـەر تـەنها بەئەنـدازەى دواى نيـوەڕۆى ڕۆژێـك يـان چێشت تەنگاوەكەى(٤٦).**

فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ نَفْخَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ سُورَةُ الحَاقَّةِ

**جا كە فوو بە ( صور )دا كرا يەك فوو پێداكردن**

**فووپێدا كردنى يەكەم تەماشاكە دواى ئەم فووپێدا كردنە چى ڕوودەدات**

وَحُمِلَتِ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةً وَٰحِدَةً ﴿١٤﴾ سُورَةُ الحَاقَّةِ

**وە زەوى وچياكان هەڵگيران و بەيەكترى دادران، تەنها جارێك بەيەكترى دادان**

فَيَوْمَئِذٍ وَقَعَتِ ٱلْوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ سُورَةُ الحَاقَّةِ

**جا ئەو ڕۆژە ڕووداوى گەورە ڕوودەدات**

**وواتە ڕووداوەكەى ئەورۆژە كەڕوودەدات ئەوەنـدە گەورەيە لـەوجۆرە ڕووداوانـە پێشتر ڕوويان نەداوە**

**پێغەمبەر** (سلاوى خواى لێبێت)**فەرموويـەتى :( قيامـەت هەڵناستێت هـەتا خـەڵكى خانووى قات قاتى بەرز دروست دەكەن )** (ل٩٧ نيشانەكانى ڕۆژى دوايى)

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمْ ۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ ﴿١﴾ الحَجّ

**جا ئـەى خەڵقينـە پەروەردگارەكـەتان بپەرسـتن بەڕاسـتى بومەلـەرزەى دواكـاتى بونەوەر شتێكى گەورەيە**

يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾ الحَجّ

**ئـەورۆژەى كـەئێوە كـاتى بومەلـەرزەى ڕۆژى دوايـى دەبيـنن هـەموو شـيردەرێك سـاواى شـيردەرى خـۆى لـەبيردەكات و بەجێيـدەهێڵێ، وەهـەموو ئـاوس ودوو**

گیانێك بەردەهاوێت ، وەخەڵکی وادەبینی کەسەرخۆشن وەئەوان سەرخۆش نین، بەڵام سزاوئازاری خوا توندوتیژە

وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٤٨﴾

وەبێباوەڕەکان دەڵێن وادەی کاتی ئەم دونیاخرابوونە کەیە ئەگەر ئێوە لەڕاستگۆکانن

مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾

ئەوانە چاوەڕێی ( هیچ نەهامەتیەك ناکەن ) مەگەر هاواری دەنگێك دەیانگرێتەوە لەکاتێکدا کەئەوان دژایەتی یەکتری دەکەن

﴿ ئەوان سەرقاڵی کاری ڕۆژانەی خۆیانن وخەریکی بەربەرەکانی یەکترین چاوەڕێی هیچ نەهامەتیەك ناکەن مەگەر لەپڕ شریخەو ترس و لەزی دەنگێك بەسەریاندا دێت و دەیانمرێنێ ﴾

کارەساتەکە ئەوەندە گەورەیە کەس تیایدا ڕزگاری نابێت بۆیە پەروەردگار دەفەرمووێت

فَلَا يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلَا إِلَىٰ أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴿٥٠﴾ ۩

جاناتوانن هیچ ڕاسپاردەیەك ڕابسپێرن و بۆلای کەس وکارەکانیانیشیان ناگەڕێنەوە

﴿ واتە کەس فریای ئەوە ناکەوێت ڕاسپاردەیەك ڕابسپێرێت یان بۆلای کەس و کارەکەی خۆی بگەڕێتەوە لەبەر ئەوەی هەموویان دەمرن ﴾

دوای ئەوەی کەهەموو خاوەن گیانەکان مردن ، وەماوەی قۆناغی مردن وناوگۆڕیان تەواوکرد ئینجا کاتی زیندوکردنەوەیان دێت

# زیندوبوونەوە

بەپێی ئەو وادەو پەیمانەی کەپێماندرابوو لەلایەن پەروەردگارەوە، دەبێت دووای بوونمان لەناو گۆڕ زیندوبکرێینەوە بۆلێپرسینەوە ودیاریکردنی ژیانێکی نەمری یان لەبەهەشتدا یان لەدۆزەخدا، بەپێی ئەنجامی کارو کردەوەکانی ژیانی سەرزەویمان

ئێمە لەپێشەوە ڕوونمانکردەوە کەباوەڕ بوون بەخوا تاکە هێزە بۆکردنەوەی گرێ کوێرەکان وباوەڕهێنان بەتەواوی بەرنامەکەی کارێکی ئاسان نیە بۆ بچوکی مێشکی ئادەمیزادو گەورەیی ئەم باسە کەگومانێك پەیدابکات ، چۆن دوای مردن زیندودەبێتەوە ؟ هەر بۆیە ئیبراهیم داوای ئەم ڕوونکردنەوەیەی لە پەروەردگار کرد

وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِى كَيْفَ تُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ قَالَ أَوَلَمْ تُؤْمِن قَالَ بَلَىٰ وَلَـٰكِن لِّيَطْمَئِنَّ قَلْبِى قَالَ فَخُذْ أَرْبَعَةً مِّنَ ٱلطَّيْرِ فَصُرْهُنَّ إِلَيْكَ ثُمَّ ٱجْعَلْ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٍ مِّنْهُنَّ جُزْءًا ثُمَّ ٱدْعُهُنَّ يَأْتِينَكَ سَعْيًا وَٱعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦٠﴾ البقرة

وە کەئیبراهیم ووتی خوایە نیشانمبدە چۆن مردووەکان زیندودەکەیەوە ، خوا فەرمووی ئەوەبۆ باوەڕناکەی ؟ ئیبراهیم ووتی بەڵێ باوەڕدەکەم ، بەس بۆ ئەوەی دڵنیاببم ، خوا فەرمووی کەواتە چوار لەباڵندە بهێنەو لایخۆتەوە سەریان ببڕە ، ئینجا لەسەر هەرشاخێك پارچەیەك لەگۆشتی ئەوباڵندانە دابنێ ئینجا بانگی باڵندەکان بکەو ، بەگەڕان بەدواتدا دێنەوە بۆلات ، وە بزانە کە خوا خاوەن دەسەلأت وکاردروستە

چوار باڵندەی جیاجیا یەکیان تاوس ویەکیان بازو یەکیان قەلەڕەشەویەکیان کەڵەشێر ، هەموو گۆشت وپەڕوباڵیان تێکەڵ بەیەك بکرێت، پارچەی هەر

یەکێکیان لەسەر شاخێك دابندرێت ، وەسەرەکانیان لەلای ئیبراهیم بێت بە بانگکردنێك لەلایەن ئیبراهیمەوە پارچەکان بۆلای یەکتری بفڕن وبگەڕێتەوە هەریەکە بۆلای سەرەکەی خۆی .( تفسير الجلالين ٢٦٠ البقرة )

ئایا دەبێت کام هێزودەسەڵاتە بێت ئەمکارە ئەنجام بدات !!؟

ئایا تواناو دەسەڵاتەکانی ئادەمیزاد لەئاستی جێبەجێ کردنی ئەمکارەدان ؟

زۆر جارانیش وێرانکاری وکاولکردن ومردنەکە ئەوەندە دڵتەزێن و کارەساتاویە مرۆڤ دەخاتە دڵەڕاوکێ وپرسیارەوە ، وەکو ئەوبەندەیەی خوا کە بەنزیك گوندێکی کاولی بەسەریەکدا تەپیو تێپەڕی، بەلێکدانەوەی خۆی زیندوکردنەوەو ئاوەدانکردنەوەی ئەم گوندەی بەکارێکی زۆرگران و قورس هاتە بەرچاو، بۆیە بەسەر سوڕمانەوە لەگەڵ خۆیدا دەدوا ، هۆش و بیرکردنەوەکەی بێدەسەڵات بوون لەئاستی جێبەجێ کردنی ئەم ئەرکە

أَوْ كَٱلَّذِى مَرَّ عَلَىٰ قَرْيَةٍ وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحْىِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُۥ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِاْئَةَ عَامٍ فَٱنظُرْ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ -------- (٢٥٩) البقرة

یان وەکو ئەوکەسەی کەبەلای گوندێکدا تێپەڕی کە بەسەر یەکتریدا ڕوخابوو ووتی چۆن خوا ئەوە زیندوودەکاتەوە دوای مردنی ؟ جا بۆیە خوا سەدساڵ مراندی ، ئینجا زیندوویکردەوەوفەرمووی چەند مایتەوە لەمردنەکەتدا ؟ ووتی: ڕۆژێك یان هەندێك لەڕۆژێك ، خوا فەرمووی بەڵکو سەدساڵ مایتەوە لەمردنەکەتدا ،جا تەماشای خواردن وخواردنەوەکەت بکە نەگۆڕاون وخراپ نەبوون

ئەو گوندە بیت المقدس بوو، کە بەهۆی بەسەریەکدا داتەپینیەوە ئەو کەسە کە لەنەوەکانی ئیسرائیل بوو ووتی خوایە ئەمە چۆن زیندوودەکرێتەوە ؟ بۆیە خوا

سەدساڵ مراندی ، دوای حەفتا ساڵ لەمردنەکەی گوندەکەی ئاوەدانکردەوە ، ئینجا کاتێك کەزیندووی کردەوە پرسیای لێکرد چەند لەخەوەکەتدا مایتەوە ؟ ووتی ڕۆژێکە یان هەندێکە لەڕۆژێك پەروەردگار فەرمووی بەڵکو ١٠٠ سەد ساڵ لەخەوەکەتدا ماویتەوە ، جاسەیری خواردنەکەت بکە هیچ نەگۆڕاوەو خراپ نەبووە..... ( تفسیری ابن کثیر ٢٥٩ البقرة )

دوای ئەوەی کەهەموو بونەوەر تێکچوو ئینجا کاتی زیندوکردنەوەو لێپرسینەوەیە

وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي ٱلْقُبُورِ ﴿٧﴾ سُورَةُ الحَجّ

وە بە ڕاستی کاتی کۆتایی بونەوەر لەهاتن دایەو گومانی تێدانیە ، وە بەڕاستی هەرکێ لەناو گۆڕەکاندایە خوا زیندوویاندەکاتەوە

واتە وادە وپەیمانێکە لەلایەن خواوە کە ئەم بونەوەرە کۆتایی پێدێت وهەموو مردووەکانیش زیندوودەکرێنەوە بۆلێپرسینەوە

إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأَتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٩﴾ سُورَةُ غَافِر

بەڕاستی کۆتایی بونەوەر بەدڵنیاییەوە لەهاتندایە ، گومانی تێدانیە، بەلام زۆرینەی خەڵکی باوەڕی پێناکەن ( ابن کثیر ٥٩ )

ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تُبْعَثُونَ ﴿١٦﴾ سُورَةُ المُؤْمِنُون

جا ئێوە ڕۆژی دوایی زیندوودەکرێنەوە

ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ
وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا ﴿٨٧﴾ سُورَةُ النِّسَاء

الله ئەو پەروەردگارەیە کەهیچ پەروەردگارێکی ترنیە تەنها ئەونەبێت بەڕاستی کۆتان دەکاتەوە بۆڕۆژی دوایی هیچ گومانی تێدانیە وە کێ لە ئاخافتندا لەخوا ڕاسترە ؟

ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾ سُورَةُ النَّبَإ

ئەو ڕۆژە ڕاست وبێگومانە ئینجا کێ ئارەزوو وویستی وابوو ئەوا شوێنێکی

دەربازبوون وگەڕانەوەی لەلای پەروەردگاری بۆخۆی وەرگرت .(ابن كثير ٣٩ النباء )
وواتە هاتنی ڕۆژی دوایی ڕاستەو دوودڵی تێدانیە جاهەرکەسێك کەدەیەوێت پەناوشوێنێکی ڕزگاربوون بۆخۆی دابین بکات با هەرلەئێستاوە باوەڕ بەوڕۆژە بهێنێت وخۆی دەسخەڕۆ ومالّ وێران نەکات

أَنَّ رَسُولَ اللهِ صلى الله عليه وسلم قَالَ: (كُلُّ ابْنِ آدَمَ يَأْكُلُهُ التُّرَابُ إِلاَّ عجب الذَّنَبِ. مِنْهُ خُلِقَ وَفِيهِ يُرَكَّبُ). صحيح مسلم ٧٣٥٩ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبیت) فەرمووی :( هەموو( لاشەی ) ئادەمیزاد گلّ دەیخوات تەنها کلێنچە نەبێت لەو دروستکراوە و لەویشەوە یەکدەخرێتەوە )

مِنْهَا خَلَقْنَـٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾ سُورَةُ طه

لەخاك دروستمانکردون وبۆناو ئەوێ دەتانگێڕینەوەو لەوێدا جارێکی تر دەرتاندەهێنینەوە

ئێمە پێشتر لەقۆناغی مردندا لەلاپەڕە (١٥٠) باسی کلێنچەی ئادەمیزادمان کرد، کە پێکهاتەکانی خاك هیچ کارلێکێکی لەگەلّ ناکەن و وەکوخۆی لە گۆڕەکەدا دەمێنێتەوە تاکاتی زیندوکردنەوە ، ڕوونمانکردەوە کەکلێنچەی ئادەمیزاد وەکو ( CD ) یەکە پەیوەندی بەهەموو قۆناغەکانی بوونی ئەو کەسەوە هەیە لەچۆنیەتی پێکهاتەی ئەوهێلکەو تۆوەی کەلێی پێکهاتووە تا زانیاریەکانی ماوەی ناومندالّدان و لەدایك بوون و پێکهاتەی جەستەو قەلّەوی ولاوازی و............. هەموو گەورەو بچوکێك کەپەیوەندی بەبوونی ئەو کەسەوە هەبێت ، وە هەر کاتێك دروستکەرەکەی بیەوێت بەپێی زانستیەکانی ناو( CD ) یەکە دەتوانێت کەسەکە وەکو خۆی بەبێ زیادوکەم دروست بکاتەوە

ئینجا پەروەردگار دیمانەی ئەو ڕۆژی زیندوکردنەوەو لێپرسینەوەیەی بەم شێوەیە دەخاتە بەرچاوی ئادەمیزادەکان

تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾ سُورَةُ المَعَارِج

فریشتەکان وڕوح سەردەکەون بۆلای ئەو لەڕۆژێکدا کە ئەندازەی ئەوڕۆژە پەنجا هەزار ساڵە ( تفسیری القرطبی ٤ المعارج )

کەواتە هەر لەسەرەتاوە کەبونەوەری دروستکردووە ئەندازەی ئەوڕۆژەی بە پەنجا هەزار ساڵ داناوە

عن النَّبيِّ صلى الله عليه وسلم قالَ: ( الصورُ قَرْنٌ يُنفَخُ فِيه ).

سنن إبي داوود ٠ ١ ٦ ٤ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت)فەرمووی :{ ( الصور ) قۆچ (شاخ )ێکە فوی پیادا دەکرێت }

واتە (الصور ) ئەوئامێری دەنگەیە کە دووجار لێدەدرێت ، جاری یەکەم لەگەڵ هاتنی کاتی تەواوبوونی بوونەوەردا وەجاری دووەم لەگەڵ زیندوکردنەوەی مردووەکاندا ، ئەم ئامێرە دەنگیە لە شێوەی (قۆچ) یان شاخی ئاژەڵدایە

ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ سُورَةُ الزُّمَر

ئینجا جارێکی تر فوو بە ( صور) دا کرا بۆیە ئەوان هەموویان هەستاونەوەو تەماشادەکەن ( تفسیر القرطبی ٦٨ الزمر )

کەواتە لەگەڵ دەنگی دووەمدا هەموو مردووەکان لەگۆڕەکانیان ڕاستدەبنەوەو تەماشادەکەن تەماشای چی دەکەن ؟ تەماشاکردن ئامانجی سەرنج ڕاکێشانە. کەواتە دەبێت شتێك سەرنجی هەموو ئەومردوانەی ڕاکێشابێت بۆیە هەموویان تەماشادەکەن ئایا دەبێت ئەو شتە چی بێت ؟ هەموو مردویەك لەگۆڕەکەی خۆیەوە لەکلێنچەکەیەوە پێکدەهێنرێتەوە کەواتە ئەم کەسە بەقۆناغەکانی منداڵدان و قۆناغەکانی گەشەی دوای لەدایك بووندا ناڕوات لەکاتی

زیندوکردنەوەیـدا ، وە بەشـێك لەوفەرمانبەرانـەی کەپـەروەردگار بەسـەریەوە دانابوون لـەژیانی دونیـادا تائەوکاتـەش لەگەڵیـدان  کەواتە ئەوکەسە ناموٚنیـە بـەژیانی رابـردووی سـەرزەوی هەربۆیەشـە کەزیندوودەکرێتـەوە سەرسـامەو تەماشادەکات وسەرنج دەدات ئەمە ئەو وادەیەیە کەخوا لەژیانی دونیادا وادەی پێدابوون

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ:

قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ صلى الله عليه وسلم ، «مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ» قَالُوا: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَرْبَعُونَ يَوْمًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ. قَالُوا: أَرْبَعُونَ شَهْرًا؟ قَالَ: أَبَيْتُ ـــــــ قَالُوا: أَرْبَعُونَ سَنَةً ؟ قَالَ: أَبَيْتُ. «ثُمَّ يُنْزِلُ اللّٰهُ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَيَنْبُتُونَ كَمَا يَنْبُتُ الْبَقْلُ» . صحيح مسلم ٧٣٥٨

لە ئەبو هورەیرەوە( رەزای خوای لێبێت) پێغەمبەر (سلاٚوی خوای لێبێت)فەرمووی :-

( لـە نێوان دوو فـوو پێداکردنەکانـدا چـل هەیـە ) ووتیـان چـل ڕۆژ ؟ ووتـی نەمتوانی وەلاٚم بدەمەوە  ووتیان چل مانگ ؟ ووتی: نەمتوانی وەلاٚم بدەمەوە ووتیان: چل ساڵ ؟ ووتی: نەمتوانی وەلاٚم بدەمەوە

( ئینجا خـوا لەئاسمانەوە ئاوێك دەنێرێتـە خـوارێ ئینجا دەڕوێنـەوە هـەروەکو چۆن پاقلە دەڕوێت )

ئەوەی مەبەستە لێرەدا چۆنیەتی زیندوکردنەوەکەیـە کەپێغەمبـەر دەفەرمووێت خـوا ئاوێـك لەئاسمانـەوە دەنێرێتـە خـوارەوە  ئینجـا ئـەم ئـاوە هـەمان ئـاوی سروشتی بێت وچەکەرە بەدەنکی تۆوەکەی بکات لەناو گۆڕەکەیـدا  یـان ترشـە بارانێـك بێـت ولەگـەڵ پێکهاتـەی کلێنچـەکەیدا کـارلێکێکی کیمیـائی بکـات بـە بـوونی هۆیـەکی یاریـدەدەر کەوویسـتی خوایـە  ئـەوەی مەبەسـتە زینـدو بوونەوەیە کەبەدڵنیاییەوە وەکو دەنکی پاقلە چەکەرە دەکەن ودەڕوێنەوە

وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ ﴿٢٠﴾ سُورَةُ قٓ

وە فوو بە ( صور ) دا کرا ئەو فووپێدا کردنە ئەوڕۆژەیە کەوادەتان پێدراوە

وواتە هەر لەژیانی سەردونیاوە وادەتان پێدراوە کەئەو ڕۆژە دێت وکاتەکەشی ئەو کاتەیە کە فووی دووەم بە (صور) دا دەکرێت

پێشتر ڕوونمان کردەوە کە دەروونەکان لەکاتی خەوتنیاندا نامرن بەلاّم لەکاتی مراندنیاندا خوا دەیانگرێتەوە بۆلای خۆی

ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ...... ﴿٤٢﴾ سُورَةُ الزُّمَرِ

ئینجا ئەم دەروونانە دوای گرتنەوەیان لەمردن لەلایەن پەروەردگارەوە ، و دانانیان لەجێگایەك کەپەروەردگار نەبێت کەس نازانێت کوێیە تاکاتی زیندوو کردنەوە دێت ، ولەگەڵ لاشەکانیان جووت دەکرێنەوە بەهۆی بوونی هۆیەکی یاریدەدەر کەوویستی پەروەردگارە

وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتْ ﴿٧﴾ سُورَةُ التَّكْوِيرِ

وەکاتێك کەدەروونەکان جووتکرانەوە

واتە ئەو دەروونانە کەلەکاتی مردنیاندا خوا گرتبونیەوە ، لەکاتی زیندوکردنەوەیاندا جووتیان بەکاتەوە لەگەڵ لاشەکەیاندا ، کە لە کلێنچەکانیانەوە دروست دەکرێنەوە بەهۆی بوونی هۆیەکی یاریدەدەر کە وویستی پەروەردگارە بەگەڕانەوەی ( ڕوح ) بۆناولاشەکە

عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّآ أَحْضَرَتْ ﴿١٤﴾ سُورَةُ التَّكْوِيرِ

هەموو خاوەن دەروونێك دەزانێت چی ئامادەکردووە

واتە کەدەروونەکانیان جووتدەکرێنەوە لەگەڵ لاشەکانیان و گیانیان بەبەردا دەکرێتەوە ئەوکاتە هەموو دەروونێك دەزانێت کەچی ئامادەکردووە بۆخۆی لە چاکەولەخراپە

وَإِذَا ٱلْقُبُورُ بُعْثِرَتْ ﴿٤﴾ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ ﴿٥﴾ الانفطار

کاتێك کە گۆڕەکان یەکالاّ کرانەوە (٤) ئەوکاتە هەموو دەروونێك دەزانێت کە چی لەپێش خۆیەوە ناردووە وچیشی دواخستووە(٥).
جا ئەوانەی کە بێباوەڕبوون بەبەزیندووکردنەوە ، دوای ئەوەی کە زیندووکرانەوەو........
قَالُواْ يَـٰوَيْلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرْقَدِنَاۜ هَـٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحْمَـٰنُ وَصَدَقَ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٢﴾ يس
ووتیان ئەی هاوار بۆئێمە کێ ئێمەی لەگۆڕەکانمان زیندووکردەوە ، ئەوزیندوکردنەوەیە ئەوەیە کە خوا ( لەژیانی دونیادا ) وادەی دا کەزیندوومان دەکاتەوەو پێغەمبەرەکانیش ڕاستیانکردن ( کە پێیان دەگووتین دوای مردن خوا زیندووتان دەکاتەوە )
يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ سُورَةُ النَّبَإِ
ئەو ڕۆژەی کەفوو بە ( صور ) دا دەکرێت ئەوا ئێوە پۆل پۆل دێن بۆلای ئێمە پۆل پۆل دێن بۆلای ئێمە واتە هەموو خەڵکەکە ڕوو لەشوێنێك دەکەن کە پەروەردگار ئامادەیە بۆلێپرسینەوە لەگەڵ خەڵکی، ئینجا دەبێت فراوانی و گەورەیی ئەوشوێنە چەند بێت کەجێگەی ئەم هەموو خەڵکەی تێدا ببێتەوە وئەو هەنگاوانە چین بۆئەم ئامادەباشیە ؟
وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا ﴿١٩﴾ سُورَةُ النَّبَإِ
وە ئاسمان کرایەوە وەکو چەندین دەرگا بوو
واتە ئاسمان لێك ئاوەڵاکرایەوە ، دەرکەوت کەئاسمان چەند دەرگایەك بوون کرانەوە مەبەست لەئاسمانی یەکەمە کە بۆفراوان کردنی بواری دادگایی کردنەکە دەکرێتەوە، و وادەردەکەوێت کەوەکو چەند دەرگایەك بوون کرانەوە
وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴿٢٠﴾ سُورَةُ النَّبَإِ
وە چیاکان خرانە ڕێ و وەکو تراویلکە وابوون ( القرطبی ٢٠ النباء )

وەچیاکان دوای ئەوەی کەخرانەڕێ ، لەشوێنی خۆیان ترازان وەکو تراویلکە ( سراب ) دەبیندرێن چیاکان بۆچی دەگوازرێنەوەو لادەبردرێن ، ئەگەر مەبەست لەدەسەلاتی پەروەردگار وفراوانکردنی مەیدانی لێپرسینەوە نەبێت

إِنَّآ أَنذَرۡنَٰكُمۡ عَذَابٗا قَرِيبٗا يَوۡمَ يَنظُرُ ٱلۡمَرۡءُ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلۡكَافِرُ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا ﴿٤٠﴾ سُورَةُ النَّبَإِ

ئێمە ئاگادارمان کردنەوە بەسزاو ئازارێکی نزیک ، ڕۆژێک مرۆڤ تەماشای ئەو کردەوانە دەکات کەپێشەکی بەدەستی خۆی ناردونی، وە مرۆڤی بێباوەڕیش دەڵێت خۆزیا هەر گڵ بومایە ( وواتە لەوکاتەدا مرۆڤی بێباوەڕ دەڵێت خۆزیا هەر گڵ بومایەو زیندونەکرابامەوە ، چونکە بۆخۆی چاك دەزانێت کە لەژیانی دونیادا لەخراپە زیاتر هیچی تری نەکردووە ، بۆیە مردنی پێباشترە لەو سزاو ڕیسوا بوونەی کەچاوەڕێی دەکات )

فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴿٣٤﴾ يَوۡمَ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ﴿٣٩﴾ سُورَةُ النَّازِعَاتِ

ئینجا کاتێك کە ڕۆژی ڕووداوی گەورەهات (٣٤) ئەو ڕۆژەی کەمرۆڤ هەوڵ و تێکۆشانەکانی خۆی بیردەکەوێتەوە (٣٥) وە دۆزەخ دەرخرا بۆئەوەی کە توانای بینینی هەیە(٣٦) ئینجا کەسێك کە یاخی بوبێت(٣٨)وەژیانی دونیای هەڵبژاردبێ (٣٧)بێگومان دۆزەخە شوێنی مانەوەی ئەو(٣٩).

وَجَآءَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّعَهَا سَآئِقٞ وَشَهِيدٞ ﴿٢١﴾ سُورَةُ قٓ

وە هەموو دەروونێك هات لەگەڵیدایە لێخوڕێك وشاهیدێك

هەموو دەروونێك کەدەچێت بۆبەردەمی پەروەردگار بۆلێپرسینەوە لێخوڕێك و شاهیدێکی لەگەڵ دایە، ئەگەر بەئارەزووی خۆی ملی ڕێگە نەگرێتە بەر ئەوا بەناچاری لێدەخوڕدرێت

ئینجا پەروەردگار دیمەنێکی دیمانەکەمان نیشاندەدات ودەفەرموێت

وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ سُورَةُ قٓ

وە هاووێنەکەی ووتی ئەوەیە کەلای من ئامادەیە ( لەکردەوەکانی )
واتە هاووێنەکەی لەبەردەمی پەروەردگاردا دەڵێت ئەوەیە لەکردارەکانی کە لەلای من ئامادەیەو زیادوکەمی تێدانیە

مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ سُورَةُ قٓ

هەر گوتنێکی بەدەمدا بێت مەگەر چاودێری کەرێکی ئامادەی هەرلەگەڵدایە
واتە چاودێری کەرێکی ئامادەی لەگەڵدایە هەر ووتەیەك لەدەمی بێتە دەرەوە دەیبیستێت وشاهیدی لەسەردەدات و بەروارەکەشی دیاری دەکات

وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾ سُورَةُ مَرْيَمَ

وە هەموویان ڕۆژی دوایی دێن بۆلای خوا بەتەنهایی
واتە خزمایەتی ومالْ وسامان وپلە وپایە هیچ دادی نیە ، هەموو کەسێك بەتەنها لەبەردەم پەروەردگاردا ئامادەدەبێت
بۆ ئەوانەش کەخاوەنی ژیرین لوتکەی ڕەوشتە بۆیان کەبۆژیانی دونیاش کەڵك لەم ئایەتە وەربگرن وخۆیان ڕابێنن وخۆیان ئامادەبکەن

چۆن ئامادەکرنێك لەبەردەمی یەزداندا ؟

عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ: ( إِنَّكُمْ تُحْشَرُونَ حُفَاةً عُرَاةً قُلْتُ: الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ ؟ قَالَ: إِنَّ الأَمْرَ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يُهِمَّهُمْ ذَاكَ ). سنن النسائي الكبرى ٢٢١٣ الحديث الشريف

لە عائشەوە پێغەمبەر(سلاوی خوای لێبێت)فەرمووی :( ئێوە کۆدەکرێنەوە بە پێخاوسی وبەڕووتی ، منیش ووتم : پیاوان و ئافرەتان هەندێکیان تەماشای هەندێکیان دەکەن ؟ فەرمووی : کارەکە سەخت ترە لەوەی کەئەوە گرنگبێت بەلایانەوە )

وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾
قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ سُورَةُ طه

وە هەرکەسێك دژی فەرمانەکانی من بێت ئەوا بەڕاستی ژیانێکی تەنگی بۆ هەیە ، وڕۆژی دوایش بەکوێری کۆیدەکەینەوە(١٢٤) ووتی خوایە بۆچی کۆتکردمەوە بەکوێری لەکاتێکدا کەمن بینابووم(١٢٥).

واتە هەرکەسێك پێچەوانەی من وپێغەمبەرەکەم بوەستێت ئەوا لەگۆڕەکەیدا ژیانێکی تەنگی بۆدابین دەکەم ، و ڕۆژی دوایش بەکوێری زیندووی دەکەمەوە و لەگەڵ خەڵکی کۆیان دەکەمەوە ، جا بۆیە دەڵێت ئەی پەروەردگار بۆچی بەکوێری زیندووتکردمەوەو لەگەڵ خەڵکی کۆتکردمەوە لەکاتێکدا کەپێشتر من لەژیانی دونیادا بینابووم

قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ سُورَةُ طه

خوا فەرمووی ئاوەهاش بەڵگەو نیشانەکانی ئێمەت بۆهات وەلەبیرتکردن ئینجا ئاوەهاش ئیمڕۆ تۆ لەبیردەکرێیت

واتە تۆ لەژیانی دونیادا خواو فەرمانەکانی خوات لەبیرکردن وگوێت پێنەدان بۆیە ئیمڕۆش تۆ لەبیردەکرێی وگوێت پێنادرێت

وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ

وەکێش وقورساییەکانی ڕاستی دەادەنێین بۆڕۆژی دوایی وەشتێك ستەم لە هیچ دەروونێك ناکرێت وە هەرچەندە ئەگەر واشبوو کێشی مسقاڵێك لەدەنکی خەردەل بوبێت ئەوا دەیهێنین  وە ئەوەندە بەسە بۆڕاستی دادگایی کردنەکە کە ئێمە لێپرسەرەوە بین

واتە ئەوەندە بەسە بۆڕاستی ودروستی لێپرسینەوەکە کەخوا بۆخۆی ئەو ئەرکە جێبەجێ دەکات و هیچ دەروونێك ستەمی لێناکرێت و هەرشتێك لە کردەوەکانی ئەم دەروونە ئەگەر مسقاڵێك لەدانەی دەنکی خەردەلیش بێت ئەوا خوا هەر دەیهێنێت بۆلێپرسینەوە

وَٱلْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ ٱلْحَقُّ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨﴾ الأَعْرَافِ

وه كێش لەوڕۆژەدا ڕاستییه ، جا هەركەسێك كەكێشانەكانی قورس بوون، ئەوه ئەوانه سەرفرازو رزگاربوون

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآۗ أَفَمَن يُلۡقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيۡرٌ أَم مَّن يَأۡتِيٓ ءَامِنٗا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ٱعۡمَلُواْ مَا شِئۡتُمۡ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ فُصِّلَت

ئەوانەی كه بێباوەڕی دەكەن بەبەڵگەو نیشانەكانی ئێمه لەئێمه ناشاردرێنەوه ، ئایـا ئەگـەر یـەكێك بخرێتـه ئـاگرەوه باشـتره یـان ئـەوەی كـەڕۆژی دوایـی بەباوەڕەوه دێت ، چیتان دەوێت بیكەن ، ئەو بینەره بەوەی كەئێوه دەیكەن

عن عديٍّ بن حاتمٍ قال: ( قال رسولُ اللّه صلى الله عليه وسلم : ما منكم من أحدٍ إلا سيُكلمهُ ربُّه ليس بينَه وبينَهُ تُرجُمانٌ ولا حجابٌ يحجبُه).

فتح الباري بشرح صحيح البخاري ٧١٩٨ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبیت) فەرمووی :{ ( له ڕۆژی دواییدا ) هیچ كەسێك له ئێـوه نیـه مەگـەر پەروەردگارەكـەی هـەر لەگەڵیـدا دەدوێـت وه لەنێوانیانـدا هـیچ تەرجومانێك نیه و هیچ پەردەیەكیش نیه ببێته هۆی ئەوەی كەنەیبینێت}

لَن تَنفَعَكُمۡ أَرۡحَامُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡۚ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَفۡصِلُ بَيۡنَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿٣﴾ سُورَةُ المُمۡتَحَنَة

له ڕۆژی دوایی خزمەكانتان و نەمنداڵەكانیشتان بەكەڵكتان نایەن ، خوا لێكتان جیادەكاتەوه ، وخوا بینایه بەوەی كه ئێوەدەیكەن

واته خزمایـەتی، پلەوپایـه، ماڵ ومنـداڵ، كـەس بەكـەڵكی كـەس نایـات لـەڕۆژی دواییدا وه لەیەكتریتان جیادەكاتەوه ، وه ئـەو لـەژیانی دونیـادا هـەموو كردەوه نهێنی و ئاشكراكانی ئێوه دەبینێت

وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسۡوَدَّةٌۚ ﴿٦٠﴾ سُورَةُ الزُّمَر

ڕۆژی دوایی ئەوانه دەبینی كەدرۆیان بەسەر خواوه دەكرد ڕوویان ڕەش بووه واته ئەوانەی لەدونیادا بێباوەڕی بكەن بەخوا ، لەدواڕۆژدا ڕوویان ڕەشه

وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ
كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ سُورَةُ الإِسْرَاءِ

**وه هەموو ئادەمیزادێك ئۆبالّی ئارەزوو وویستەكانیمان خستۆتە ئەستۆی خۆیەوە وە ڕۆژی دوایی نوسراوێكی بۆدەردێنین بەدەستی دەگات بەبلاّوكراوەیی**

**واتە ئادەمیزاد لەلایەن پەروەردگارەوە سەربەست كراوەو ڕێگەی ڕاستیشی نیشاندراوە ئینجا هەركارێك كەبیكات لەئەستۆی خۆی دایەو ڕۆژی دواییش نوسراوێكی بۆدەردێنین لەكردەوەكانی كەبەدەستی دەگات بەبلاّوكراوەیی ئینجا كەنامەكەی درایە پێیدەگوترێت**

ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ سُورَةُ الإِسْرَاءِ

**نوسراوەكەت بخوێنەوە ئیمڕۆ دەروونی خۆت بەسە بەوەی كەلێپرسەرەوە بێت لەسەرت**

**واتە بەفەرمانی پەروەردگار كەئەنجامی تاقیكردنەوەی ژیانی دونیایان لە نامەكانیاندا دەدرێتەوە پێشیان دەگوترێت نامەكەت بخوێنەوە مژدەیەكی دەروونی دلّخۆشكەرو بەهێز هەیە لەوفەرمان پێكردنە بەسەریاندا بۆئەوانەی كە نامەكانیان بەدەستی ڕاست وەردەگرنەوە .وە سزایەكی دەروونی توندوتیژهەیە لەو فەرمان پێكردنە بەسەریاندا بۆئەوانەی كەنامەكانیان بەدەستی چەپ وەردەگرنەوە**

أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَلِقَآئِهِۦ فَحَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ
فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾ سُورَةُ الكَهْفِ

**ئەوانەی كە بێباوەڕ بوون بەبەلّگەو نیشانەو دیداری پەروەردگاریان ئەوا كردارەكانیان پوچەلّ بوونەوە، جا لەڕۆژی دواییدا هیچ سەنگ و كێشێكیان بۆ دانانێین**

لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ سُورَةُ القِيَامَةِ

شێوازێکی ئاخافتی زمانی عەرەبە وواتە ( سوێند بەڕۆژی دووایی )
﴿أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجْمَعَ عِظَامَهُۥ ۝٣
بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ ۝٤﴾ سُورَةُ القِيَامَةِ
ئایا ئادەمیزاد وایدادەنێت کە ئێمە ئێسکەکانی کۆناکەینەوە(٣) بەڵێ ئێمە توانامان هەیە بەوەی کە نەخشی سەری پەنجەکانی وە کو خۆیان دروست بکەینەوە (٤).

﴿بَلْ يُرِيدُ ٱلْإِنسَٰنُ لِيَفْجُرَ أَمَامَهُۥ ۝٥ يَسْـَٔلُ أَيَّانَ يَوْمُ ٱلْقِيَٰمَةِ ۝٦
فَإِذَا بَرِقَ ٱلْبَصَرُ ۝٧ وَخَسَفَ ٱلْقَمَرُ ۝٨ وَجُمِعَ ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ ۝٩
يَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍ أَيْنَ ٱلْمَفَرُّ ۝١٠ كَلَّا لَا وَزَرَ ۝١١ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوْمَئِذٍ
ٱلْمُسْتَقَرُّ ۝١٢ يُنَبَّؤُا۟ ٱلْإِنسَٰنُ يَوْمَئِذٍۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ ۝١٣﴾ سُورَةُ القِيَامَةِ

بەڵام مرۆڤ دەیەوێت لەپێش خۆیەوە خراپە بکات(٥) دەپرسێت کەیە ئەم ڕۆژی دواییە(٦) ئینجا کاتێك کە چاوەکانی زەق بوونەوە (٧) وە مانگ ڕەوشەنەکەی نەما (٨) وە ڕۆژ ومانگ کۆکرانەوە (٩) ئەوڕۆژە ئادەمیزاد دەڵێت کوا ڕێگەی دەربازبوون (١٠) نەخێر هیچ پەنایەك نیە (١١) لەو ڕۆژەدا ئارام گرتن بۆلای خوایە (١٢) لەوڕۆژەدا ئادەمیزادپێیڕادەگەیەندرێت بەوەی کەپێشخۆی ناردویەتی وبەوەی کەدوایخستووە(١٣).
﴿إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٌ
وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ۝٢٢﴾ سُورَةُ النَّحْلِ
پەروەردگاری ئێوە یەك پەروەردگارە ئینجا ئەوانەی کەباوەڕ بەڕۆژی دوایی ناهێنن دڵیان خراپەکارە وەئەوان خۆبەگەورەزانن
﴿وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخْلُقُونَ شَيْـًٔا وَهُمْ يُخْلَقُونَ ۝٢٠﴾ سُورَةُ النَّحْلِ
وە ئەوانەی کە بێجگە لەخوا دەیانپەرستن هیچیان پێدروست ناکرێت وە ئەوان خۆیان دروستدەکرێن

واته هەرکەسێك یان هەربتێك یان هەرشتێك وەکو ڕۆژ یان ئاگر یان گا هیچیان لەدەست نایەن و توانای دروستکردنی شتێکیان نیە بۆیە گونجاونیە بهێندرێنە ڕیزی پەروەردگار وبپەرسترێن

أَمْوَٰتٌ غَيْرُ أَحْيَآءٍ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ ﴿٢١﴾ سُورَةُ النَّحْلِ

لە مردووەکانن ولەزیندووەکان نین وەهەست پێناکەن کەی زیندودەکرێنەوە

يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَىٰ مِنكُمْ خَافِيَةٌ ﴿١٨﴾ سُورَةُ الحَاقَّةِ

ئەو ڕۆژە پیشان دەدرێن وە هیچ شاردراوەیەك لەئێوە ناشاردرێتەوە

وواتە ئەوڕۆژە هەموو ئادەمیزادەکان بەکردارەکانیانەوە ئاشکرا دەکرێن و هیچ شتێکی شاراوە لەوان ناشاردرێتەوەو هەموو دادگایی دەکرێن و هەرکەس پاداشتی خۆی وەردەگرێتەوە

فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُواْ كِتَٰبِيَهْ ﴿١٩﴾ سُورَةُ الحَاقَّةِ

ئینجا ئەوەی کەنوسراوەکەی درایە لای ڕاستی ئەوادەڵێت ها ئەوەتا نوسراوەکەم بخوێننەوە

شانازی بەخۆیەوە دەکات داوا لەکەس و کارەکەی دەکات نامەکەی بخوێننەوە وپێیان دەڵێت

إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ ﴿٢٠﴾ سُورَةُ الحَاقَّةِ

ئەمن دەمزانی کەمن توشی لێپرسینەوەی خۆم دەبم

دەمزانی کەڕۆژێك دێت لێپرسینەوەم لەگەڵدا دەکرێت وئەنجامەکەم وەردەگرم

وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَٰبِيَهْ ﴿٢٥﴾
وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيْتَهَا كَانَتِ ٱلْقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغْنَىٰ
عَنِّي مَالِيَهْ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلْطَٰنِيَهْ ﴿٢٩﴾ سُورَةُ الحَاقَّةِ

وەبەڵام ئەوەی کە نوسراوەکەی درا دەستی چەپی ئەوا دەڵێت بریا نوسراوەکەم پێنەگەیشتایە (٢٥) وە خۆزیا دوا ئەنجامەکەی خۆم نەدەزانی (٢٦)

خۆزگــە مــردن لەناوبــەر دەبــوو(٢٧) مــاڵ و ســامانەکەم هیچــیان بــۆمن زیادنەکرد(٢٨) دەسەڵاتەکەی من تێداچوو(٢٩).

إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا ۝٤ سُورَةُ الإنسَان

ئێمــە بــۆ بێباوەڕەکــان زنجیرەکــان و کۆتــەکان و ئــاگرێکی هەڵچــومان ئامــادە کردووە

خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ۝٣٠ ثُمَّ ٱلۡجَحِيمَ صَلُّوهُ ۝٣١ ثُمَّ فِي سِلۡسِلَةٖ ذَرۡعُهَا
سَبۡعُونَ ذِرَاعٗا فَٱسۡلُكُوهُ ۝٣٢ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ ٱلۡعَظِيمِ ۝٣٣
وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ۝٣٤ سُورَةُ الحَاقَّة

بیبەن و کۆتی کەن(٣٠) ئینجا بیگەیەننە دۆزەخ(٣١) ئینجا لە زنجیرێکی درێژی حەفتا باڵیدا بیبەستنەوە(٣٢) ئەو باوەڕی بەخوای گەورە نەدەهێنا(٣٣) وە گوێی بەخواردنی هەژاران نەدەدا (٣٤)

فَلَيۡسَ لَهُ ٱلۡيَوۡمَ هَٰهُنَا حَمِيمٞ ۝٣٥ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنۡ غِسۡلِينٖ ۝٣٦
لَّا يَأۡكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلۡخَٰطِـُٔونَ ۝٣٧ سُورَةُ الحَاقَّة

بۆیە ئیمرۆ ئالێرە هیچ پشتیوانێکی نیە(٣٥) وە نەخواردنێك تەنها لەخوێناو نەبێت (٣٦) کەس ئەو خواردنە ناخوات تەنها ئەوانە نەبن کە بەئەنقەست هەڵە دەکەن (٣٧).

* ( المخطیء ) ئەو کەسەی کە دەیەوێت کارێکی ڕاست بکات بەڵام بە هەڵەدا دەکەوێت

* ( الخاطیء ) ئەو کەسەی بە ئەنقەست هەڵەبکات کەوای پێویست نەدەکرد ئەوهەڵەیە بکات ( الصحاح ص ١٨٠ )

ئینجا پەروەردگار بەم شێوەیە دەربارەی دۆزەخ دەفەرمووێت

إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابًا ﴿٢٢﴾ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾
لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَآءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾
إِنَّهُمْ كَانُواْ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابًا ﴿٢٨﴾ وَكُلَّ شَىْءٍ
أَحْصَيْنَٰهُ كِتَٰبًا ﴿٢٩﴾ فَذُوقُواْ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾ سُورَةُ النَّبَإِ

**بەڕاستی جەهەندەم وەکو نیشانگر وابوو (٢١)وە شوێن و جێگایە بۆ گەڕانەوەی یاخی بووەکان (٢٢) تیایدا دەمێننەوە ماوە لە دوای ماوە (٢٣) تیایدا ناچێژن نە ساردی و فێنکی ونەخواردنەوە (٢٤)مەگەر ئاوی لە کوڵ و کێم و زوخاو(٢٥) پاداشتیان دەدرێنەوە بەپێی کردەوەکانیان(٢٦) ئەوان بەتەمای لێپرسینەوە نەبوون (٢٧) وە بەڵگە و نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەزانی چۆن بەدرۆ زانینێك(٢٨) وە هەموو شتێکمان هەڵژماردووە بە نووسین (٢٩) ئینجا بیچەژن هیچتان بۆ زیادناکەین سزاوئازار نەبێت(٣٠).**

**ئینجا پەروەردگار لەژیانی دونیادا داوا لەخاوەن باوەڕەکان دەکات کە ئاگادارو وریابن لەسزایەکی سەخت بۆیە دەفەرمووێت**

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ
عَلَيْهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَّا يَعْصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ
﴿٦﴾ سُورَةُ التَّحْرِيمِ

**ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە خۆتان و کەس وکارەکانتان بپارێزن لەئاگرێك کە سوتەمەنیەکەی ئادەمیزادەکان وبەردەکانن ، بەسەر ئەوئاگرەوە فریشتەی توندوسەخت هەن لەخوا یاخی نابن بەوفەرمانانەی کەفەرمانیان پێدەکات وە جێبەجێی دەکەن ئەوەی کەفەرمانیان پێدەکرێت**

**خوا دەفەرموێت ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە ، واتە ئەم ئاگرەی کە سوتەمەنیەکەی ئادەمیزادو بەردەکانە بۆخاوەن باوەڕەکانە بەڵام کام خاوەن باوەڕانە ؟ کە خۆیان وکەس وکاریان ناپارێزن بۆیە خوا داوایان لێدەکات خۆتان بپارێزن خۆپاراستن لەچی ؟ بەدڵنیاییەوە مەبەستی لە**

**خۆپاراستن نیە لەبێباوەڕ بوون چونکە ئەگەر وابا وەکو خاوەن باوەڕ بانگی نەدەکردن کەواتە مەبەست لەکردەوەی خاوەن باوەڕەکانە کەخۆیانی لێبپارێزن و بەڕێکی ئەنجامیان بدەن وسەرپێچی وویستەکانی خوا نەکەن هەر لەژیانی دونیاوە سزاو ئازاری دواڕۆژی دیاریکردووە بۆخۆشتر بوونی ژیان ودیاریکردنی سزای تاوانباران لەدواڕۆژدا بۆیە دەفەرموویت**

فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾
ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ ﴿٦﴾ وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ ﴿٧﴾ الماعون

**ئینجا سزاو ئازاری دۆڵی وەیل بۆ نوێژکەرەکان (٤) ئەو نوێژ کەرانەی کە لە نوێژەکانیان بێ ئاگان (٥) ئەونوێژ کەرانەی کەخۆیان دەردەخەن (٦) وە یارمەتی دانی مەردوم قەدەغە دەکەن (٧).**

**واتە سزا وئازاری دۆڵی وەیل لەجەهەندەمدا بۆ نوێژکەرەکان ، ئەونوێژکەرانەی کە لەنوێژەکانیان بێ ئاگان ، وە ئەوانەی کەنوێژ کردنەکەیان بۆخۆدەرخستن و هەڵخەڵەتاندنی خەڵکە بۆئەوەی لەناو کۆمەڵدا بەچاکەکار بناسرێن و لەڕاستیشدا خراپە کارن ودانی خواردن وئاوو هەموو پێداویستیەك قەدەغە دەکەن لەسەر هەژار ولێقەوماوان**

وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٧﴾ سورة الجاثية

**سزاو ئازاری دۆڵی وەیل بۆ هەموو درۆزنێکی تاوانکەر**

قَالَ رَسُولُ اللّه صلى الله عليه وسلم :( لاَ يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ فِي قَلْبِه مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ. وَلاَ يَدْخُلُ الْجنَّةَ أَحَدٌ فِي قَلْبِه مِثْقَالُ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ كِبْرِيَاءَ).

صحيح مسلم ٢٢٦ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبیت) فەرمووی:( کەسێك ناچێتە ئاگرەوە بەڕاددەی مسقاڵێك لەدەنکی خەردەل لەباوەڕ لەدڵی دابێت .وەکەسێك ناچێتە بەهەشتەوە بەڕاددەی مسقاڵێك لەدەنکی خەردەل لەخۆبەگەورە زانین لەدڵی دابێت )**

واتە باوەڕ بوون بەتاك وتەنهایی خوا مەرجێكی بنەڕەتیە بۆدەربازبوون لە دۆزەخ ئەگەر بەڕاددەی مسقاڵێك لەدەنكی خەردەلیش بێت ، وە ئەگەر خۆشت بە گەورە بزانی مانای وایە بەڕاددەی مسقاڵێك لەدەنكی خەردەلیش باوەڕ لەدڵتا نیە بۆیە بەهەشتت لێقەدەغەكراوە

عن أنس أنَّ رَسُولَ الله صلى الله عليه وسلم قالَ: « اللَّهُمَّ أحيِني مسكيناً وأمتني مسكيناً واحشرني في زُمرَةِ المَسَاكينِ يَوْمَ القِيَامَة». فقالت عائشةُ: لِمَ يا رَسُولَ الله ؟ قالَ: « إنهم يدخلونَ الجنة قبلَ أغنيائهم بأربعين خريفاً، يا عَائشةُ لاَ تردِّي المسكين ولَوْ بشِقِّ تمرةٍ، يا عائشةُ أحِبِّي المَسَاكين وقَرِّبيهم فإنَّ الله يُقربكِ يومَ القِيَامَةِ» جامع الترمذي ٢٣٩٢ الحديث الشريف

پێغەمبەر(سڵاوی خوای لێبیت) فەرمووی:(خوایە بم ژیەنە بەهەژاری وە بم مرێنە بەهەژاری وە لەڕۆژی دواییدا كۆمبكەرەوە لەگەڵ دەستەی هەژارەكان ) عائشە وتی : بۆچی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی ( هەژارەكان دەچنە بەهەشتەوە پێش دەوڵەمەندەكانیان بەچل پایز، ئەی عائشە مەهێڵە هەژارێك بڕوات ئەگەر بەلەتەخورمایەكیش بێت ، ئەی عائشە هەژارەكانت خۆش بوێت و لێان نزیك ببەرەوە ، بەڕاستی خوا ڕۆژی دووایی نزیكتدەخاتەوە ).

چل پایز مانای چل ساڵ دەگرێتەوە بەمێژووی میلادی

پێغەمبەری مەزنمان عیسا (سڵاوی خوای لێبێت)وتی بەوكەسەی كە بانگێشی لێكردبوو ئەگەر خواردنێكی نیوەڕۆ یان ئێوارەت درووستكرد جا نەهاوڕێكانت ونەبراكانت ونەخزمەكانت ونەجیرانە دەوڵەمەندەكانت بانگ مەكە ، نەوەك ئەوانیش بانگێشتت لێبكەنەوەو بۆتۆ ببێت بەپاداشت بەڵكو ئەگەر میوانداری یەكت ڕێكخست جا بانگی كەم ئەندامە شەلەكوێرەكان بكە ، ئەواخێر وخۆشی

بۆتۆدەبێت ، لەبەر ئەوەی هیچیان نیە تاپاداشتت بدەنەوە  لەبەر ئەوە تۆ لەڕۆژی دوایی چاکەکارەکاندا پاداشتت دەدرێتەوە

( لوقا ( ١٢ – ١٥ ) الاصحاح الرابع عشر ص ١٢٢ )

عن النبيّ صلى الله عليه وسلم قال  ( اطلعتُ في الجنة فرأيت أكثر أهلها الفقراء ، واطلعتُ في النار فرأيت أكثر أهلها النساء ).

فتح الباري بشرح صحيح البخاري ٦٣٢٦ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبێت)فەرمووی : ( چاوم بە بەهەشتدا گێڕا بینیم زۆرینەی خەڵکەکەی هەژارەکان بوون ، وە چاوم بە ئاگردا گێڕا بینیم زۆرینەی خەڵکەکەی ئافرەتان بوون )

مزگێنی بۆهەژارە خاوەن باوەڕەکان کەبەبرسیەتی ونەبوونی ژیانی دونیایان بەسەردەبەن، وخۆڕاگرانە بەهەشتیش بۆخۆیان دابین دەکەن، و زۆریش پێویستە سەرمایەدارو ئافرەتانیش چاوێك بەپاشەڕۆژی خۆیاندا بخشێننەوە ئینجا بۆدوورخستنەوەی ئەم ئادەمیزادەی کەخوا کردویەتی بەجێ نیشینی خۆی لەسەر زەوەی و دورکەوتنەوەی لەسزای دواڕۆژ و ڕزگاربوون بەرەو بەهەشت

عَنْ أَبِي سعيد الْخُدْرِي رضِي اللّهُ عنه قَالَ: سمِعْتُ رَسُولَ اللّه صلى الله عليه وسلم: يقُولُ: «مَنْ صَامَ يَوْماً فِي سبِيلِ اللّه، بَاعَدَ اللّهُ وَجْهَهُ عَنِ النّارِ سبْعِين خَرِيفاً». صحيح مسلم بشرح النووي ٨ ٦ ٦ ٢ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبیت) فەرمووی :( ئەوەی کە ڕۆژێك بەڕۆژوبوبێت لە ڕێگەی خوادا ئەوا خوا حەفتا پایز ڕووی ئەو کەسەی دورخستۆتەوە لە ئاگر ).

پێغەمبەری مەزنمان عیسا (سلاوی خوای لێبیت) دەفەرمووێت  وە کەی بەڕۆژو بوون جا ئەوا لامل مەبن وەکو ئەوانەی خۆیان دەردەخەن  جا ئەوانە دەم وچاوی خۆیان دەگۆڕن بۆ ئەوەی وابەخەڵکی نیشاندەن کە بەڕۆژوون  ئەمن ڕاستیتان پێدەڵێم ئەوانە بەدڵنیاییەوە پاداشتی خۆیان وەرگرتۆتەوە  بەلام تۆ

**کەی بەڕۆژوو بوویت ئەوا پرچت چەورکەو دەموچاوت بشۆ   بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی وا دەرنەکەوی کە بەڕۆژوویت ، بەڵکو بۆ ئەوباوکەت بەڕۆژوویت کە لە نهێنی ونادیاردایە   جا ئەو باوکەت کە لەنادیاردایە دەبینیٚ وە بەئاشکرا پاداشتت دەداتەوە** ( متی الاصحاح السادس ص ١١ )

عنْ أبي سعيد، عنِ النبيِّ صلى الله عليه وسلم قالَ ( التَّاجرُ الصَّدُوقُ الأَمينُ، مع النَّبيين والصِّديقين والشُّهداء) . جامع الترمذي ٦   ٢ ١ الحديث الشريف

**پێغەمبەر** (سڵاوی خوای لێبێت) **فەرمووی ( بازرگانی ڕاست گۆ و دەست پاك لەگەڵ پێغەمبەرەکان وڕاستگۆکان و شەهیداندایە ).**

**واتە لەڕۆژی دواییدا لەگەڵ پێغەمبەرەکان وڕاستگۆکان و شەهیداندایە ).**

**دەبێت کارێکی چەند پیرۆز بێت لەلای خواو پێغەمبەرەکەی کاتێك کەبازرگانێك دەستپاك و ڕاستگۆ دەبێت بەرامبەر بەخەڵکی، دەچێتە ڕیزی شەهیدان وپێغەمبەران و ڕاستگۆیانەوە ، ئایا ئەوە گەورەترین پاداشت نیە بۆئەو بازرگانانەی کەخاوەنی ژیرین وڕاستگۆ ودەستپاکن**

**هەروەها پێغەمبەری خوا ڕێگەی بەهەشت و سەرفرازیمان بۆ ڕووناك دەکاتەوە و پێمان ڕادەگەیەنێت**

عن أَبي هُرَيرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صلى الله عليه وسلم   (مَنْ نَفَّس عَنْ أَخيه كُربةً مِنْ كُرَبِ الدنْيَا نَفَّس الله عَنهُ كُربةً مِنْ كُرَبِ يومِ الْقِيَامَة، وَمَنْ سَتَرَ مُسلماً سَترَهُ الله فِي الدنْيا وَالآخرَة، وَمَنْ يَسرَ عَلَى مُعْسرٍ، يسرَ الله عَلَيْه فِي الدنْيا وَالآخرَة، والله فِي عَوْنِ العَبْد مَا كَانَ العبْدُ فِي عَوْنِ أَخيه، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقاً يَلْتَمسُ فِيه عِلْماً، سَهَّلَ الله لَهُ طَرِيقاً إِلَى الْجَنَّة، ......... جامع الترمذي ٣ ٢ ٣ ، الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاَوی خوای لێبێت) فەرمووی ( هەرکەسێك ناخۆشییەکی لە ناخۆشیەکانی دونیای لابرد لەسەر برایەکی، ئەوا خوا لەناخۆشیەکانی ڕۆژی دوایی ناخۆشیەکی بۆلادەبات ، وە کەسێك موسوڵمانێك پەنابدات و بیپارێزێت ئەوا لەڕۆژی دواییدا خوا پەنای ئەوکەسە دەدات ودەیپارێزێت وەکەسێك ئاسانکاریکرد لەسەر گرفتدارێك خوا ئاسانکاری بۆدەکات لەدونیا ودواڕۆژدا ، وە خوا لەپشتیوانی بەندەدایە مادام بەندە لەپشتیوانی برای دابێت وە کەسێك کەڕێگەیەکی گرت زانستیەکی لێوە دەستبکەوێت ، خوا ڕێگەیەك بۆ ئەوکەسە بەرەو بەهەشت دیاریدەکات )

عَنْ أَبِي هُرَيرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللّٰه صلى الله عليه وسلم قَالَ: ( بَيْنَمَا رَجُلٌ يَمْشِي بِطَرِيقٍ ، وَجَدَ غُصنَ شَوْكٍ عَلَى الطَّرِيقِ ، فَأَخَّرَه. فَشَكَرَ اللّٰهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ ).

صحيح مسلم بشرح النووي ٦٦١٩ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاَوی خوای لێبێت) فەرمووی ( کاتێك کە کەسێك بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت ، لقی دڕکێکی بینی لەسەر ڕێگاکە ، وە دڕکەکەی لادا لەسەر ئەم کردەوەیەی خوا سوپاسی کردو لەتاوانەکانی خۆشبوو )

أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّىٰ ﴿٣٧﴾
أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾
وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَىٰ ﴿٤١﴾
وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الْمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ وَأَنَّهُ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴿٤٣﴾
وَأَنَّهُ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴿٤٤﴾ سُورَةُ النَّجْمِ

ئایا لە نامەکانی موسادا ڕانەگەیەندراوە (٣٦) وە ئەو ئیبراهیمەی کە وەفادار بوو (ئایا لە نامەکانیدا ڕانەگەیەندراوە ) (٣٧) کە کەسێك تاوانی کەسێکی تری ناکەوێتە ئەستۆ (٣٨) وە هیچ شتێك لەسەر مرۆڤ نیە تەنها ئەوەنەبێت کە بۆی تێکۆشاوە(٣٩) بەڕاستی لە دواییدا تێکۆشانەکەشی دەبیندرێت (٤٠)

ئینجاپاداشتێکی فراوانتری دەداتەوە (٤١) وە بەڕاستی کۆتایی هەموو شتێك بۆلای پەروەردگارە (٤٢) وە بەڕاستی ئەوە کە وای لەخەڵکی کردپێبکەنن و بگریەن (٤٣) وە بەڕاستی ئەوە کەمراندنی وزیندوویکردنەوە (٤٤).

ئینجا پەروەردگار ئەو دیمەنەمان نیشان دەدات کە لەڕۆژی دواییدا لێپرسینەوە لەگەڵ بەندەکانی خۆیدا دەکات و هەر کەسێك لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا دادگایی دەکرێت

وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾ الزُّمَر

وە ڕێزیان لەخوا نەگرت ڕێزگرتنێکی پڕ بەخۆی ، وە هەموو زەوی لەژێر چەنگی ئەودایە لەڕۆژی دوایی وەئاسمانەکان لولدراون لەلای ڕاستیەوە ، پاکی وبەرزی بۆئەوخوایە لەوەی کەهاوبەشی بۆدادەنێن

وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَىٰ فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ سُورَةُ الزُّمَر

وە فوو بە ( صور ) دا کرا هەرکێ لەئاسمانەکان و زەویدا بوون لە هۆش خۆیان چوون ، تەنها ئەوانە نەبێت ( تەنها ئەو دروستکراوانە نەبێت ) کە وویستی پەروەردگار وەهابوو لەهۆش خۆیان نەچن، ئینجا فوویەکی تر بە ( صور ) دا کرا ئەوا ئەوان هەستاونەوەو تەماشادەکەن

وَأَشْرَقَتِ ٱلْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ وَجِاْىٓءَ بِٱلنَّبِيِّۦنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٦٩﴾ سُورَةُ الزُّمَر

وە زەوی بەڕەوشەنی ڕووناکی پەروەردگارەکەی بەدەرکەوت وە کتێبەکە داندرا وە پێغەمبەرەکان وشەهیدەکان هێندران وە دادوەری بەڕاستی ودروستی کرا لەنێوانیانداو ئەوان ستەمیان لێناکرێت

وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٧٠﴾ سُورَةُ الزُّمَر

**وەهەموو دەروونێك تەواوی پاداشتی ئەو كارانەی وەرگرت كەكردبوونی وە خوا زاناترە بەوەی كەئەوان دەیكەن**

وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا
وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَآ أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ رَبِّكُمْ
وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ
عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧١﴾ سُورَةُ الزُّمَرِ

**وە ئەوانەی بێباوەڕ بوون بەرەو دۆزەخ دەستە دەستە بەڕێكران هەتا كەچوونە ئەوێ دەرگاكانی دۆزەخ كرانەوە وە دەرگاوانەكان پێیان ووتن ئایا پێغەمبەرانی خوا لەخۆتان نەهاتن بۆلاتان بەڵگەو نیشانەكانی خواتان بەسەردا بخوێننەوە و ئاگادارتان بكەنەوە بەگەیشتن ودیدەنی ئەم ڕۆژەتان ، ووتیان بەڵێ پێغەمبەران هاتن بەلام ووشەی سزاوئازار ڕەواكرا بەسەر بێباوەڕەكاندا**

قِيلَ ٱدْخُلُوٓاْ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٢﴾ سُورَةُ الزُّمَرِ

**پێیان ووترا بڕۆنە ناودەرگاكانی دۆزەخەوە بەنەمری تیایدابن ، كەخراپترین شوێنی مانەوەیە بۆخۆبەگەورەزانەكان**

وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا
وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ سُورَةُ الزُّمَرِ

**وە ئەوانەی كەخوای خۆیان دەپەرست دەستەدەستە بەڕێكران بەرەو بەهەشت هەتا كەگەیشتنە ئەوێ وەدەرگاكانی بەهەشتكرانەوە وەدەرگاوانەكان پێیان ووتن سلاوی خواتان لەسەربێت چاكتانكرد جابۆیە بڕۆنە ناوی بەنەمری**

وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ
حَيْثُ نَشَآءُ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾ سُورَةُ الزُّمَرِ

**ووتیان سوپاس بۆئەوخوایەی كەباوەڕمان بەوادەوپەیمانەكانی هێناوەو ئێمەی كرد بەمیرات گری زەوی بەهەشت، ولەبەهەشتدا بمێنینەوەو بژیەین چۆنمان ئارەزوو لێبوو ، ئەوە باشترین پاداشتی كاركەرانە**

وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ
وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٥﴾ الزُّمَرِ

**وه فریشتەكان دەبینی ڕیزیان بەستووه بەدەوری عەرشی خوادا پاكی و بێگەردی دەنوێنن بۆخوا بەسوپاس وستایش كردنی ، وه بەڕاستی و درووستی دادوەری لەنێوانیانداكرا ، وه ووترا سوپاس وستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان ( بەوەی كه دادگایی كردنەكە تەواوبوو )**

**لێرەدا دەمانەوێت هەندوكەیەك لە سزاو ئازارەكانی دۆزەخ بخەینە ڕوو :**

وَيْلٌ لِّلْمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكْتَالُوا۟ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسْتَوْفُونَ ﴿٢﴾
وَإِذَا كَالُوهُمْ أَو وَّزَنُوهُمْ يُخْسِرُونَ ﴿٣﴾ سُورَةُ المُطَفِّفِينَ

**سزا وئازار بۆ تەرازو بازان (١) ئەو تەرازو بازانەی كە پێوانە لەسەر ماڵی خەڵكی بە قازانجی خۆیان دەكەن(٢) وه ئەگەر بۆخەڵكیان پێوا یان كێشا زەرەرمەندیان دەكەن (٣).**

**واتە سزا وئازاری دۆڵی وەیل لەجەهەندەمدا بۆئەو تەرازو بازانەی كاتێك كە شت لەخەڵكی دەكڕن بەقازانجی خۆیان دەیپێون و دەیكێشن وەكاتێكیش كە شت بەخەڵكی دەفرۆشن بەپێوانەو كێشی كەمتروسوكتر پێیان دەفرۆشن و زەرەرمەندیان دەكەن**

أَلَا يَظُنُّ أُو۟لَٰٓئِكَ ﴿٤﴾ أَنَّهُم مَّبْعُوثُونَ لِيَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥﴾ سُورَةُ المُطَفِّفِينَ

**ئایا ئەوانە وا نازانن(٤) ئەوان زیندوكراونەتەوە بۆڕۆژێكی گەورە(٥).**

يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾
وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾ سُورَةُ المُطَفِّفِينَ

**ئەوڕۆژەی كەخەڵكی هەڵدەستنەوە لەگۆڕەكانیان بۆپەروەردگاری جیهانیان (٦) نەخێر بەڕاستی نوسراوی خراپەكارەكان لە سجیندایە(٧) وەئەی محمد تۆ چوزانی سجین چیە ؟(٨) نوسراوێكی ژمارە داركراوی داخراوە (٩).**

**( واتە هەموو خراپەكارێك ژمارەیەكی تایبەت بەخۆی هەیە لەكتابێكی ژمارەدار كراودا كەهەرگیز بزر نابێت ).**

وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ١٠ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ١١ سُورَةُ المُطَفِّفِينَ
لەو ڕۆژەدا سزا و ئازاری دۆڵی وەیل بۆدرۆزنەکان (١٠) ئەوانەی کەڕۆژی دوایی بەدرۆ دەهێننەوە (١١)

وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ١٢ سُورَةُ المُطَفِّفِينَ
وە کەس ڕۆژی دوایی بەدرۆناهێنێتەوە مەگەر دەستدرێژی کەرێکی تاوانبار.

إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ١٣ سُورَةُ المُطَفِّفِينَ
کاتێك کەبەڵگەو نیشانەکانی ئێمەی بەسەردا بخوێندرێتەوە دەڵێت ئەوە ئەفسانەی پێشینەکانە

أنَّ رَسُولَ اللّه صلى الله عليه وسلم قَالَ : (عُذِّبت امرأةٌ في هِرَّةٍ رَبَطَتْها حتى ماتَت فدخَلَتْ فيها النارَ ، لا هي أطعَمَتْها ولا سقَتْها إذ حَبَسَتها ولا هي تركَتها تأكلُ من خَشاش الأرض). فتح الباري بشرح صحيح البخاري ٣٣٦٤ الحديث الشريف

پێغەمبەر(سلاوی خوای لێبیت) ئەوڕۆژەی کەخەڵکی هەڵدەستنەوە لەگۆڕەکانیان فەرمووی :( ئافرەتێك سزا درا لەسەر پشیلەیەك کە بەستویەتیەوە هەتا مرد بەهۆی ئەم کارەیەوە چوّتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ، کاتێك کەبەندی کردبوو نەئەوەتا خواردن و ئاوی دابێتێ ، نەئەوەتا وازی لێهێنابێت لەگیانەوەرەکانی ناوزەوی بخوات )

ئینجا خوێنەری بەڕێز ئافرتێك لەسەر پشیلەیەك ئەوسزایە درابێت ئەوە ناگەیەنێت کەگیانەوەرەکانیش نابێت توشی ناڕەحەتی ببن بەدەستی مرۆڤەوە جاچۆن ڕێگە دەدرێت مرۆڤ ببێتە مایەی ناڕەحەتی مرۆڤایەتی ؟

وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ١ ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ ٢ يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ ٣
كَلَّاۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ ٤ الهُمَزَة

سـزاو ئـازاری دۆڵـی وەیـل بۆهـەموو پلاردەرێکـی عـەیبگر(١)ئـەو پـلاردەرە عـەیبگرەی کـەماڵ و سـامانی کـۆکردەوە وژمـاردی(٢)واوادەنێـت کـەماڵ و سـامانەکەی بەنـەمری دەیهێڵێتـەوە (٣) نـەخێر باوانـەزانێت بەدڵنیاییـەوە هەڵدەدرێتە ناوتێکشکێنەرەوە(٤).

پێغەمبەری مەزنمان عیسا (سلاوی خوای لێبیت) دەفەرمووێت بۆخۆتـان مـاڵ و سامانی زۆر کۆمەکەنەوەو دایمەکەن لەسەرزەوی جا لەویٚ کرم وژەنگ خراپـی دەکەن وە لەویٚ دزەکان بەدوایـدا دەگەڕێن ودەیـدزن بەڵکوماڵ و سامانی زۆر بۆخۆتان لەئاسمانەکاندا داکەن جالەویٚ نەکرم ونەژەنگ خراپی ناکەن وە لەویٚ دزەکـان بەدوایـدا ناگـەڕێن ونایـدزن لەبەرئـەوەی داکـراوی مـاڵ وسـامانەکەت لەکویٚ بێت هەروەها دڵیشت لەوێیە. (متی الاصحاح السادس ص١١ )

أَلْقِيَا فِى جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾
ٱلَّذِى جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ قٓ

هـەموویٚ بـاوەڕێکی لامـل بخەنـە ناودۆزەخـەوە (٢٤) کەڕێگـە لەچاکە دەگرێـت ودەسـتدرێژی کـەرەو بەگومانـە لەتاکوتـەنهایی خـوا (٢٥) ئـەوەی کەلەگـەڵ خـوا پەروەردگارێکی کەی داناوە ئەوا بیخەنە ناوسزای توندوتیژەوە (٢٦).

لِلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمُ ٱلْحُسْنَىٰ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُۥ لَوْ أَنَّ
لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ
سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٨﴾ سُورَةُ الرَّعْدِ

بـۆ ئەوانـەی کـەوەڵامی پـەروەردگاریان داوەتـەوە پاداشـتی چـاك هەیـە ، وە ئەوانەی کەوەڵامی ئەویان نەداوەتەوە ئـەوا ئەگـەر هـەموو ئـەوەی کە لـەدونیادا هەیـەو بەئەنـدازەی ئەوەنـدەی تریشـی لەگەڵدابێت وهـی ئـەوانبێت ، دەیـانکرد بـەقوربانی خۆیـان ، ئەوانـە مامەڵەیـەکی خراپیـان لەگەڵـدا دەکرێـت و شـوێنی حەوانەوەیان دۆزەخ وخراپترین جێگایە

ئینجا له بارەی سزا تایبەتیەکان دەفەرمووێت

سَأُصْلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبْقِى وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾
لَوَّاحَةٌ لِّلْبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ سُورَةُ المُدَّثِّرِ

دەیگەیەنمە ئەو شوێنەی کە مێشکی تێدا دەکوڵێندرێت(٢٦) ئەی محمد تۆ چوزانیت ئەو شوێنە کوێیە کەمێشکی تێدا دەکوڵێندرێت (٢٧) هیچ ناهێڵێت و وازی لێناهێنێت(٢٨) هەڵقرچێنەرە بۆمرۆڤ (٢٩) نۆزدە فریشتەی بەسەرەوەن (٢٩).

إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ سُورَةُ النِّسَاءِ

بەدڵنیایی دووڕووەکان لەژێری ژێرەوەن لەناوئاگر وەهەرگیز پشتیوانی وپاڵ پشتێك بۆئەوان دەستناکەوێت

وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا
هِىَ حَسْبُهُمْ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٦٨﴾ سُورَةُ التَّوْبَةِ

خوا وادەی بەنەمری مانەوەی ناوئاگری جەهەندەمی داوە بەدووڕووە نێرەکان و بەدووڕووە مێیەکان و بێباوەڕەکان ، ئەوە تۆڵەوسزای ئەوانە ، وەخوا نەفرینی لێکردوون وەسزایەکی بەردەوام بۆئەوان هەیە

فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلْكُبْرَىٰ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يَتَذَكَّرُ ٱلْإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾
وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ
ٱلدُّنْيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٣٩﴾ سُورَةُ النَّازِعَاتِ

ئینجا کاتێك کەڕووداوی گەورە هات (٣٤)ئەو ڕۆژەی مرۆڤ بیری دەکەوێتەوە ئەوەی کەهەوڵ و تێکۆشانی بۆکردووە (٣٥)وە دۆزەخ بەدەرخرا بۆئەوەی کە دەبینێ (٣٦)ئینجا ئەوەی کە یاخی بووبێت (٣٧) وەژیانی دونیای هەڵبژاردبێت (٣٨) بێ گومان ئەوە دۆزەخ جێگایەتی (٣٩).

وَلِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٦﴾ إِذَآ أُلْقُوا۟ فِيهَا
سَمِعُوا۟ لَهَا شَهِيقًا وَهِىَ تَفُورُ ﴿٧﴾ سُورَةُ المُلْكِ

سـزای دۆزەخ و خـراپترین سـەرئەنجام بـۆ ئەوانـەی کـە بێبـاوەڕبوون بـە پـەروەردگاریان(٣٧) کاتێـک کەهەڵدرانـە ناویـەوە گوێیـان لەهەناسـە وەرگرتنێکیەتی لەکاتێکدا کەدەکوڵێت(٣٨).

تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلْغَيْظِ كُلَّمَآ أُلْقِىَ فِيهَا فَوْجٌ سَأَلَهُمْ خَزَنَتُهَآ
أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَذِيرٌ ﴿٨﴾ قَالُوا۟ بَلَىٰ قَدْ جَآءَنَا نَذِيرٌ فَكَذَّبْنَا وَقُلْنَا
مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ كَبِيرٍ ﴿٩﴾ سُورَةُ المُلك

خەریکـە لـەت لـەت دەبێـت لەڕقانـدا هـەرکاتێك کـەپۆلێك خرانـە ناویـەوە دەرگاوانەکان لێیان پرسین ئایا ئاگاداریکەرەوە نەهاتن بۆلای ئێوە ؟(٨)ووتیـان بـەڵێ بەدڵنیاییـەوە ئاگاداریکـەرەوەکان هـاتن بـۆلای ئێمـە بـەڵام بـەدرۆمان دەرهێنـان وەووتمـان خـوا لـەهیچ شـتێکی نەناردۆتـە خـوارێ ئـەوە ئێـوە لـە گومڕاییەکی گەورەدان(٩).

وَقَالُوا۟ لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِىٓ أَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٠﴾
فَٱعْتَرَفُوا۟ بِذَنۢبِهِمْ فَسُحْقًا لِّأَصْحَـٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١١﴾ سُورَةُ المُلك

وە ووتیان ئەگەر ئێمە گوێ بیست دەبوین یان ژیردەبووین لەهاوڕێیانی ئاگر نەدەبووین (١٠) جادانیـان بەتاوانەکانی خۆیاندا هێنا، وە تێداچوون وفەوتان بۆ هاوڕێیـانی ئـاگر(١١) جا لـەدەربارەی ژیـانی بەهەشـتیەکان ودۆزەخیـەکان پەروەردگار ئەم دیمانەیەی نێوان هەردوولامان پێڕادەگەیەنێت ودەفەرمووێت

وَنَادَىٰٓ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ أَصْحَـٰبَ ٱلْجَنَّةِ أَنْ أَفِيضُوا۟ عَلَيْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ أَوْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ
قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ سُورَةُ الأعراف

وە هاوڕێیـانی ئـاگر بـانگی هاوڕێیـانی بەهەشـتیان کـرد کـە لـەوئاوە یـان لـەو بژێویەی کەپەروەردگار پێیبەخشیون بەسەر ئێمەیدا بڕێژن ، خـەڵکی بەهەشـت ووتیان خوا قەدەغەی کردووە لەسەر بێباوەڕەکان

ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ دِينَهُمْ لَهْوًا وَلَعِبًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فَٱلْيَوْمَ نَنسَىٰهُمْ
كَمَا نَسُوا۟ لِقَآءَ يَوْمِهِمْ هَـٰذَا وَمَا كَانُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٥١﴾ الأعراف

**ئەوانەی کەئاینەکەی خۆیان بەخۆخافلاندن و گەمەکردن وەرگرتبوو وەژیانی دونیا وایلێکردن لەخۆیان بابیبن ، بۆیە ئێمە ئەمڕۆ لەبیریان دەکەین وەکو چۆن دیداروچاوپێکەوتنی ئەمڕۆژەیانیان لەبیرکرد وەبێباوەڕیان دەکرد بەبەڵگە و نیشانەکانی ئێمە**

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٤٠﴾ لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٞ وَمِن فَوۡقِهِمۡ غَوَاشٖۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ سُورَةُ الأَعْرَافِ

**بەڕاستی ئەوانەی بەڵگەو نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ داناو لەبەرامبەریاندا خۆیان بەگەورەزانی دەرگاکانی ئاسمان بۆئەوان ناکرێنەوە وەناچنە ناو بەهەشتەوە هەتا حوشتر بەکونی دەرزی دورماندا نەچێتە ژورەوە وە ئێمە ئاوا پاداشتی تاوانباران دەدەینەوە(٤٠) بۆ ئەوان لەجەهەندەمدا چێگەو وشوێنی نووستن هەیە کەبەسەریانەوە سەرپۆشی ئاگرین هەیە وەئێمە ئاوەها پاداشتی ستەمکاران دەدەینەوە(٤١).**

إِنَّهُۥ مَن يَأۡتِ رَبَّهُۥ مُجۡرِمٗا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ﴿٧٤﴾ سُورَةُ طه

**بەڕاستی ئەوەی بەتاوانباری بگەڕێتەوە بۆلای پەروەردگاری ،جەهەندەم بۆ ئەوە ، کە تیایدا نەدەمرێت ونەتیایدا دەژیەتەوە**

إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنۡهُمۡ وَهُمۡ فِيهِ مُبۡلِسُونَ ﴿٧٥﴾ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن كَانُواْ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٦﴾ سُورَةُ الزُّخْرُفِ

**بە ڕاستی تاوانبارەکان نەمرن لە سزاو ئازاری جەهەندەمدا (٧٤) سزاو ئازاریان لەسەر سوکناکرێت وەئەوان لەوسزاوئازارەدا بێدەنگی هیوابڕاون (٧٥) وەئێمە ستەممان لێنەکردن بەلام ئەوان بۆخۆیان ستەمیان لەخۆیانکرد (٧٦).**

وَنَادَوۡاْ يَٰمَٰلِكُ لِيَقۡضِ عَلَيۡنَا رَبُّكَۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾ لَقَدۡ جِئۡنَٰكُم بِٱلۡحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَكُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٨﴾ سُورَةُ الزُّخْرُفِ

**وه بانگیانکرد ئەی مالیك ( لێپرسراوی دۆزەخ ) باپەروەردگاری تۆ یەجگاری لەناومان بەرێت ، مالیك ووتی ئێوه تیایداماونەوه (٧٧) ئێمە ڕاستیمان بۆ ئێوه هێنا بەڵام ئێوه زۆرینەتان بۆڕاستی ناخۆشحاڵن (٧٨).**

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٣٠﴾ وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِىٓ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿١٣١﴾ آل عمران

**ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوه ، چەند جارەیەکی زیادکراو لەقازانجی سوودمەخۆن وه لەخوا بترسن بەڵکو ڕزگارتان بێت(١٣٠) وەخۆتان بپارێزن لە ئاگرێك کە ئامادەکراوه بۆ بێباوەڕەکان(١٣١).**

هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلْغَٰشِيَةِ ﴿١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٌ نَّاصِبَةٌ ﴿٣﴾
تَصْلَىٰ نَارًا حَامِيَةً ﴿٤﴾ تُسْقَىٰ مِنْ عَيْنٍ ءَانِيَةٍ ﴿٥﴾ لَّيْسَ لَهُمْ طَعَامٌ إِلَّا
مِن ضَرِيعٍ ﴿٦﴾ لَّا يُسْمِنُ وَلَا يُغْنِى مِن جُوعٍ ﴿٧﴾ سورة الغاشية

**ئایا باسی داپۆشەرت بۆهاتووه(١)ئەڕۆژەی کە ڕووەکان ملکەچن (٢) کارکردو ماندون(٣)دەگاتە ئاگرێکی گەرم کراو(٤) ئاوی پێدەدرێت لەکانی یەك ئاوەکەی تەواو کوڵاوه(٥)بۆ ئەوان خۆراکێك نیە تەنها دڕکی ووشك نەبێت (٦) ئەوخواردنە گۆشتی پێناگیریۆ برسیەتیش لانابات(٧).**

يَوْمَ تُبَدَّلُ ٱلْأَرْضُ غَيْرَ ٱلْأَرْضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ إبراهيم

**ئەو ڕۆژەی کەزەوی دەگۆڕێت بەزەویەکی تر وەئاسمانەکانیش دەگۆڕێن وەهەموویان بەدەرکەوتن بۆخوای تەنیاو بەتوانای خەمبارکەر**

**واتە لە ڕۆژی دواییدا زەوی و ئاسمانەکان دەگۆڕدرێن بە پێکهاتەو سیستەمێکی تر کە لەگەڵ نەمری بوونی دواڕۆژدا دەگونجێت**

وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سورة إبراهيم

**وه تاوانبارەکان دەبینی ئەوڕۆژه بەیەکەوه بەستراونەوه لەکۆت وزنجیردا**

قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغْلَبُونَ وَتُحْشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٢﴾ سورة آل عمران

ئـەی محمـد بەوانـە بڵـێ کـەبێباوەڕ بـوون ، لـە دواڕۆژدا ئێـوە دەدۆڕێــن و کۆدەکرێنەوە بۆجەهەنەم وخاپترین شوێنی مانەوە

قَالَ رَسُولُ اللّه صلى الله عليه وسلم :( هذه النار جزء من مائة جزء من جهنم ).

مسند الإمام أحمد ٨٨١١ الحديث الشريف

پێغەمبەر(سلاوی خوای لێبیت) فەرمووی ( ئەو ئاگرەی ( ژیانی سەرزەوی) بەشێکە لە سەد بەش لەجەهەندەم )

قَالَ رَسُولُ اللّه صلى الله عليه وسلم ( مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَتَوَجَّأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا فِيهَا أَبَدًا.وَمَنْ شَرِبَ سَمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا. وَمَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ يَتَرَدَّى فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا ). صحيح مسلم ٦ ٢ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبیت) فەرمووی :( کەسێك خـۆی کوشتبێت بەپارچـە ئاسنێك ، ئەوا پارچـە ئاسنەکەی بەدەستیەوەیەتی لەسکی دەدرێت لـەئاگری جەهەندەمـدا بۆهەتاهـەتایی نـەمرە تیایـدا وەکەسـێك ژەهرێکـی خـواردەوەو خـۆی کوشـت ، ئـەوە ئەوکەسـە لـەئاگری جەهەندەمـدا ئـەو ژەهـرە فڕدەکـات و نـەمرە و بەنـەمری تیایـدا دمێنێتـەوە هەتاهەتایـە وەکەسێك لەشـاخێك خـۆی هەڵدێراندبێ وخۆی کوشتبێت ، ئەوا هەڵدەدێرێتە ناوئاگری دۆزەخـەوە، نـەمرە و بەنەمری تیایدا دەمێنێتەوە بۆهەتاهەتایی )

ئەوە بەرنامەکانی ئیسلامن ، کەسێك خۆی بکوژێت ئەمە سەرئەنجامەکەی بێت ئـەدی دەبێـت ئەگـەر لەگـەڵ کوشـتنی خۆیـدا خـەڵکی تـری بێتـاوان بکوژێـت پەروەردگار توشی کام سزای سەختی بکات

خواو پێغەمبەرەکەشی لەهیچ شوێنێکدا دنەدنەی مرۆڤیان نەداوە بەوەی کە لە پێناوی باوەڕهێنان بەخواو بەڵگەو نیشانەکانیدا خۆیان وخەڵکیش توشی نەهامەتیەکان وگرفت بکەن

کەواتە نەزانین و تاوانێکی گەورەیە کەکارەخراپەکان دەخرێنە پاڵ بەرنامەی خوا لەکاتێکدا کە ئەو بێمنەتە بۆیە دەفەرموێت

وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾ سُورَةُ الكَهْفِ

ئەی محمد بڵێ ڕاستی لەلایەن پەروەردگاری ئێوەوەیە، جا ئەگەر یەکێك لە ئێوە وویستی باباوەڕبێنێ وەئەگەر یەکێکیش وویستی بابێباوەڕ بێت ، ئێمە بۆ ستەمکارەکان ئاگرێکمان ئامادەکردووە شورەکانی ئەوئاگرە دەوریان گرتوون وەکاتێك کەداوای هانا دەکەن ئاوێکیان فریادەخرێت وەك کانزای تواوە دەم و چاو دەبرژێنێ، خراپترین شەڕاب و ناخۆشترین شوێنی نیشتەجێبوونە

وَسَارِعُوٓا۟ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ آل عِمْرَان

وە پەلەبکەن بۆداوای لێبوردن لەپەروەردگارتان ، وە بەهەشتێك کەپانی یەکەی بەپانی ئاسمانەکان و زەمینە ئامادەکراوە بۆخواپەرستەکان

پانیەکەی بەپانی ئاسمانەکان وزەمینە ، مادام پانی هەیە کەواتە دەبێت درێژیشی هەبێت وە هەر ڕوویەکی ئەندازەیی کەدرێژی وپانی هەبوو ئەوا ئەو ڕووە لاکێشەیی دەبێت چونکە ئەگەر چوار گۆشەبایە دەیفەرموو درێژی لایەکی بەدرێژی ئاسمانەکان وزەمینە وەئەگەر لەشێوەی بازنەش دابایە ئەوا دەیفەرموو تیرەکەی یان نیوە تیرەکەی بەئەندازەی پانی ئاسمانەکان وزەوی دەبێت کەواتە بەهەشت لاکێشەییە وە لاکێشەش هەموو کاتێك درێژی یەکەی

**زیاتره لەپانیەکەی کەواتە ئەوشوێنەی کە بەهەشت داگیری کردووه لە فراوانی ئەوبونەوەرە فراوانترە کەتائێستا بەتەواوی مرۆڤ لەگەڵیدا ئاشنانیە**

وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾
فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾ سُورَةُ النَّازِعَاتِ

**وە بەڵام ئەوەی لە پلە و پایەی پەروەردگاری خۆی ترساوەوڕێگەی ئارەزووبازی بەدەروونەکەی خۆی نەدا(٤٠)ئەوا بەڕاستی بەهەشت شوێنی مانەوەیەتی(٤١)**

وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١١﴾ التَّحْرِيمِ

**وە بۆ ئەوانەی کەباوەڕیان هێناوە خوا خێزانەکەی فیرعەونی بەنمونە هێناوەتەوە کەووتی خوایە لەلای خۆت لەبەهەشتدا خانویەکم بۆدروست بکە و ڕزگارم بکە لەفیرعەون وکردەوەکانی وەڕزگارم بکە لەگەل ونەتەوەی ستەمکار**

لَا يَسْتَوِىٓ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ الحَشْرِ

**هاوڕێیانی ئاگرو هاوڕێیانی بەهەشت ناخرێنە یەك تای تەرازووەوە، هاوڕێیانی بەهەشت ئەوان براوەن**

قَالَ رَسُولُ اللّه صلى الله عليه وسلم (مَنْ عَالَ ثَلَاثَ بَنَاتٍ فَأَدَّبَهُنَّ وَزَوَّجَهُنَّ وَأَحْسَنَ إِلَيْهِنَّ فَلَهُ الْجَنَّةُ).

عون المعبود بشرح سنن أبي داوود ٥١٤٠ الحديث الشريف

**پێغەمبەر(سڵاوی خوای لێبیت) فەرمووی (جا بەهەشت بۆ ئەوکەسەیە کە سێ کچی پەروەردەکردن و بەشویدان و بۆیان چاکبوو )**

**لە بارەی ڕێزو پیرۆزی ئەوکەسانەی خەریکی ئاوەدان کردنەوەو خزمەت بە مرۆڤایەتین دەفەرموویت**

عن عثمان بن عفّان قال: سمعتُ النّبيّ صلى الله عليه وسلم يقولُ : (مَنْ بَنَى لله مسجداً بنى الله لَهُ مثلَهُ في الجنّةِ). جامع الترمذي ٣١٥ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبیت) فەرمووی ( کەسێك مزگەوتێکی بۆ خوا دروستکرد خواش لەبەهەشتدا یەکێکی وەکو ئەوی بۆدروستدەکات )**

**مزگەوتێك بۆخواپەرستی ، قوتابخانەیەك بۆفێربوونی زانست وئەخلاق ، نەخۆشخانەیەك ، هەتیوخانەیەك ، پەك کەوتوو خانەیەك ، باخچەیەکی گشتی، باخچەیەکی ساوایان ، داهێنانێکی زانستی ، دۆزینەوەی چارەسەری نەخۆشی یەك ، درووستکردنی پرد ورێگەوبان ، ئایا پاداشتی هەموو ئەمانەش وەك پاداشتی مزگەوت وانیە لەلای پەروەردگار ؟**

قَالَ رسُولُ اللّه صلى الله عليه وسلم :(العُمْرَةُ إلى العُمْرَةِ تُكَفِّر ما بينَهُما والحجّ المبرُورُ لَيسَ لَه جَزاءٌ إلاّ الجنّةُ).
جامع الترمذي ٩٢٨ الحديث الشريف

**پێغەمبەر(سلاوی خوای لێبیت) فەرمووی ( لە عومرەیەکەوە بۆعومرەیەکی تر هەڵەکانی نێوانیان پاکدەکاتەوە وەحەجێکی وەرگیراویش لەلایەنی خواوە هیچ پاداشتێکی نیە تەنها بەهەشت نەبێت )**

قَالَ رسولَ اللّه صلى الله عليه وسلم: ( مَنْ ثَابَرَ عَلَى ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنَ السنّةِ، بُنِيَ لَهُ بَيْتٌ فِي الْجنّةِ. أَرْبعٍ قَبْلَ الظُّهْرِ، وركْعتَيْنِ بعدَ الظُّهرِ، وركْعتَيْنِ بعدَ الْمغْرِبِ، وركْعتَيْنِ بعدَ الْعشاءِ، وركْعتَيْنِ قَبْلَ الْفَجْرِ). سنن إبن ماجة ١١٧٢ الحديث الشريف

**پێغەمبەر (سلاوی خوای لێبیت) فەرمووی : کەسێك ڕاهات و بەردەوام بوو لەسەر دوانزدە ڕاکاعەت نوێژ لە سوننەت ، ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکرێت چوار ڕکاعەت پێش نوێژی نیوەڕۆ ، وە دوو ڕکاعەت دوای نوێژی**

نیوەڕۆ ، وە دوو ڕکاعەت دوای نوێژی ئێوارە ، وە دوو ڕکاعەت دوای نوێژی خەوتنان ، وە دوو ڕکاعەت پێش نوێژی بەیانی

قَالَ رَسُولُ اللّهِ صلى الله عليه وسلم :

(من صلى الضحى ثِنْتَيْ عشْرَةَ ركعةً بَنَى الله له قصراً من ذهب في الجنة ). جامع الترمذي ٤٦٩ الحديث الشريف

پێغەمبەر(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی :( کەسێك دوانزدە ركاعەت نوێژی چێشت تەنگاوی کرد خوا لەبەهەشتا کۆشکێکی لەزێڕ بۆدروستدەکات) واتە کەسێك ڕاهات لەسەر ئەوەی هەموو ڕۆژی دوانزدە ركاعەت نوێژیچێشت تەنگاو بکات خوا لەبەهەشتا کۆشکێکی لەزێڕ بۆدروستدەکات

عَنِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَ ( دَخَلْتُ الْجَنَّةَ فَرَأَيْتُ فِيهَا دَاراً أَوْ قَصْراً. فَقُلْتُ: لِمَنْ هَذَا ؟ فَقَالُوا: لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فَأَرَدْتُ أَنْ أَدْخُلَ . فَذَكَرْتُ غَيْرَتَكَ ). فَبَكَى عُمَرُ وَقَالَ: أَيْ رَسُولَ اللّهِ أَوَ عَلَيْكَ يُغَارُ؟

صحيح مسلم ٦١٤٥ الحديث الشريف

پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی :(چومە ناو بەهەشتەوە خانویەك یان کۆشکێکم بینی وە ووتم ئەوە هی کێیە ؟ وە ووتیان هی عمری کوڕی خطابە وە وویستم بچمە ناوی بەدەماریەکەتم بیرکەوتەوە ) عمر گریا وەووتی ئەی پێغەمبەری خوا کەس بۆتۆ دەمار دەیگرێ ؟

قَالَ رَسُولُ اللّهِ صلى الله عليه وسلم: ( مَنْ وَقَاهُ الله شَرَّ مَا بَيْنَ لَحْيَيْهِ وَشَرَّ مَا بين رِجْلَيْهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ ). جامع الترمذي ٢٤٥٣ الحديث الشريف

پێغەمبەر(سڵاوی خوای لێبێت) فەرمووی:( ئەو کەسەی کەخوا بیپارێزێت لە ئاژاوەی نێوان دووشەویلکەکانی ولەئاژاوەی نێوان دووقاچەکانی چۆتە بەهەشتەوە )

**واتە ئەوکەسەی کە خوا بیپارێزێت لە ئاژاوەکانی زمان و دامێنی ئەوە بە دڵنیاییەوە چۆتە بەهەشتەوە ، بەزمانی باوەڕ بەخوا بێنێ وبەزمانی چاکە بڵێ و ئاژاوە بکوژێنێتەوە ، ئاگاداری دامێنی خۆی بێت و تەنها بەوشێوەیە بەکاری بهێنێت کەخوا سنوری بۆداناوە چونکە بەڕاستی ئەوەی لەدەرگای ماڵێك بدات ڕۆژێك دێت لەدەرگای ماڵەکەی دەرێتەوە** ١

**ئینجا مرۆڤ ئەوەندەی کەبۆی داندراوە کەلەبری تاوانەکانی بسوتێندرێت لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوەو کاتێ کەسزاکەی تەواوبوو دەردەهێندرێت**

عَنْ عَمْرٍو سَمِعَ جَابِراً يَقُولُ: سَمِعَهُ مِنَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم بِأُذُنِهِ يَقُولُ «إِنَّ اللهَ يُخْرِجُ نَاساً مِنَ النَّارِ فَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ». صحيح مسلم ٤٢٣

**پێغەمبەر** (سڵاوی خوای لێبێت) **فەرمووی :( خوا خەڵکانێك لە ئاگر دەردەهێنێت و دەیانخاتە بەهەشتەوە ) ئەوەی ماوەی سزادانەکەی تەواو بوو ئەوا لە دۆزەخەوە دەگوازرێتەوە بۆبەهەشت**

وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ هَـٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ ﴿٣٢﴾ مَّنْ خَشِيَ ٱلرَّحْمَـٰنَ بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَـٰمٍ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ ﴿٣٤﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ﴿٣٥﴾ سُورَةُ قٓ

**وە بەهەشت ڕازێندرایەوە بۆ خواپەرستەکان زۆر دوورنیە(٣١) ئەوە ئەوپەیمانەیە پێتان دەدرێت بۆهەمووتۆبەکارێکی پارێزراو (٣٢) ئەوەی کەلە نادیاردا لەخوا ترساوەو هاتۆتەوە بۆلای پەروەردگار بەدڵێکی گەڕاوە وتۆبەکار (٣٣)بڕۆنە ناو ئەو بەهەشتەوە بەئارامی ئەوە ڕۆژی نەمرییە (٣٤)وە لەوبەهەشتەدا بۆئەوان هەیە کەدەیانەوێت و ئارەزووی دەکەن و زیاتریشمان لەلاهەیە (٣٥).**

مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ
لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى
وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ
وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ سُورَةُ مُحَمَّدٍ

**نمونـەی ئـەو بەهەشـتەی خـوا پـەیمانی بەخواپەرسـتەکان داوە ڕووبـاری وای تێـدان لـەئاوێك کـەتام ورەنگیـان نـەگۆڕاوە ، وە چـەندین ڕووبـار لەشـیر کـە تامەکەی ناگۆڕێت وەچەندین ڕووبار لەشەڕاب بەتامـە بۆئەوانـەی کەدەیخۆنـەوە وەچـەندین ڕووبـار لەهــەنگوینی پـاککراوە ، وە لەبـەری هــەموومیوەکان ، وە لێبوردەییەکی گەورە لەلایەن پەروەردگاریانەوە بۆئەوان هەیە لەوێدا ، ئایا ئەوە وەکـو ئەوکەسـە وایـە کەنــەمرە لــەئاگردا وەئـاوێکی کـولاوی درایـە هــەموو ڕیخۆڵەکانی پارچە پارچەکردن**

**جا پەروەردگار مژدە بەوانەدەدات کەڕێگەی ڕاستیان گرت و دەفەرموویت**

إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾
أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ الأحقاف

**بە ڕاسـتی ئەوانـەی کـە ووتیـان پـەروەردگاری ئێمـە الله یـەو ڕێگـەی ڕاسـتیان گرتەبـەر ئەوانــە ترسـیان لەســەرنیەو نەخــەمباردەبن (١٣) ئەوانــە دۆســتانی بەهەشــتن بەنــەمری تیایــدا دەمێننــەوە لەپاداشــتی ئــەوەی کەلــەدونیادا دەیانکرد (١٤).**

وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِىٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧٢﴾
لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٣﴾ سُورَةُ الزُّخْرُفِ

**وەئـەوە ئـەو بەهەشـتەیە کەبـەمیرات بۆئێـوە بـووە بـەهۆی ئـەوەی کەلـەدونیادا دەتانکرد(٧٢) بۆئێوە میوەیەکی زۆری تێدایە لێیەوە دەخۆن(٧٣).**

إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾
وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن
رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾ سُورَةُ النَّبَإِ

**بەڕاستی بۆ خواپەرستەکان شوێن هەیە بۆدەربازبوون (٣١) باغەکان و جۆرەکانی تریێ (٣٢) وە تازە مەمککردوی هاو تەمەن (٣٣) وە جامە شەڕابی پڕ (٣٤) تیایدا نابیستن زۆربڵێیی و درۆکردن (٣٥) پاداشتێکە لە پەروەردگارتانەوە پێبەخشینێکی ڕێزلێنانە بەڕادەیەك کەبەشیان بکات(٣٦).**

**وە لە سوڕەتی( الرحمن ) پەروەردگار بەم شێوەیە باسی پاداشتی خاوەن باوەڕەکان دەکات:**

وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ ﴿٤٨﴾

**وە بۆ ئەوکەسەی کە لەپلەوپایەی خوای خۆی دەترسا دووبەهەشت هەن کە هونەرکاریان تێداکراوە** ( المنجد / الفن ، افنان ص ٥٩٦ )

فِيهِمَا عَيْنَانِ تَجْرِيَانِ ﴿٥٠﴾

**دوو کانی و ئاویان تێدان ئاوەکانیان لەبەردەڕۆن**

فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ زَوْجَانِ ﴿٥٢﴾

**لە هەموو میوەیەك دووجۆریان تێدایە**

مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴿٥٤﴾

**پاڵیانداوەتەوە لەسەر ئەوڕایەخانەی کەناواخنەکەیان لەئاوریشمەووە ڕنینەوە ولێکردنەوەی میوەی ئەودوو بەهەشتە ئاسان ولەبەردەستدایە**

**ئەو ڕایەخانەی کەناوئاخنەکەیان لەئاوریشمە ئەدی دەبێت دیووی دەرەوەیان چۆن بێت !؟**

فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾

لەو دووبەهەشتەدا ناسك ونازداری تێدان کەچاوەکانیان تەنها خاوەنەکانی خۆیان دەبینن و پێش ئەوخاوەنانەیان کەس نەچۆتە لایان نەئادەمیزاد و نەجندوکە

کەواتە جندوکەکانیش کاری ژن و مێردایەتی دەکەن

كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾

ئەو ئافرەتانە لەجوانیدا وەکو یاقوت ومەرجان وان

هَلْ جَزَآءُ ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾

ئایا پادشتی چاکەکردن هەر چاکە دانەوە نییە ؟

وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾

وە لە ژێر ئەم دوو بەهەشتەوە دوو بەهەشتی ترهەن

مُدْهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾

ئەم دووبەهەشتە بەیەکتردا چوون

لە چڕی و پڕی دارو درەختەکەیاندا بەیەکتریدا چوون

واتە هەموو شتێکی ئەم دووبەهەشتە بەناو یەکتریدا چوون وەکو ئەوەی دارێك لە خاکی یەکەمیاندا چاندرابێت گەڵاو بەرەکەی پەڕیبێتەوە بۆ ناوخاکی دووهەمیان

فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾

ئەم دوو بەهەشتە دوو کانی و ئاویان لەناوداهەیە ئاوەکانیان هەڵدەچن

فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾

ئەم دوو بەهەشتە میوەوخورماو هەناریان تێدایە

فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾

ئەم دوو بەهەشتە ئافرەتانی چاك وباشیان تێدایە

حُورٌ مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾

حۆری پارێزراو لەخێوەتەکاندان

پارێزراون لەخراپە ، وبەڕێز وجوانن لە نێوخێوەتەکاندا نیشتەجێن

لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٌ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾

وە پێش ئەوخاوەنانەیان کەس نەچۆتە لایان نەئادەمیزادو نەجندوکە

واتە پێش ئادەمیزادەکانی خۆیان هیچ ئادەمیزاد وجندوکەیەکی تر کاری جووت بوونی لە گەڵدا نەکردوون

مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفۡرَفٍ خُضۡرٍ وَعَبۡقَرِيٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾

پاڵیانداوەتەوە لەسەر چین چینی دۆشەك وسەرینی سەوز و فەرشی چاك

( مانایەکی تری ( رفرف ) ئەوەش دەگەیەنێت کە پاڵیان داوەتەوە لە سەر فەرشی چاك و لقی سەوزی شۆڕەوەبووی دارەکانی بەهەشت )

( الرفرف المنجد ص ٢٧٠ )

ئینجا دوای ئەم پاداشتە گەورەیە پەروەردگار پووردەکاتە پێغەمبەرەکەی و بەندەکانی خۆی ، بۆ گەورەیی دەسەڵاتەکەی بە ڕێزەوە دەفەرمووێت

تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴿٧٨﴾

پیرۆزی وبێ گەردی بۆ ( الرحمن ) ی ناوی پەروەردگاری تۆ کە پیرۆزو شکۆدارە

سوپاس وستایش بۆخوای گەورە ، سەڵەواتی خوا بۆهەموو پێغەمبەرەکانی، سۆز وبەزەیی خوا بۆبەندە چاکەکارەکانی ، خوایە ئەوانەی چاکن چاکتریان بکە ، خوایە ئەوانەی خراپن چاکیانبکە ڕێگەیان نیشان بدە و بە بەزەیی خۆت لێیان ببورە ، خوایە ئێمە هەموومان درووستکراوی تۆین بەسۆز وبەزەیی خۆت لە تاوانەکانمان خۆش ببەو لەئاگری دۆزەخ دوورمان بخەرەوە وبمانگەیەنە ناو نازو نیعمەتی بەهەشتەکەتەوە

## سەرچاوەکان


١- قورئانى پيرۆز

٢- القران الكريم الاصدار السادس ٣١، ٦ شركه صخر لبرامج الحاسب

٣- كتاب المقدس

٤- الحديث الشريف ( العريس للكومبيوتر وانظمة الحاسوب )

٥- اطلس العالم \ مكتبه لبنان بيروت

٦- اطلس العالم \ المؤسسة العلمية للوسائل التعليمية \سورية

٧- المنجد فى اللغه والاعلام \ دار الشرق بيروت

٨- مختار الصحاح \ دار الكتاب العربى \ بيروت

٩ - ترجمه معانى القران الكريم بلانگليزيه /عبدالله يوسف على
THE HOLY QUR'AN
الناشر: شركة امانة / ميرلاند / الولايات المتحدة الامريكية

١٠- الجغرافيا العامه الطبيعية والبشرية/ الدكتور محمد السيد غلاب
الناشر :
( مؤسسة شباب الجامعة ٤٠ ش د. مصطفى مشرفة الاسكندرية

١١- الكيمياء اللاعضوية الحديثة / وزاره التعليم العالى /جمهوريةالعراق.
جامعه الموصل ، تاليف جى جى لاگاوسكى

١٢- الكيمياء اللاعضوية / كيمياء العناصر الممثلة / وزاره التعليم العالى
الدكتور مهدى ناجى الزكوم ، الدكتور عصام جرجيس سلومى ،
الدكتور كاظم العبيدى ، الدكتور حبيب عبدالاحد اوغسطين

١٣- الكيمياء اللاعضوية / القسم الثانى ١٩٧٨ / وزاره التعليم العالى

١٤- Microsoft Encarta world Atlas 1998 Edition .

١٥- 1001 Natural Remedies ( www.dk.com )

١٦- البيان / الاصدار الاول / شركة صخر لبرامج الحاسب ( ١٩٩٦ )
١٧- افلاطون / عبدالرحمن البدوى
١٨- تأريخ الشعوب الاسلاميه / كارل بروكلمان دار العلم للملايين
١٩ - تاريخ الحضارة الاسلامية جامعه العلاقات الدوليه ،
برامج التعليم المفتوح ، دارالحامد للنشر والتوزيع / عمان - الاردن
أ.د. عماد الدين خليل ، د. فايز الربيع
٢٠- مجلة ( طبيبك )العدد ( اب / ١٩٨١ ) باشراف د. سامى القبانى
٢١ - نيشانەكانى ڕۆژى دوايى و ڕوداوەكانى پێش هاتنى
( هاوڕێ محەمەد امين )
٢٢ - ( حى بن يقظان ) ملحق جريدة المدى \تحقيق وتعليق احمد امين
٢٣- زانكۆ / گۆڤارى زانكۆى سەلاحەدين / ژمارە ١٤
٢٤- زيندەوەرزانى /شەشەمى زانستى / وەزارەتى پەروەردە /
هەرێمى كوردستان
٢٥ - التاج الجامع للاصول/ شێخ منصور على ناصف /هەموو بەرگەكان
وەرگێڕانى نورى فارس حەمە خان
٢٦ - علم المعانى / د.بسيونى عبدالفتاح فيود / مؤسسة المختار للنشر
والتوزيع - القاهرة.
٢٧ - تەفسيرى( نامى ) بۆ قورئانى پيرۆز/ مەلا عبدالكريمى مدرس
( هەموو بەرگەكانى )
٢٨ - گۆڤارى كاروان / ژمارە ٣٦ / ئەيلولى ١٩٨٥
٢٩ - تەفسيرى خالْ / بە قەڵەمى شێخ محمدى خالْ
٣٠ - القران الكريم / لەگەڵ وەرگێڕانى بە زمانى كوردى / مامۆستا محمد
ابراهيمى وهيئت محققين ومصححين / ايران
٣١ - تفسير الجلالين بهامش القران الكريم / دار الهجره /دمشق /البرامكه.

٣٢ –موسوعة صحيح البخارى / شركة مكة
( www.makkasoft . com )
٣٣ – مكتبة الفقه الاسلامى ( العريس للكومبيوتر )
( كتب المالكيه ، الشافعيه ، الحنابله ، فقه الخلاف ، القضاء ، ايات
و احاديث الاحكام ، كتب الظاهرية )
٣٤ – موسوعة القران الكريم الصوتية
Holy Quraan Audio Encyclopedia Version 1.00
Research & Development International (RDI)
٣٥ – قصة الايمان / الشيخ نديم الجسر / منشورات المكتب الاسلامى
٣٦ – الرجل والجنس / دكتورة نوال السعداوى ( هەموو بەرگەکان ) ،
المؤسسة العربية للدراسات والنشر / بيروت
٣٧ – نزيكترين دەرمان خانه / بەكر غەريب فەرەج چاپخانەی الحوادث
بەغداد ساڵی ١٩٨٢
٣٨ – الفكر الاسلامى مواجهة حضارية /
المؤلف سماحة اية الله السيد محمد تقى المدرسى
٣٩ – كەڵە فەرهەنگی ڕووەكە ئابووريەكان / كمال جلال غريب
(( كتێبی هەرزان )) 2002 سويد
٤٠ – النسبية فى متناول الجميع /شرح مبسط للاسس العلمية والتاريخية
للنظرية النسبية تاليف چيمس ا. كولمان
ترجمة الدكتور رمسيس شحاته دار المعارف بمصر
٤١ – داخل الذرة / تاليف ايساك اسيموف شركة الكتاب اللبنانى
للطباعة والنشروالتوزيع بيروت لبنان ، الطبعة الاولى اذار ١٩٦٤
٤٢ – ڕێكەوت لە تەراوی زيريدا / محمد ملا صالح شارەزووری
لە بەڕێوەبەريەتی چاپخانەی زانكۆی سلێمانی چاپكراوە

٤٣ – انشطار الذهن / بيتر ماكلير ، تعريب د. حلمى نجم /
الجمهوريةالعراقيه وزاره الثقافة والاعلام ،دار الرشيد للنشر ١٩٨٢
٤٤ – النسبية / بول كودريك / ترجمة مصطفى الرقى/ الطبعة الثالثة
١٩٨٢ / منشورات عويدات بيروت – باريس
٤٥ – صورة الكون / د. محمد عبد اللطيف مطلب / الموسوعه الصغيره
العدد ٣٥ منشورات وزارة الثقافةوالفنون الجمهوره العراقيه ١٩٧٩
٤٦ – ئافرەت لە مێژوودا ( كورتە باسێكی مێژوویی و كۆمەڵایەتی )
د.كەمال مەزهەر ئەحمەد چاپخانەی (( الحوادث )) بەغداد ١٩٨١
٤٧ – السلوك / فى سبيل موسوعة نفسية – ١٣ /مكتبة الهلال – بيروت
عرض وتقديم الدكتور مصطفى غالب
٤٨ – الشذوذالنفسى / فى سبيل موسوعة نفسية – ١٣ /مكتبة الهلال –
بيروت عرض وتقديم الدكتور مصطفى غالب
٤٩ – كیمیای قۆناغەكانی خوێندنی ناوەندی و دواناوەندی / وەزارەتی
پەروەردە / هەرێمی كوردستان ، ( ٢٠٠٤ ی زاینی )
٥٠ – الفيزياء الذرية / وزارة التعليم العالى والبحث العلمى / الجمهورية
العراقية الدكتور طالب نأهى الخفاجى / الدكتور عباس حمادى
الدكتور هرمز موشى
٥١ – جمهورية افلاطون / منشورات مكتبة النهضة – بغداد رقم الايداع
فى المكتبة الوطنية ببغداد ٦٢٤ لسنة ١٩٨٣
٥٢– ج ف هيجل / اصول فلسفة الحق نصوص فلسفية ١٣
دار الثقافة للطباعة والنشر بالقاهرة ، المجلد الاول ترجمة وتعليق
وتقديم دكتور امام عبدالفتاح امام
٥٣ –كشف الاسرار المخفية فى علم الاجرام السماوي والرقوم الحرفية/
وزارة التراث القومى والثقافة / سلطنة عمان /العلامة عمر بن مسعود

٥٤- الانسان بين الجوهر و المظهر ( نمتلك او نكون )
To Have or To Be \ Erich Fromm\ London 1979

تاليف اريك فروم ، ترجمة سعد زهران ، عالم المعرفة ، سلسلة كتب ثقافية شهرية يصدرها المجلس الوطنى للثقافة والفنون والاداب / الكويت ١٩٨٩

٥٥- مايكل باه MICHEL J. BEHE \ Darwins Black Box
Simon & Scnuster New York 1996

٥٦- مايكل دانتون ( استاذ علم الاحياء )
MICHEL DENTON\A Theory incrisis
London burnett Books 1985.

٥٧- الوجودية
EXISTENTIALISM
JOHN MACQUARRIE
تاليف جون ماكورى

ترجمة د. امام عبدالفتاح امام
عالم المعرفة ، سلسلة كتب ثقافية شهرية يصدرها المجلس الوطنى للثقافة والفنون والاداب / الكويت ١٩٨٢.